# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات
ژمارە (11) ت.1ی. 2000 - ساڵی دووەم

خاوەنی ئیمتیاز : شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر : ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین : ئازاد بەرزنجی

دەستەی نووسین :

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری : قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: یادگار ئەوڕەحمان

ناونیشان:

سلێمانی - قولکەی یەککرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن : 29839 یان 4347

بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە

سەنتەری سەرچنار

Tel: 0044 162 84 86008 - Fax: 0044 162 84 77660

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لەڕێی سندوقی پۆستی ژمارە

14665/615 و 14665/616 تاران

# سەردەم

ژماره (11) ت. ای 2000 سالی دووەم

# فیکرو فەلسەفە

- لیبرالیزم — جۆن هال
- فەلسەفەی ئەڵمانیی هاوچەرخ — هاشم ساڵح
- قوتابخانەی فرانکفۆرت — ئیبراهیم ئەلحەیدەری

# لیبرالیزم

■ جۆن هال

● و. له فارسییه‌وه: فەرۆخ نیعمەتپوور

لیبرالیزم ئه‌ندێشه‌یه‌كی ئاڕاده‌یه‌كی زۆر بگۆڕه، چه‌ند بیرو بۆچوونێك ده‌گرێته‌وه سه‌باره‌ت به بابه‌ت گه‌لی زۆر جۆراوجۆری وه‌ك مه‌عریفه ناسی و په‌یوه‌ندیه نێو ده‌وڵه‌تیه‌كان، هه‌روه‌ها لیبرالیزم به‌درێژایی مێژوو به شێوه‌ی جۆراوجۆر لێكدراوه‌ته‌وه‌و راڤه كراوه.

سه‌ره‌تا ده‌بێ بپرسین كه داخۆ له‌نێوان ده‌ركه‌وته جۆربه‌جۆره‌كانی لیبرالیزمدا لایه‌نێكی گشتی له گۆڕێدایه یان نا. كورتترین پێناسه‌یه‌كی كه ده‌تولنین بیده‌ین ئه‌وه‌یه كه لیبرالیزم تاك وه‌ك بنه‌مای بایه‌خه ئه‌خلاقیه‌كان سه‌یر ده‌كا، له روانگه‌ی وییه‌وه تاكه‌كان بایه‌خی وه‌ك یه‌كیان هه‌یه. كه‌واته، تاك ده‌بێ له هه‌ڵبژاردنی ئامانجی [illegible] سه‌ربه‌ست بێ. ره‌نگه لیبرالیزم سه‌باره‌ت به‌و ئاما[illegible]جانه‌ی كه تاكه‌كان هه‌ڵیده‌بژێرن بێ لایه‌ن بێت، به‌ڵام له‌م روانگه‌یه‌وه له‌رووی ئه‌خلاقییه‌وه بێ لایه‌ن نیه كه بڕیاردان و هه‌ڵبژاردنی تاك شتێكی شیاو و خوازراوه‌و ده‌بێ به‌دوور بێت له ده‌خاله‌ته ناڕه‌واكانی ده‌وڵه‌ت. لیبرالیزم جۆرێكه له جیهان بینی و له ئایدیۆلۆژیاو، قبوڵ كردنی به‌مانای هه‌ڵوێست وه‌رگرتنه.

بۆ تێگه‌یشتن له لیبرالیزم، ده‌بێ سه‌رنج بده‌ینه سه‌رسه‌ختترین ره‌خنه‌گره‌كانی. به‌ڕای ماركسیه‌كان، لیبرالیزم به‌هۆی ئه‌و په‌یوه‌ندیه‌ی كه له‌گه‌ڵ سه‌رمایه‌داری هه‌یه‌تی، خاوه‌نی كه‌م و كوڕیه‌كی بنه‌ڕه‌تیه كه چار ناكرێ. گرنگترین ره‌خنه‌ی ماركسیه‌كان ئه‌وه‌یه كه لیبرالیزم ناتوانێ به‌ڵێنی خۆی وه‌دی بێنێ سه‌باره‌ت به‌وه‌ی كه هه‌ر تاكێك له وه‌شوێن كه‌وتنی به‌رنامه‌ی ژیانی خۆیدا ئازاده، چونكه لیبرالیزم حكومه‌تی چینه خاوه‌نداره‌كان ده‌پارێزێ و پیرۆزی ده‌كا. كه ئه‌مه له روانگه‌ی ماركسیه ئۆرتۆدۆكسه‌كانه‌وه (سخت كیش) هه‌م ده‌بێته هۆی شه‌ڕی چینایه‌تی و هه‌م به

تووندوتیژبوونـەوەی ململانێـی تیجـاری لـەنێوان دەوڵەتەکاندا، شەڕی جیهانی لێ دەکەوێتەوە.

رەخنـەگرانی دی، نـەزمی لیـبرالیزم بـەوە تاوانبـار دەکـەن کـە ماهییـەتی ئـەخلاقی نیـەو میکانیکیـەو بـەدوورە لـە سـۆزو خۆشەویسـتی. هـەندێك کـەس لەسـەر ماناو گرنگیی ئـەوە پـێ دادەگـرن کـە مرۆڤ لەگـەڵ خـەڵکی تێکـەڵاوەو هـەروەها کۆمـەڵانی پێـك هێنـەری کۆمـەڵگایش لەگەڵ یـەکتر لـە پـەیوەندیدان و چـەمکی "تـاك" دروسـت کـراو یـان تـەعبیرێکی کۆمەڵایەتیـەو، هـەموو کـەس پەیوەسـتە بـە لەنگەرگایـەکی کۆمەڵایەتیـەوەو بـەبێ ئـەم لەنگەرگایـە ناتوانـێ درێژە بە ژیانی خۆی بدات. لەبەرانبەر ئەمەدا لە روانگەی بەرەـەندانی غەریزەگەرای وەك نیچەوە، کەم و کوڕیی لیبرالیزم لەوەدایە کە زیاد لە رادە کۆمەڵایەتیـە. لـە بـیروڕای ئـەم دەسـتەیەدا، لیبرالیزم شتێك نیە جگـە لـە کۆمـەڵێك قـەیدو بەندی ئەخلاقیانەی درێو و ترسنۆکانە کە مەیل و هەسـتە راسـتەقینەکانی مـرۆڤ بەرتەسـك دەکاتەوە. بە گوێرەی ئەم بۆچوونە، باشتروایە مرۆڤ ئەنجامەکانی مەیلە غەریزیـە قووڵـەکانی خۆی دەرك بکاو رووبەڕوویان بێتەوە، تا ئـەوەی کە بـەجۆرێك بەخسـێری نیلاهیـاتی نائـاینی و فیزیکی بێت (فیزیکی لەبەرامبـەر میتـافیزیکی داهاتووە— وەرگێڕی کوردی) ئەم دوو رەخنەیە لەگـەڵ یـەکتر جیاوازییـان هەیە، بـەڵام هـەندێك جاریش لەگەڵ یەکتر تێکەڵاو دەبـن. هـەندێك لـەو کەسانەی کە دەڵێن لیبرالیزم بـەدوورە لە سۆز و خۆشەویستی، مـەیلیان بـەرەو ئـەو ئایدیۆلۆژیانە پەیدا کـردووە کە ڤیتالیستی[1]، لایەنگرانی ئـەم جـۆرە ئایدیۆلۆژیانە سەرسـەختانە پـێ لەسـەر ئەوە دادەگـرن کـە مـرۆڤ لـە تـان و پۆیـەکی کۆمەڵایەتیدا دابنێن. ئەم دوو رەخنەیـە دەبـێ بەوردی لێیان بکۆڵرێتەوە.

ئەم وتارە لەسـێ بـەش پێك هـاتووە. بەشی یەکەم بـاس لـە راڤـەی نموونـە سـەرەکیەکانی فیکـری لـە لیـبرالیزم بەگشتیدا دەکـاو دەسـت نیشـانیان دەکـا. لەبەشـی دووهـەمدا بـاس لـە مێـژووی لیبرالیزم و راڤـەی بنیات و تیۆرەکـانی لیـبرالیزم دەکـا. لەبەشـی سـێیەمیش دا، لـە لیـبرالیزم دەکۆڵێتـەوە لـە روانگـەی کاریگـەریی ژیوپۆلیتیکـیو دەروونیـەوە لـە ئـەورووپای دوای شـەڕی دووهـەمی جیـهان، هـەروەها بـاس لـە سـەقامگیریی هـەوێنی پێشکەوتووی لیـبرالیزم و ئەگەری لیبرالیزەبوونی شوێنەکانی دیکە دەکا.

## بنیاتە فەلسەفیەکانی لیبرالیزم

دوو تەوەری سەرەکی لە لیبرالیزم دا هەیە کە ئەم چەمکە خۆی پێیانـەوە خـەریك کـردووە.



یەکیان مەعریفە ناسییە، کە ئەوە دەنوێنێتەوە لیبرالیزم هەمیشە گرنگیەکی قوڵی بە زانستی نوێ داوە. دووهەمیان بریتیە لە پەیوەندی لیبرالیزم لەگەڵ سەرمایەداری. بازنەی پەیوەندیی ئەم دوو وتەزایە، پشت بەستنە بە هۆکاری ئینسانی وەك ناسێنەر یان سەرف کەر، واتە ئەندێشەی بیرمەندانی وەك دێڤید هیوم و ئادام سمیت کە دوو تیۆری ئەزموونگەرایی و سەرمایەداری لە بەرهەمەکانیاندا لە نزیکەوە تێکەڵ بەیەکتر دەبن.

لە ئەرزیتی مەعریفە ناسیدا کەسایەتیە گرنگەکان بریتی بوون لە هیوم و کانت کە کانت بەهۆی ئەوەوە کە حەزی بە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی هیوم نەبوو، رووی کردە فەلسەفە. بەرچاوترین لایەن لە هیوم دا بریتیە لە سادەیی ئەندێشەکانی. بەرای وی مرۆڤەکان تەنیا لە رێگای هەستەکانیانەوە دەتوانن وێنەیەك لە جیهان لای خۆیان دروست بکەن، چونکە جگە لە هەستەکان هیچ شتێکی دیکە بوونی نیە. کەم و کوڕیی ئەم بۆچوونە ئەوە بوو کە هیومی بەدەستەوەستانی هێشتەوە. ئەگەر ئێمە جگە لە هەستەکانمان هیچ شتێکی دیکەمان نەبێت، گرنتی کردنی راستیەکانی جیهانی دەرەوە و ئەزمی سروشت و تەنانەت خودی یاسای بە هۆکاری (علیت) دیاردەگەلێکی مەحاڵ دەبن. کانت ئەیدەویست بۆچوونی هیوم رەش بکاتەوە، تەنیا دەیویست رێگا چارەیەك بۆ ئەم مەسەلەیە بدۆزێتەوە. لەلایەکەوە دەیویست بەم ا[illegible]انەوەیە هەستی ئەزم بگێڕێتەوە کە زەینی ئێمە تەنیا لە رێگای بنەما رێك و پێك و بەئەزمەکانی بەهۆکارییەوە (علیت) دەتوانێ لە راستیەکان نزیك بێتەوە. بەڵام لەلایەکی دیکەوە دەیویست لەسەر بناغەی ئەم لێکدانەوەیە کە عەقڵ بە پێچەوانەی قسەکەی هیوم تەنیا کۆیلەی ئەو دیاردانە نیە کە کاری تێ دەکەن، گەورەیی و شوێنی تایبەتی مرۆڤ دەستەبەر بکات.

ئەم دوو بۆچوونە لەم روانگەیەوە بۆ لیبرالیزم گرنگن کە کانتیانیسم دان بەراستی فەلسەفەی ئەزموونیی بەریتانیادا دەنێ بەشێوەیەکی بە تەواوی زەروور. ئەزموونگەرایی کاتێك جلو بەرگی قازانج خوازی لەبەردەکرد، دەکەوتە بەر ئەم رەخنەیەوە کە بۆ وێنە خۆشی گروپێکی دە نەفەری رەنگە بەگشتی زیاد بکات، ئەگەر ئەندامەکانی ئەم گروپە، جەستەی تاکەکەسی ساغی نێو خۆیان لە نێوان دە کەسە نەخۆشەکەی دیکەدا دابەش بکەن. ئەم رەخنەیە هەڵبەتە گریمانەیەکە. ئەزموونگەراکانی بەریتانیا لە کۆمەڵگایەکدا دەژیان، کە تاك تێیدا رێزی زۆری هەبوو و، بێگومان هیچ کامیان ئەوەی نەدەگوت کە کەسێك لەت و پەت بکەن، سەرەڕای ئەمانە، هەڵوێستی کانت گرانترین بناغەی مومکینی دەستەبەر دەکرد بۆ ئەوەی کە لەگەڵ هەموو مرۆڤەکان وەك ئامانجێك هەڵس و کەوت بکرێ، نەك وەك ئامرازێك بۆ گەیشتن بە مەبەست. دووهەم، ئەوەکە ئەم دوو بۆچوونە دوژمنی هاوبەشیان هەیە. هەردووکیان هێرش دەبەنە سەر خورافەو سەرچاوەیی (مرجعیت) و تاك دەکەنە بەرپرسی چارەنووسی خۆی.

فەلسەفەی ئەزموونیو کانتیانیسم، لە دڵنیایی ئێمە کەم دەکەنەوەو ئارامیمان تێك دەدەن. لەم رووەوە، پارێزەرانی لیبرالیزم لە بەناوبانگترین بەرگرییەکدا کە لێیان کردووە، ئازایانە هەوڵیانداوە بە مەدح کردنی شك و گومان، گەورەییەك بە کەم و کوڕی ببەخشن. جۆن ستوارت میل دەڵێ چونکە هیچ کەس ناتوانێ بە تەواوی لە شتێك دڵنیا بێت، کەواتە ئەوە

گرنگیەکی حەتمی هەیە کە هەر بیروڕایەك دەرفەتی خۆدەرخستنی هەبێت تا لە ژێر تیشکی ئەو بەڵگەو هۆکارانەدا کە دەیهێنێتەوە، ئەو دەرفەتە برەخسێ کە باشترین بیروڕا سەرکەوێ. هەڵبەت بۆ ئەوەیکە ئەم بیروڕا گرنگە لە ژیانی سیاسیدا جێ بگرێ، دەبێ خاوەنی هەندێك تایبەتمەندی بن. بۆ وێنە بۆ ئەوەی خەڵکی هان بدرێن بیروڕای فەردیی خۆیان دەربڕن، پێویستە خوێندەواربن و لەگەڵ یەکتردا هەڵبکەن و بەمەبەستی گفتوگۆی ڕێك و پێك لەگەڵ یەکتردا پشوو درێژ بن. بەڵام ئەمە دەرگا بەڕووی مۆتەکەی ڕێژەگەرایی‌دا دەکاتەوەو لیبراڵیزمیش لەو نێوەدا دەبێ بەیەکێك لەو بەشانەی کە لە مەیدانەکەدا هەن. زەرووره‌تی ڕاڤەی لیبراڵیزم لەبەرانبەر ڕەقیبەکانیدا، لە چاو تیۆرو بۆچوونە ڕووتەکان، سەرنج بەرەو کاریگەریی بەکردەوەی بنیاتە کۆمەڵایەتیەکانی لیبراڵیزم دەبا. لێرەشدا دیسان ئەم بنیاتانە لەگەڵ بنیاتی ڕەقیبەکان هەڵدەسەنگێندرێن. بە دەرکەوتنی ئارام سمیت، لیبراڵیزم لە لوتکە بەرزەکانی پێشووی دابەزی و لە کێشە خوارترەکانی کۆڵییەوە.

نوێکردنەوەی گەورەی سمیت لە ئەریتی فیکریانەی ڕۆژئاوادا ئەوەیە کە سامانی لە زانست و هونەر[2] پێ باشترە، بەواتایەکی دیکە ئەو کۆمەڵگایەی پێ باشترە کە بەهرەمەندە لە سەروەت و سامانی زۆر، نەك ئەو کۆمەڵگایەی کە لەسەر بنەمای بەرەوپێش بردنی زانست و هونەر دارێژرابێت. لێکدانەوەشی بۆ ئەم حاڵەتە ئەوەبوو کە بەم شێوەیە ئاستی ژیانی خەڵکی ئاسایی دەچێتە سەرەوە، ئەمە لە ڕاستیدا لێکدانەوەیەکی سادەو خەڵکیانەبوو. پارە پەیداکردن (کە سمیت هیچ چەشنە خۆش خەیاڵیەکی پێ نەبوو)، لە مێژووی ئەوروپادا هەمیشە وەك فاکتەرێك بوو لە بەرانبەر دەسەڵات خوازیدا، هەروەها مەیلێکی ئارام و بەدوور لە کێشمەکێش و توندو تیژی بوو و باشترین دابین کەری خاوێنی و چاکی بوو لە شانۆی سیاسەتدا. بەرزترین بایەخ لە ڕوانگەی سمیتەوە کۆنترۆڵ کردنی حکومەتی سەرەڕۆ و بەرتەسك کردنەوەی ئەو ترسە بوو کە بە وتەی مۆنتکیو، حکومەتەکان دەتوانن بیهاوێنە نێو دڵی خەڵکیەوە. سمیت سەرمایەداریی وەك ئامرازێك سەیر دەکرد بۆ گەیشتن بەم دوا بایەخەو لەم ڕوانگەیەوە تەئیدی دەکرد. هەڵبەت تیۆری زۆر وردبینانە و زانایانەی سمیت لەگەڵ سادە ئەندێشی پێشینیانی نیوکلاسیکی وی گەلێك جیاوازیی هەبوو، کە بازاڕیان لە ئامرازەوە کرد بە ئامانج.

شێوەی فیکری قوتابخانەی مەنچستەر لە سەدەی نۆزدەدا سەبارەت بە پەیوەندیە نێونەتەوەییەکانیش هەر بەم شێوەیە ساویلکانە بووە سیاسەتمەدارانی وەك کۆبدێن[3] و برایت[4] وایان دەزانی وابەستەیی دوولایەنەی هەڵقولاو لە دابەش بوونی نێونەتەوەیی کار، دابین کەری ئاشتی دەبێت. ئەم میکانیزمە کە ئەنجامی گۆڕانی تیۆری بازرگانی ئازاد بوو، ڕەنگە خاوەنی حەقیقەتێك بێت، بەڵام مێژووی سەدەی 19 ئێمە ناچار دەکا کە سەرنج بدەینە ئەم بابەتە کە بازرگانی لە نەفسی خۆیدا دەستەوەستانە لە کۆنترۆڵکردنی میلیتاریزم. تیۆری لیبراڵی هیچ کەس سەبارەت بە پەیوەندیە نێونەتەوەییەکان بەقەدەر تیۆری کانت جوان و ورد دانەڕێژراوە، کە بەڕاستی شایانی مەدح کردنە. کانتیش ئومێدەوار بوو کە وابەستەیی دوولایەنە یارمەتی بەئامانجی ئاشتی بگەیەنێ، بەڵام ئەم ئامانجە باشەی ئەو لە ئەنجامدا گرێ درابوو بە

دامەزراندنی حکومەتی کۆماری لیبراڵی. کانت لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە چونکە لە خەڵکی کەڵك وەردەگیرێ بۆ شەڕ، کەواتە ڕەنگە کۆنترۆڵ لەلایەن خەڵکەوە دەست درێژییەکان بەرتەسك بکاتەوە. لەوە گرنگتر ئەوە کە هاوپەیمانیی دەوڵەتە کۆمارییەکان ڕەنگە بەرگری بکا لە دروست بوونی شەڕ لە نێوان هاوپەیمانە ئایدیۆلۆژییەکاندا. ڕاستە کە هەندێك جار خەڵکی شەڕخوازو دەوڵەتە لیبراڵییەکانیش لەشەڕ لەگەڵ ڕەقیبە ئایدیۆلۆژییەکانیاندا بێ بەزەیی بوونە، بەڵام ئەم ڕاستیە ئاشکرایە کە دەوڵەتە لیبراڵەکان لەگەڵ یەکتر شەڕیان نەکردووە، لە خۆیدا ئەوە نیشان دەدا کە حەقیقەتێك لەم ڕایەی کانت دا خۆی حەشارداوە.

## پەیدا بوون و هەرەس هێنانی لیبرالیزم

زۆربەی کات بیروبۆچوونەکانی ڕۆشنبیران، ڕواڵەتی داڕێژراوی ئەو شێوە کردەوانەن کە لە کۆمەڵگادا باون، کە ڕەنگە بە نۆرەی خۆیان کاریگەریان هەبێت لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی. یەکێك لەو شتانەی کە ئەم بنەمایە دەسەلمێنێ، لیبرالیزمە. دەبێ پێش ئەوەی کە باس لە چۆنیەتی لەدەست چوونی هێژمۆنی لیبرالیزم لە کۆتاییەکانی سەدەی **19** لە ئەوروپادا بکەین، سەرەتا لە بنەما کۆمەڵایەتیەکانی لیبرالیزم بکۆڵینەوە.

مێژوو نووسە تەتبیقیەکان هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە ڕۆژئاوا بەم هۆیەوە بێ وێنە بووە کە دەسەڵات و هێز تێیدا لەنێو لایەنە جۆراوجۆرەکاندا پەخش و بڵاو بووە. ئیمپراتۆری چین لە پلە جۆربەجۆرەکانی خۆیدا خاوەنی ئەزمێکی جێکەوتوو بوو (کەبەشێوەی تایبەتی خۆی تێدەکۆشا ئەو هێزانەی سەرمایەداری کۆنترۆڵ بکا کە ئەزمی باریان تێك دەدا)، بەڵام لە ئەوروپا، جۆراوجۆریی زیاتر بوو. ئایینی مەسیح جۆرێك یەکگرتوویی بە ئەوروپا دەبەخشی، بەڵام لە دەروونی ئەم سنوورەدا، پێشبڕکێی دەوڵەتەکان لەگەڵ یەکتر و ململانێ لە بازاڕدا بەردەوام نائارامی بەرهەم دەهێنا. لەڕاستیدا لە نێوان هێزە سیاسی و ئابوورییەکان کردەوەو دژ کردەوەی ئاڵۆز لە گۆڕێدا بوو. تایبەتمەندیی گشتی ئەم کۆمەڵە دەتوانین لە پێك هاتنی ئەو پەرلەمانانەدا ببینین کە بنیاتکەلێك بوون تایبەت بە ڕۆژئاوا و تێیاندا ئەریستۆکراتەکان و قەشەکان و باوەڕپێکراوانی چینی مام ناوەندیی شار (تەنانەت گوندییەکان لە سوید) دەبا دەنگ بدەن و دان بەو بەرنامانەدا بنێن کە پارەیەکی تایبەتیان (بەمەبەستی شەڕ) دەخستە بەردەمی شا. چونکە تەوەرو ناوەندێکی تاقانە لە گۆڕێدا نەبوو، دەکرا ڕێگا جۆربەجۆرەکان تاقی بکرێنەوە. نموونەیەك لەوانە بریتیبوو لە ئۆتۆنۆمیی دەوڵەتشارەکانی فلاندەر (لە بەلژیك) و باکووری ئیتالیا. ڕەنگە، هەر بەو شێوەیەی کە جۆن میلتۆن لێکی دەداتەوە، ئەوەی یارمەتی گەیاندووە بە دروست بوونی زانستی نوێ، بریتی بووە لە کۆبوونەوەی یاسای یەهوود لەگەڵ پێداگرتنی یۆنان لەسەر یاساکانی سروشت، بەڵام واقیعیەتی "ماددیی" هەبوونی ناوەندە جۆراوجۆرەکان کە تێیاندا باوەڕپێکراوانی چینی ناوەڕاستی شاری، پلەیەکی وەك پاشایان هەبوو، دابین کەری درێژەدان بە خواستی تکنۆلۆژی بوو کە بەبێ ئەمە ئەورووپا نەیدەتوانی بەو شێوەیە بە پێشکەوتنی فیکری و کۆمەڵایەتی بگا.

هەر بەو شێوەیەی کە کۆی ئەم بارودۆخە کۆمەڵایەتیانە بوونە بناغەیەک بۆ پلۆرالیزم، کۆمەڵێکی یەکجار درێژو جۆراوجۆری ڕووداوەکانیش بارودۆخیان بۆ هاتنە گۆڕی دونیای لیبرالی خۆش کرد. پلۆرالیزم لە ئەورووپادا ئەو ئیزنەی نەدەدا کە لە شەڕە درێژخایەنە ئاینیەکاندا هیچ کام لە تاقمەکان بە سەرکەوتن بگەن، ئیتر بەم شێوەیە ئارام ئارام تیۆری پێکەوە هەڵکردن و پشوودرێژی بەهۆی خەبات و کۆششی بەردەوامەوە خۆی دەرخست. جۆراوجۆریی سیستەم بەرادەیەک بوو کە ئەو فشارانەی لە شوێنێکدا دەهاتنە ئاراوە، نەیاندەتوانی بەر بەپێشکەوتن بگرن لە شوێنێکی دیکەدا، ئەوانەشی وابەجێ دەمان یان بەکاوە خۆ ڕێگایان دەبڕی، یا دەبا لاسایی پێشکەوتنەکان بکەنەوە، یا بەگشتی لە نێو بچن. برینگتۆن مۆر[5] نیشانی داوە کە ئەوەی لەم بوارەدا خاوەنی گرنگیەکی تایبەتی بوو، ڕووکردنی بەرەبەرەی ئەریستۆکراتی بەریتانیا بوو بۆ بەشی کشتوکاڵی بەمەبەستی بازرگانی. ئەم گۆڕانە بووە هۆی لە نێو چوونی ئەو هەوڵانەی کە بۆ پێکهێنانی سیستەمە ناپلۆرالیستیەکان و دەسەڵاتی ڕەها لە ئارادابوون. بە سەرکەوتنی بەریتانیا بەسەر فەرانسەدا لە شەڕەکانی سەردەمی ناپلیۆندا، وادەهاتە بەرچاو کە لیبرالیزم سەرکەوتن بەدەست دێنێ.

بەڵام ڕێک لەو کاتەدا کە لەدەیەی ***1870*** دا نموونەی بەریتانیی لیبرالیزم لەلایەکەوە پێی لەسەر بازرگانی ئازاد دادەگرت و لەلایەکی دیکەوە گرنگی بە ریفورم و کەم کردنەوەی شتەزیادیەکان دەدا، هێرشە بەربڵاوەکان بۆ سەری دەستی پێکرد. ڕۆشنبیرانی نەیاری ڕۆشنگەری، لیبرالیزمیان بەوە تاوانبار دەکرد کە لەلایەکەوە کۆتایی دەکا لە پشتیوانی کردن لە "خود" و لەلایەکی دیکەوە کۆسپ دروست دەکا لەسەر ڕێگای تاکایەتیی ڕاستەقینە. ئەم دوو تاوانبارکردنە، سەرەڕای هاودژییان لەگەڵ یەکتر، دەکرا لە ئایدیۆلۆژییەکی ئیجابیی جادووسازدا پێکەوە بگونجێن. هەڵبەت ئەم تاوانبارکردنانەش ئەوەندەش بێ بناخەنین. بەڵام ڕەخنەگرانی لیبرالیزم بۆ خۆیان لەگەڵ گیروگرفتی بەچەندقات جدیتر ڕووبەڕووبوون. لەدنیای ئەندێشەو ڕۆشنبیریدا، کۆمەڵگایەکی دلبڕاو دروست دەکەن کە تێیدا تاک تاڕادەیەکی زۆر دەکەوتە ژێر فشارەوە. لەوە گرنگتر، مێژوو نیشانی داوە کە دیارترین جیلوەی کۆمەڵ پەرستی لە جل و بەرگی ڕێزگرتن لەسەرچاوە ڕۆشنبیریەکان بریتی



جۆن ستیوارت میل

بوو لە کۆبوونەوە گەورەکانی لایەنگرانی هیتلەر لە نۆرمبێرگ (لەسەرچاوە رۆشنبیریەکاندا دەتوانین ئاماژە بە رێزگرتن لەو ئیرادەیە بکەین کە سەرنجی بەرەو دەسەڵاتە). رەنگە، هەروەك بەو شێوەیەی جۆن ستورات میل رای لەسەر بوو، گەیشتن بە ئاکایەتی کارێکی ئاسان نەبێت، بەڵام تەنانەت ئەگەر هەوڵ و خەباتێکی زۆریشی بوێو نرخێکی گرانی لە پێناودا بدرێ، دیسان وادێتە بەرچاو کە ئەو نرخە کۆمەڵایەتیەی بۆی دەدرێ بە چەند پلەیەك کەمتر بێت لە هەر پشکێکی دیکە.

داخۆ لیبرالیزم لە لایەنە بنیاتیەکانیەوە دارماوە؟ سەرەکیترین رەخنەی مارکسیەکان لەم بوارەدا ئەوەیە کە کۆمەڵگای لیبراڵ گیرۆدەی ململانێی چینایەتیە. هەڵبەت گومان لەوەدا نیە کە لە شۆڕشی ***1917*** ی رووسیادا چینی کرێکار رۆڵێکی گرنگی بینیو کارگێڕی کرێکارانی ئاڵمانی بریتی بوو لە حیزبێکی سیاسی هەڵگری ئامانجە سۆسیالیستیەکان. بەڵام ئەورۆکە بەجوانی دەبینرێ کەشەڕخوازیی چینی کرێکار بەهیچ جۆرێك لە هەموو کۆمەڵگا سەرمایەداریەکاندا وەك یەك نەبوو: لە ئەمریکادا بە کردەوەو لە بەریتانیادا تەقریبەن لە گۆڕێدا نەبوو، لە ئاڵمان تەنیا لە شکڵی کلاسیکیدا بەتوندی لە ئارادابوو، لە رووسیایش لەهەموو شوێنێکی دیکە توندوتیژتر بوو. شەڕخوازی ئاکامی رژێمە کۆنە سەرەڕۆ و دەسەڵات خوازەکان بوو کە دەیانویست لە رێگای جۆرەها یاسای دژە سۆسیالیستیەوە کرێکاران وەلا بنێن. لەهەر شوێنێك کرێکاران بیانتوانیبا لە دەوڵەتە لیبراڵیەکاندا ئازادانە خۆیان رێك بخەن، ئەوا لەگەڵ دەوڵەتدا (کە مافی شارۆمەندی پێدابوون)، نە لەبەرەی سیاسیدا، بەڵکو لەبەرەی سەنعەتیدا، لە شوێنی کاردا دەجەنگان، تا کرێی زیاتر لە سەرمایەدارەکان وەربگرن و باروبۆخێکی باشتر بۆ خۆیان رێك بخەن. بەواتایەکی دیکە، لیبرالیزم ململانێ و شەڕەکان لە کۆمەڵگادا پەراکەندە دەکا، لە حاڵێکدا یەکانگیریی هێزو دەسەڵات، ناوەندیەتی پێ دەبەخشێ. ئەگەر هەندێك لە دەوڵەتە تاکە نەتەوەییەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا لە بواری سیاسیدا لەرزۆك بوون، زۆرتر بۆ ئەو هۆیە دەگەڕایەوە کە هێشتا لیبراڵ نەبوون، نەك ئەوەی کە سەرمایەدار بوون.

بەڵگەیەکی دیکە بۆ راستیی ئەم خاڵە بنەڕەتیە، کەم و کوڕییەکی دیکەیە کە لە بواری بنیاتەوە دەیگرن و، دەڵێن گرفتەکە لە پەیوەندیی لیبرالیزمە لەگەڵ سەرمایەداری. بەڵام ئەمجارە لە روانگەی لیبرالیزم یان ئازادیی لە بازرگانی نێونەتەوەییدا. گومان لەوەدا نیە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی ***19***دا چەند دەوڵەت دەیانویست لە بەرانبەر بازاڕی جیهانیدا پشتگیریی بەرهەم هێنەرەکانی خۆیان بکەن. ئەمە بووە هۆی چوونە سەرەوەی ئاستی پێشبڕکێ لە بازرگانی نێو نەتەوەییدا، بەڵام خودی ئەم پێشبڕکێیە نەبووە هۆی شەڕی چەکدارانە. شەڕی یەکەمی جیهان و هەروەها شەڕی دووهەمیش (کە ئەنجامی ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانە بوو کە لە ئاکامی شەڕی یەکەمی جیهاندا بەرەڵڵا کرابوون) ئەو دنیایەی پێك هێنا کە ئێستا ئێمەی تێدا دەژین. بەم هۆیە، دەبێ لە هۆکارو بنەچەکانی شەڕی یەکەم تێبگەین. بۆ

ئەم کارەیش پێویستە ماهییەتی دەوڵەتی ئاڵمان (لەو سەردەمانەدا) بناسین کە پشتیوانی کردنی لە نەمسا گرینگترین هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕی **1914** بوو. هەستیارترین خاڵ ئەوەبوو کە ئاڵمان لەسەردەمی قەیسەر ویلهێڵمدا خاوەنی دوو سیاسەت بوو: یەکیان ئاراستەی سەرانسەری جیهان کرابوو، کە ئەم سیاسەتە لەلایەن رۆشنبیران و چینی مام ناوەندیی (وەلانراوەوە)و لەلایەن هەندێك لە خاوەنانی سەنعەتە گەورەکان و سۆسیال دیموکراتەکانەوە پشتیوانی لێ دەکرا، سیاسەتەکەی دیکە ئاراستەی رۆژهەڵات کرابوو و لەلایەن سوپا و چینی تەقلیدی ئەریستۆکراتیی زەویدارەوە پشتیوانی دەکرا. ناکامی ئەم سیاسەتە دوو فاقەیە بووە هۆی ئەوە کە ئاڵمان هەموو دەوڵەتە گەورەکانی لە خۆی نامۆ کردو بەرەیەکی لە دژی خۆی پێکهێنا کە ئەمەش گەورەترین ترسی بە شوێنەوە بوو (واتە ترس لە شەڕکردن لە دوو بەرەدا). چلۆن ئەم هەڵە گەمژانەیە سەری هەڵدا؟

دەوڵەتی ئاڵمان دەوڵەتێکی پادشایی بوو: هەر کەسێك قەیسەر گوێی لێ راگرتبا، ئەوا خاوەن نفوز و دەسەڵات دەبوو. بەڵام گرفت لەوەدابوو کە قەیسەر ویلهێڵم بەبێ بوونی بیسمارکیش گوێی بۆ زۆر کەسان رادەگرت و متمانەی پەیدا نەدەکرد سەبارەت بەوەی کە ستراتیژێکی هەمە لایەنەی یەککرتوو رادەپەڕێندرێ. کەواتە لێرەدا دیسان دەگەڕێنەوە بۆ سەرشوێنی بەتاڵی لیبرالیزم -بەمانای حکومەتی کابینە و کۆنترۆڵ لەرێگای پارلەمانەوە- نەك بوونی سەرمایەداری وەك هۆکاری کارەساتەکە.

**سەرکەوتنی لیبرالیزم؟**

ئێستا کەسەدەی بیستەم بەرەو کۆتایی دەڕوا، هەندێك لابەن باس لەوەدەکەن کە لیبرالیزم سەرکەوتووە. ئەو خۆ بەزل زانینەی کە لەم قسەیەدا هەیە مرۆڤ تێك دەدا. هۆکاری بڵاوبوونەوەی لیبرالیزم لە نێو جەرگەی جیهانی پێشکەوتوودا، پێش ئەوەی بۆ هیچ چەشنە جەبرێك بگەڕێتەوە، بریتی بوو لە سەرکەوتنی هێزی ئەنگلۆساکسۆن لە دوو شەڕی جیهانیدا (هەڵبەتە بە لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەم سەرکەوتنانە گەلێك دژوار وەدەست هاتن). لەلایەکی دیکەوە، سڕینەوەی نیسـ ذمە اریش کە خەسڵەتی نالیبرالیەتی حکومەتی [illegible]ەوەی لە دەرەوە لە نێو برد، بەو شێوەیە کە دیم[illegible]ی هەبوو، نەیتوانی ببێتە هۆی بڵاوبوونەوەی لیبرالیزم، چونکە هەست کردن بە بەکارنەگیربی دەسەڵات بە مەبەستی گەشەی خێرا، بووەتە هۆی زیاد بوونی حکومەتە دیکتاتۆرو دەسەڵاتخوازەکان. بۆ ئەوەی کە بزانین لە کۆتایی سەدەی بیستەم دا لیبرالیزم لەچاو کۆتایی سەدەی *19* لە چ بوارو لایەنێکەوە بەهێز بووە و جێی گرتووە، دەبێ قایل بین بە هەندێك جیاوازی کە لە گۆڕێدان.

گەورەترین ئیستدلال بەمەبەستی لایەنگری لە بالاتربوونی لیبرالیزم، لە کۆتایی دەیەی **1950** دا هاتە ئاراوە، کە باسی لە "کۆتایی ئایدیۆلۆژیا" دەکرد. بۆچوونێکی وا هەم ریاکارانە بوو و هەم کاریگەریی بوو. چونکە ئەوەی دەشاردەوە کە لیبرالیزمیش بۆ خۆی یەکێك لە ئایدیۆلۆژیەکانەو پێویستی بە بەرگری لێکردن هەیە. بەڵام جگە لەمە، حەقیقەتێکی جێگای سەرنج لەم بۆچوونەدا

هەبوو کە (ئێستاش هەر هەیە) ئایدیۆلۆژیا گەورەکانی سەدەی بیستەم -لەراستی فاشیستیەوە بگرە تا چەپی مارکسی- بەهۆی رووداوە مێژووییەکانەوە گەلێك نفوز و هێزی خۆیان لە دەست داوە. هۆی بەردەوام بوونی رەزامەندی لەسەر لیبرالیزم، توانایی کۆمەڵگا لیبراڵی و سەرمایەداریەکانە لە بەرگری کردنی جەماوەر لە بەرانبەر ترسداو، هەروەها لەبەرهەم هێنانی سەروەت و سامان بۆ ناوکی ناوەندیی کۆمەڵ کە پێك هاتووە لە شارۆمەندانی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگە. هەڵبەت هەموو کەس ئەم دۆخە قبوڵ ناکات. گەلێك لە رۆشنبیران هێشتا لەگەڵ لیبرالیزم بەهۆی بێ بەزەیی بوونی ئەم سیستەمەوە، دژایەتی ئایدیۆلۆژیکیان هەیە. لەوە گرنگتر ئەوەکە سەرمایەداری، لە ئاستی جیهاندا گیروگرفتی قوڵ لەبوارەکانی بەرابەری و نابەرابەریدا دێنێتە گۆرێو، دیارنیە کە لیبرالیزم ناوکی ناوەندیی دەوڵەمەندەکان ببەزێنێ و خەلکانی دیکەش بگرێتەوە.

بەلام لە **1945** بەم لاوە، ئەو ناوکە ناوەندیە کە باسمان لێکرد گەلێك خوشگوزەران بووە. بالاتر بوونی ئەمریکا لە ناو کۆمەڵگە سەرمایەداریەکاندا بەگشتی، بووەتە هۆی سەرلەنوێ رێکخستنەوەی کۆماری فیدراڵی ئاڵمانیا و ژاپۆن و هەروەها بووەتە هۆی قبوڵکردنی بەربلاوی جۆرێك پێکەوە سازانی مێژوویی چینایەتی و بەرەوپێش بردنی بازرگانی ئازادی چەند لایەنە. لەم بوارەی دواتردا سەرکەوتن بەرادەیەك بووە کە سەرئەنجام بەراستی بوو بەهۆی دابەشبوونی نێونەتەوەیی کار. لە ساڵەکانی دواتر هاتنە خواری ئاستی سەرکردایەتی ئەمریکا لە بواری ئابوورییەوە، ئەم ترسەی هێناوەتە مەیدان کە ئەوەکا ململانێیە بازرگانیەکانی نێوان دەوڵەتە سەرمایەداریەکان، سەقامگیریی پەیوەندیە نێونەتەوەییەکان بشێوێنێ. هەڵبەت گومان لەوەدانیە هەندێك کێشە لە گۆرێدان (بەتایبەتی لە نێوان ئەورووپاو ژاپۆن و ئامریکادا)، بەلام زێدەرۆیی کردن لەبارەیانەوە بەرەو هەڵەمان دەبات.

لە ئاستی نێو خۆییدا لە کۆتایی دەیەی **1970**وە، قسەوباسی فراوان لە گۆرێدا بووە سەبارەت بەوەی کە دلخۆ ئەو پێکەوە سازانە چینایەتیە کە باسمان لێ کرد (واتە قبوڵ کردنی دابین کردنی کۆمەڵایەتی لەلایەن پارێزگارانەوەو قبوڵ کردنی بازاڕ لەلایەن سۆسیالیستەکانەوە) لە نێو چووە یان نا. سیاسەتمەدارانی وەك ریگان و تاچەر کە مەبەستیان ئەوە بوو متمانە بە سۆسیال دیموکراسی لە نێو ببەن، هەندێك لە ئایدیۆلۆگە راستڕەوە توندڕەوەکانیان (وەك فریدریش هایك و میلتن فریدمن) بە لیبراڵی "حەقیقی" نێو بردووە. دیعایەکانی راستە توندڕەوەکان مرۆڤ دەخەنە گومانەوە، چونکە هەموو دەوڵەتەکان دەخالەت لە ژیانی ئابووریدا دەکەن و، هیچ کامیان وازیان لە دابین کردنی کۆمەلایەتی نەهێناوە. وڵاتانی وەك ژاپۆن و ئاڵمان کە بەوپەڕی وردبینی و زانایییەوە کۆنترۆڵ و چاوەدێری کردنی ئابووریان لەلایەن دەوڵەتەوە بەشێوەی بنیاتێك لێ کردووە، بەرواڵەت لە چاو بەریتانیاو ئەمریکادا خاوەنی هێزی ململانێی زیاترن (بەریتانیا و ئەمریکایەك کە پەیرەوی لە سیاسەتی ئازادهێشتنەوە دەکەن).

مەسەلەیەکی گرنگ کە لیبراڵەکان لەم سەردەمەدا لە گەڵیا رووبەڕوو بوون، بریتیە لە چارەنووسی رژێمە پێشکەوتوو بەڵام لە هەمان کاتدا دەسەڵاتخوازەکان (ئەو رژێمانەی وا بەدەوری تەوەری دەسەڵات و هێزدا دەسووڕێنەوە). داخۆ ئەو رژێمانەی کە بە یەکانگیرکردنی دەسەڵات دەستیان داوەتە فراوانکردنی سەنعەت (واتە "شۆڕش لە سەرەوەیان" بە ئەستۆ گرتووە) دەتوانن بەسەرکەوتوویی بگەنە قۆناغی دیموکراسیی لیبراڵ؟ لە ئەورووپای رۆژهەڵات و ناوەندیدا گومان لەوەدا نیە کە بەهۆی فشاری سەرمایەداری لەدەرەوەو فشاری دەروونی (کە لەلایەن ئەو کرێکارانەوە دێتە گۆڕێ کە لە کرێکارانی دیکە خوێندەوارترتکن) مۆدێلی سۆڤیەتی داڕماوە. ئەم دەوڵەتانە هاوکات لەگەڵ دوو فشاردا رووبەڕوین، ئەوەی کە هەم بە سەرمایەداری بگەن و هەم بە دیموکراسی. ئەمەش کارێکی گەلێك گرانە، وەها کە گەلێك دوورە لە سەرکەوتن. تا بەر لە هەڵبژاردنەکانی پارڵمان لە ژوونەنی *1992*، دەکرا ئومێدێك هەبێ سەبارەت بە چارەنووسی چیکوسلۆڤاکیا (کە هەم بیرەوەریەکی لە دیموکراسی هەبوو و هەم لە سەنعەت)، دەکرا سەبارەت بە پۆلۆنیاش نیگەران بین (بەهۆی ئەو بیرەوەریەی کە لە جەشنێکی دیکەی حکومەت هەیبوو)، هەروەها لە رووسیاش بترسین (کە قەت بەهرەمەند نەبووە لە نەریتی کۆمەڵگای مەدەنی و دواتریش بێ بەری بوو لەو متمانە بەخۆبوونە بنەڕەتیەی کە لە ژیانی گوند نشینیەوە سەرچاوەی دەگرت). بەڵام چیکوسلۆڤاکیا لێك جیابووەوە، ئەو ئومێدەی کە هەبوو بۆ ئەوەی بە قۆناغی دووفاقی سەرمایەداری و دیموکراسی بگا (لە دوای کۆمۆنیزم) کەمتر بووەوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە رژێمە دەسەڵاتخوازەکانی سەرمایەدار تەنیا ئەوکات داهاتوویەکی باشتریان هەیە کە بە دیموکراسی بگەن. بەڵام لێرەشدا رەنگە ئاکامەکان جیاوازبن. دەوڵەتەکانی ئەمریکای لاتین هەمیشە ویستوویانە خەڵك سازدەن بۆ شەڕ، ئەمە رەنگە لە متمانە بە خۆبوون کەم بکاتەوە لە رەوتی کەمکردنەوەی ئەو فشارەی کە رژێمێکی دەسەڵاتخواز بەسەر کۆمەڵگادا دەیسەپێنێ. ئەم دەوڵەتە ناوبراوانە، جگە لەمە قەرزداری گەورەن و هەر بۆیە رەنگە هەر بەو شێوەیە لەنێوان دوو جەمسەری حکومەتێکی میلیتاری و حکومەتێك بە جیلوەی جەماوەریەوە لە هاتووچۆدا بن. داهاتوو لە ئاسیای رۆژهەڵاتدا روونتر دێتە بەرچاو، هەرچەند تایوان لە چاو کۆماری کۆریا داهاتوویەکی باشتری هەیە کە تێیدا یەکانگیریی گەورەیی خاوەنداریەتی، لەو فشارە پلورالیستیە کەم دەکاتەوە کە پێویستە.

بەڵام گرینگترین کێشەیەك کە لیبراڵەکان لە گەڵیا رووبەڕوون، شتێکە جگە لەمانە. کۆمەڵگاکانی وەك برازیل و ئەرژانتین، یا تایوان و کۆماری کۆریا، بەڕاستی دەبێ وەك وڵاتانێك سەیریان بکرێ کە خاوەنی "ئابووریی تازە بەسەنعەتی کراون"، واتە ئەو وڵاتانەی کە بەخێراییەکی پترەوە یان کەمترەوە بەهەرحاڵ کەوتوونەتە سەر رێگای ئەندامیەتی جیهانی پێشکەوتوو. بەڵام گەلێکی وڵاتان هێشتا لەسەر رێگای گەشەدا نین و وادێتە بەرچاو هەندێکی

دیکەیان قەت گەشە نەکەن، چونکە دووچاری زیاد بوونی توندوتیژانەی حەشیمەتن و خاوەنی سەرچاوە سروشتیەکان نین و بۆرۆکراسیی گەندەڵ سەرتاپای ژیانیانی داگیر کردوەو لە هەندێك بواریشدا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بە تووشی کارەساتی پیس بوونی ژینگەوە بوونە. هەبوونی دۆخێکی لەم چەشنە لە خۆیدا بەمانای سڕینەوەی لایەنێکی لیبرالیزمە کە زیا لە هەر شتێك رووی لە قازانجی بەکردەوەدایەو ئەویش بریتیە لە گەیاندنی خواردن بە برسیەکان. حاڵەتێکی لەم چەشنە بەر بە هێنانە گۆڕی ئەو مەسەلە گرنگانە دەگرێ کە لەگەڵ حکومەتی سیاسی لیبراڵی دێنە ئاراوە. راڤەیەکی دوورو درێژ سەبارەت بە ئابووریی جیهانی -بەپێی سەرچاوەکان و بازرگانی و گەشتی سەرمایە- بە جوانی ئەوە نیشان دەدا کە جیهانی پێشکەوتوو وابەستەیی نیە بە زۆربەی وڵاتانی لەم چەشنە، هەر بۆیە رۆژ بە رۆژ زیاتر گوێیان ناداتێ. ئەمە بەناچار لیبراڵەکان نیگەران دەکا. هەر بەو شێوەیەی کە وڵاتێکی خاوەن نەوتی وەك عێراق دەستی دەگاتە تەکنەلۆژیا پێشکەوتوەکانی بواری چەك، دوا رۆژ وڵاتە هەژارەکانیش هەر وەها دەکەن. هەژاریی و بێ دەرەتانیی بەشێکی گەورەی جیهان، نەتەنیا مەترسییەکی گەورەیە بۆ جیهانی لیبراڵ، بەڵکو پەڵەیەکی نەنگیشە بەسەر جەستەیەوە. ئەگەر لیبرالیزم دەیەوێ ... دەبێ لە رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەم ... گێل نەکات.

## پەراوێزەکان:

*John A. Hall, "Liberalism," In Joel Krieger, ed, the oxford companion to the politics of the world (New York: Oxford University Press, 1993), PP. 538- 642.*

*1-Vitalist Ideologies*

*2-زانست و هونەر وەرگێڕدراوی وشەی "فضیلت"ە*

*3- Richard Cobden (1804 - 1865). ئابووری زان و مرۆڤی سیاسی ئازادیخوازی بەریتانی. (وەرگێڕی فارسی)*

*4- John Bright (1811-1889) سیاسەتمەداری ئینگلیزی و یارو هاوکاری کۆبدێن لەگەڵیك لە ریفۆرمەکاندا (چ لە بواری ماف دا و چ لە بواری کۆمەڵایەتیدا)*

*5-Barrington Morre (Social Origins of Dictatorship and Democracy "Boston, 1966").*

## سەرچاوە:

کتێبی "عەقڵ لە سیاسەتدا" لاپەڕەکانی 376 تا 385.

# فەلسەفەی ئەڵمانیی هاوچەرخ

■ نووسینی: هاشم سالح

● و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

فەلسەفەی ئەڵمانی جێگای تایبەتی خۆی هەیە، نەك تەنها لە ئەورووپا بەڵكو لە سەرتاسەری جیهان دا. هەركە باسمان لەناوی گەورە فەیلەسوفانی سەردەمی تازە كرد، دەبینین زۆربەی زۆریان ئەڵمانین. لێرەدا ئەوەندە بەسە كە ناوی لایبنیتز و كانت و هیگڵ و ماركس و ماكس ڤیبەرو نیچەو فرۆید بهێنین. تەنانەت لای مارتن هایدگەر كار گەیشتە ئەوەی بڵێت (لە جیهان دا دوو زمان بۆ فەلسەفە لێدان هەیە: زمانی یۆنانی و زمانی ئەڵمانی. پاش سوكرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ، ئەوا فەلسەفە بۆ ئەڵەمانەكانە).

ئەم لێدوانە شۆڤێنیستییەی هایدگەر بەشێوەیەكی تایبەت بووە مایەی نارەزایی فەرەنسیەكان. چونكە ئەوان گەورەترین ركابەری مێژوویی ئەڵمانیەكانن لە ئەورووپادا. فەرەنسیەكان بۆ خۆیان خاوەنی چەندین فەیلەسوفی وەكی دیكارت و ڤۆلتێرو رۆسۆو سارتەرو میشێل فۆكۆو... هتد. سەرەرای ئەوە زمانی دیكەش هەیە كە بە فەلسەفەو فەلسەفەلێدان ئاشنا بوون و، بەشدارییان لە



هابرماز

دەوڵەمەند کردنی فیکری جیهان دا کردووە. ئەڵبەتە زمانی عەرەبیمان لەنێو ئەو زمانانەدایە. مەسەلەکە هەر چۆنێک بێت و هایدگەریش نەتەوەپەرستێکی توندڕەو بێت یان نا، ئەوا مەسەلەی بەشداریکردنی ئەڵمانی لە مێژووی فەلسەفەی تازەدا راستیەکی حاشا هەڵنەگرە. بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوەیە کە گەورە فەیلەسوفانی فەرەنسا زمانی ئەڵمانی دەزانن، یاخود هەوڵی فێربوونی دەدەن بە مەبەستی بە ئاگابوون لە گرنگترین سەرچاوە فەلسەفیەکان و زاراوە سەرەکیەکان. لێرەدا بەوەندە ئیکتیفا دەکەین کە گرنگترین ئاقارەکانی ئەم فەلسەفەیە بە درێژایی چل ساڵی رابردوو، واتە راستەوخۆ دوای جەنگی دووەمی جیهانی بخەینە روو. سەرەتاش لە قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە دەست پێ دەکەین.

## ئەوەی دامەزرێنەر: ماکس هۆرکهایمەرو تیودۆر ئادۆرنۆ

### (رەخنەگرتنی توند لە ئەقڵانیەتی خۆرئاوا)

پاش ئەزموونی فاشیزم و نازیزم و ئەو تاوانە دڕندانەیەی ئەنجامیان داو بووە مایەی کاولکردنی ئەوروپا، نەوەیەکی نوێ لە فەیلەسوفان بەدەرکەوتن کە نەفرەتیان لە هەموو شتێک دەکرد. گەر بزوتنەوەی سوریالیزم لە بواری ئەدەب و هونەردا پاش جەنگی یەکەمی جیهانی وەک پەرچەکردارێک لە بەرامبەر مەرگەساتەکانی جەنگدا هاتبێتە ئارا، ئەوا قوتابخانەی فرانکفۆرت لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە ئەمجارەیان وەک کاردانەوەیەکی فەلسەفی بەرامبەر تاوانەکانی جەنگ و دڕندایەتی سەرکێشیە بێ سەرو بەرەکانی نازیزم بەدەرکەوت.

ئاشکرایە قوتابخانەی فرانکفۆرت بە ماوەیەکی کەم بەر لە جەنگی دووەمی جیهانی دامەزرا، بەلام کارە فەلسەفیە سەرەکیەکانیان تەنها دوای جەنگ و، وەک پەرچەکردارێک لە بەرامبەر ئەو جەنگەدا نەبێت بەدەرنەکەوت. قوتابخانەی فرانکفۆرت لە ساتەوەختی دامەزراندنیەوە هەوڵی پێکهێنانی تیۆریایەکی رەخنەیی دەدا سەبارەت بە واقیع و کۆمەڵگەی ئەورووپی و پیشەسازی هاوچەرخ. سەرەتا تێزەکانیان گەشبینانە بوو، باوەڕیان بە تیۆریایی پێشکەوتنی خێراو بەردەوامی بزاوتی مێژوو هەبوو. بەلام دوای جەنگ بایاندایەوە بەلای رەشبینی داو، لەگەڵ گومانکردن لە توانستی ئەقڵ کە توانای ئەوەی هەبێت کۆمەڵگایەکی نوێی ئازاد بونیاد بنێت، کۆمەڵگەیەک خاڵیی بێت لە پاوانخوازی و چەوساندنەوە.

لە سەرەتادا ماکس هورکهایمەر (*1895–1973*) ئاراستەی ئەو قوتابخانەیەی دەکرد، لە قۆناغی دوای ئەویشدا تیودۆر ئادۆرنۆ (*1903–1969*) جێگای گرتەوە. هورکهایمەر یەکەمین کتێبی گەورەی خۆی لە ساڵی *1937*دا بڵاوکردەوە. واتە دوو ساڵ بەر لە جەنگی دووەمی جیهانی. ناونیشانی کتێبەکەشی (تیۆریای تەقلیدی و تیۆریای رەخنەیی) بوو. لەو کتێبەدا هۆرکهایمەر رەخنەی ئاراستەی هەردوو ئەو ئاقارە کردبوو، کە ئەوکات بەسەر فەلسەفەی ئەڵمانیدا زاڵ بوون: ئاقاری مارکسیزمی ئەرسۆدەکسیو، ئاقاری ئایدیالیستی (بۆ نمونە لە شێوە هایدگەریەکەیدا).

بەلام هورکهایمەر نەیدەویست دەستبەرداری ئەو میراتیە فەلسەفیە مەزنەی فەلسەفەی ئەڵمانی بێت، وەک ئەوەی مارکسیست و کۆمۆنیستەکان کردیان. ئەو پێی وابوو میراتی

کانت و هیگڵ شتێکی گەورەو بەنرخەو، پێویستە سوودی لێ ببینرێت. ئەندامێکی دیاری دیکەی قوتابخانەی فرانکفۆرت کە ئەویش هربرت مارکۆزەیە، هەمان ساڵ کتێبێکی دەربارەی (فەلسەفەو تیۆریای رەخنەیی) بڵاوکردەوەو، تیایدا هەمان راو بۆچوونی هۆرکهایمەری هەبوو.

وەك ئاماژەمان پێدا، بەرنامەی کاری ئەم قوتابخانەیە بریتی بوو لە: رەخنەگرتن لەو ئایدیۆلۆژیا تەکنۆکراتی و پۆزەتڤستیەی لە وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوادا باڵادەست بوو، هاوکات رەخنەگرتنیش بوو لە ئایدیۆلۆژیای مارکسیزمی ئەرسۆدەکسی و دلخراو بەسەر خۆی دا.

هەریەك لە هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆ پێیان وابوو دەتوانن بگەنە دیاریکردنی هێڵە گشتییەکانی (تیۆرەیەکی رەخنەیی) وا کە بەرنامەی کارێکی ئازادیخوازنەو ئینسانی پێشکەش بە کۆمەڵگەی پیشەسازی بکات. بەڵام تێڕوانینێکی گەشبینانەی لەو جۆرە بۆ گۆڕان و بۆ بزاوتی مێژوو، وەك پێشتر باسمان کرد لەسەر بەردی نازیزم و فاشیزم تێك شکا. کارێك کە بووە مایەی ئەوەی هەردوو ئەو فەیلەسوفە دوو کتێبی زۆر رەخنەگرانەو رەشبینانە دەربکەن: هۆرکهایمەر (ئاوابوونی ئەقڵ) و ئادۆرنۆش (دیالەکتیکی رۆشنگەری) لە ساڵی ***1947***دا نووسی. دوای ئەمە نیتر بڕوایان بە بەرەو پێشچوونی بەردەوامی مێژوو نەما، بەڵکو گەیشتنە قەناعەتێکی وا کە ئەو گۆڕانکاریانەی لە ئەورووپادا روودەدات، بێ چەندو چوون بەکۆمەڵگایەك دەگات بە شێوەیەکی رەها لە لایەن ئامێرو ئابووری و تەکنۆلۆژیاوە ئاراستە دەکرێت. کۆمەڵگایەکی لەم جۆرەش کۆمەڵگەیەکی تەکنۆکراتی دلخراوە بەسەر خۆیدلو، دەرفەت بە هیچ توانستێکی دیکە نادات کە هەوڵ و تەقەللای رزگاربوون یان خۆ قوتارکردن بدات.. ئەوە کۆمەڵگایەکە ملکەچی هەیمەنەی کوێرانەی میکانیزمەکانی ئابووری سەرمایەداریە کە تێر نابێت و، مرۆڤ تیایدا دەبێت بە شت، بە شمەك، بە ئامراز نەوەك ئامانج.

لە قۆناغی دواتردا (واتە دوای شەستەکان) ئادۆرنۆ دەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی فرانکفۆرت و ئاراستەی تیۆریا رەخنەییەکەی دەکات. هاوکات دەبێتە تیۆریستی یەکەم بۆ رەخنەگرتن لە ئەقڵی خۆرئاوا، یاخود لە ئەقڵانیەتی تەکنۆلۆژی باڵادەست. ئادۆرنو لە یەکەم کتێبی گەورەیدا (دیالێکتیکی رۆشنگەری) کە لە ساڵی ***1947***دا بڵاوی کردەوە، ئەوەی دەرخست کە چۆن ئەقڵ بەدەستی خۆی وێران کردووە. سەرەکیترین پرسیارێك ئادۆرنۆ لەو کتێبەدا کردی بەم جۆرە بوو:

چۆن چۆنی ئەقڵی رۆشنگەری، ئەو ئەقڵەی لەلای کانت گەیشتە دوا ترۆپکی خۆی، وای لێهات تەنها دوای سەدو پەنجا ساڵێك لە ئاراستەی دروستی خۆی لابدات و، فاشیزم یاخود نازیزم بەرهەم بهێنێت؟ چۆن کار گەیشتە ئەوەی هەموو ئەو هیواو ئومێدە گەورانەی خەڵك بە سەردەمی رۆشنگەری و ئەقڵی رۆشنگەری هەیان بوو، بە نائومێدیەکی ئاوەهاوماڵوێرانیەکی لەم جۆرە بگات؟

لە واقیعدا کۆمەڵگا خۆرئاواییەکان تەواوی خواست و ئومێدەکانی خۆیان لەسەر پەرەسەندنی ئەقڵانیەت و، تەشەنەسەندنی لەنێو ریزەکانی گەلدا بنیاد نابوو. بەو هیوایەی پرۆسەیەکی وا ببێتە مایەی رۆشنکردنەوەی گەل و، بەرەو پێشچوونیشی لەسەر ئاستی ئەخلاقی بۆ فەراهەم بکات. بەڵام ئەقڵ لە رێگەی راستی

خۆی لایدا، ئەو ڕێگایەی کانتی گەورە فەیلەسوفی ڕۆشنگەری نەخشەی بۆ کێشابوو. ئەقڵ لەبری ئەوەی ببێتە دەستوێژێك تا لە خزمەتی هەمووان‌دا بێت، بووە ئامرازێك بە دەستی تەنها چینێکی باڵادەستەوە، کە بۆ مەرام و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەکاری دەهێنا (مەبەست لەو چینە، چینی سەرمایەداری



هیگل

باڵادەستە).

تەنها وەڵامێکی لەبار بۆ ئەو پرسیارە لەلایەن هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆوە درابێتەوە بەم جۆرە بو: کۆنترۆڵکردنی سروشت لە ڕێی زانست و تەکنۆلۆژیاوە، پرۆژەی سەرەکی ئەقڵی خۆرئاوا بووە. نەك تەنها لە سەردەمی ڕۆشنگەری‌دا، بەڵکو لە سانەوەختی دیکارتەوە لە سەدەی حەڤدەدا. ئەم پرۆژەیە کارێکی ئیجابی و نایاب بوو، لەبەرئەوەی لەهەموو بوارەکاندا خۆشنوودی مادی بۆ خەڵکانی ئەورووپی دەستەبەر کرد. بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە بەهەمان ئاست پێشکەوتنی ئەخلاقی هاوشانی بەرەو پێشچوونی مادی نەبوو. بۆیە هاوسەنگی لە پرۆژەی مۆدێرنیتی خۆرئاوادا تێکچوو، پرۆژەیەك کە دیکارت سەرەتاکانی داڕشت و کانتیش بنەماکانی چەسپاند.

بەم جۆرە پرۆژەی ئەقڵ گۆڕرا بۆ دەست بەسەراگرتنی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە، لەبری ئەوەی ببێتە ڕزگارکەری مرۆڤ. ئەمەش نەك هەر تەنها بووە مایەی دروستبوونی هەیمەنەیەك لە چوارچێوەی کۆمەڵگا ئەورووپیەکان، لە ڕێی باڵادەستی خاوەن کارەکان بەسەر کرێکارداو چەوساندنەوەیان لەلایەن ئەوانەوە. بەڵکو هاوکات ئەو پرۆسەیە لە دەرەوەی کۆمەڵگە ئەورووپیەکانیش دا پەیڕەوکرا. کاتێك کۆلۆنیالیزم دەستی بەسەر تەواوی گەلانی سەر ڕووی زەوی‌دا گرت و، کەوتە چەوساندنەوەو بە تاڵان بردنی خێرو بێری وڵاتەکانیان.

بەم جۆرە ئەقڵی ڕۆشنگەری لە پرانسیپە سەرەتاییەکانی خۆی لایدا، ئەو پرانسیپانەی کە بەهەق ئینسانی بوو لە سەردەمی کانت دا. ئیتر ئەقڵ لەبری ئەوەی ببێتە ئامرازێکی سەرفرازی و ڕۆشنگەری بۆ سەرانسەری مرۆڤایەتی، بووە ئامرازێك لە دەستی چینێکی دیاریکراودا کە بۆ مەبەست و بەرژەوەندیەکانی خۆی بەکاری دەبرد. واتە بۆ پاوانخوازی زیاترو باڵادەست بوونی زۆرتر لە ناوەوەو دەرەوە بەکاری دەهێنا. بۆ ئەمە هەریەك لە ئادۆرنۆو هۆرکهایمەر زاراوەیەکی سەرەکیان لە مێژووی فیکردا داهێنا کە بریتیە لە: زاراوەی ئەقڵ ئامێری. لە ڕێی ئەمەوە سەرکۆنەی تەواوی ئەقلانیەتی خۆرئاوایان کرد. بەڵام ئادۆرنۆ ئەو بۆچوونە پەرەگیرەی خۆی لەسەر کۆنەکردنی ئەقلانیەتی خۆرئاوا گۆڕی، کاتێك کتێبە گەورەکەی (دیالەکتیکی نیگەتیڤ)ی لە ساڵی *1966* دا

بلاوکــردەوە. واتـــە دوای بیســـت ســـاڵ لـــە بلاوکردنەوەی کتێبــی یەکەمی. ئــەوکات دەســتی کــرد بــەوەی تیۆریایـــەکی زۆر میـــانڕەوتر بـــۆ رەخنەگرتن لە ئەقڵی خۆرئاوا بێنێتە ئارا.

لــێرەوە ئــادۆرنۆ زۆر بــە روونـــی جیـــاوازی لـــەنێوان دوو جـــۆر ئەقلانیـــەت دا دەکـــرد: ئەقلانیــەتێکی رۆشنگەرو ئازادیخوازتر لەلایــەك، لەگەڵ ئەقلانیەتێکی ئـامێری یـاخود چەوسێنەرو تــەکنۆکراتی ســاردو ســڕ لەلایــەکی دیکــە. بــە مانایەکی دی ئادۆرنۆ لــە قۆنـاغی دوای نووسینی (دیالەکتیکی نێگــەتیف)ەوە، دەســت بــەرداری ئەوە بوو کە بەشێوەیەکی رەها سەرکۆنەی ئــەقڵ بکات. بەڵکو ئەوەی ئەو رەخنەی دەکرد جۆرێکی تایبەتی ئەقڵ بوو: کە تایبەت بوو بە ئەزموونێکی مێژوویـــی ئـــەقڵی بۆرژەتفســـتیەوە، ئـــەقڵێك کـــە بەدرێژایی سەدەی نۆزدەو تا ناوەراستی ســەدەی بیستەم لـــە ئـــەورووپادا بالادەســـت بـــوو. بـــەلام ســـەرەرای ئـــەوەش رەشبینی بەرامبـــەر ئـــایندەی ئەقلانیــەت و مۆدێرنــە –واتــە بەرامبــەر ئـــایندەی شارســـــتانیەت– بـــە ســــەرکارو بەرهەمــــــەکانی ئادۆرنۆوە دیار بوو.

بەم جۆرە قوتابخانەی فرانکفۆرت کەوتــە نێـو تەلەزگەیەکی گەورەوە، تەڵەزگەیــەك کــە نـازانێت چــۆن چۆنــی لێــی دەربـاز بێـت. تەنانـەت توانــای ئەوەشی نیە تا پێشنیاری رێگایەکی تازە، یـاخود ئەلتەرناتیڤێکی دیکە بکات.

## یۆرگن هابرماز
## متمانەی بەخشینەوە بە ئەقلانیەت و مۆدێرنیتی ئەوروپی

گــەر بێــت و پرســیار لـــە هـــەر کارشناســێکی بواری فیکر بکەیت: کە گرنگــترین فەیلەسوفێکی ئــەڵمانی لە ساتەوەختی ئێســـتادا کێیـــە؟ ئـــەوا دەست بەجێ وەڵامت دەداتەوەو دەڵێـت: یۆرگـن هابرمـازە. ئەمـە دەڵێـین ئەگـەرچی ئــەڵمانیا لــە فەیلەسوف و بیرمەندی دیکــە خــالی نیــە، ئــەوەتا گادامیری پیرەمێرمان هەیە کە خاوەن عومرێکــی درێــژە (لــە ســەرو ســەوەد ســاڵیەوەیە). گادامـــیر قوتـــابی مـــارتن هایدگـــەرەو خـــاوەنی کتێبـــی بــەناوبانگی (حەقیقــەت و میتـــۆدە). هـــەروەها (کارل ئۆتۆ ئـابیل)یشمان هەیــە، کــە هاوزەمـانی هابرمازەو لــە رێچکـای ئــەوەوە نزیکـە. بێگومـان لەگەڵ ئەم ناوانەدا کەسانی دیکــەش هــەن، بــەلام ئــەوە تەنـها هابرمـازە لـەم چـەند ساڵەی دوایــدا ئەستێرەی بەختی لە درەوشانەوەدایەو، نێوەنــدە فەلسەفیەکانی کۆنـتـرۆڵ کـردووە. نەك تەنـها لـە ئەڵمانیادا، بەڵکو هەروەها لە فەرەنساو ئــەمریکاو سەرانسەری خۆرئاواشدا. دەکرێت بڵێین دوای [illegible] و شۆرەت و نێوبانگە زۆرەی فەیلەسوفی فەرەنســی میشێل فۆکۆ لە حەفتاکاندا بە دەستی هێنا، ئــەوا هیــچ کەســێك بــە رێنــەی هابرمــاز نــەیتوانیوە جێگــەی ئــەو بگرێتــەوە. ئــەوەی راســت بێــت مشتومرێکی فەلسەفی گــەورە لــەنێوان ئــەم دوو بیرمەندەدا دروست دەبوو، گــەر مردنــی لە ناکـاو ساڵی ***1984*** زەفەری بە فۆکۆ نەبردایە. مـردن لـە نان و ساتێکدا بەرۆکی گرت کە ئـەو لـە ترۆپکـی شکۆمەندیدا بوو.

هەر چۆنێك بێت هابرمـاز دەیـەوێت رێگایـەکی تازە بۆ خۆرئاواو ئەقلانیەتەکەی پێشـنیار بکـات، یـاخود مۆدێرنـە لـەو خـــەرەندە دەربـهێنێت کــە هەڵخلیسکاوەتە نـاوی. هابرمـاز هیـچ شـتێك لــەو رەخنـــە تونـدو تیژانـــە فـــەرامۆش ناکـــات کـــە ئاراسـتەی مۆدێرنـیزمی خۆرئـاوایی کـراوە، ئیــتر ئەمە لەلایەن قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە بێـت یـان لەلایەن میشـێل فۆکـۆو فەیلەسـوفەکانی پـاش بونیادگەری یاخود پـاش مۆدێرنێتیــەوە بێــت.



هایدگەر

بەڵکو ئەو سەرقاڵی پرۆژەیەکی درێژخایەنە بۆ قوتارکردنی ئەقڵ و ئەقلانیەت لە چنگی ئەوان، پاش ئەوەی رەخنەکانیانی بەسەرکردەوەو بۆچوونە ئیجابیەکانی لێوەرگرتن. سەرباری ئەوەش هابرماز میراتگری راستەقینەی قوتابخانەی فرانکفۆرتەو، یاریدەدەری ئادۆرنۆ بووە لە زانکۆدا بەرلەوەی خۆیشی ببێتە مامۆستا لەوێدا، هەندێك بەدوایین نوێنەری قوتابخانەی فرانکفۆرتی لە قەڵەم دەدەن، هەرچەندە ئەو لە چەند خاڵێکی سەرەکیدا بۆچوونەکانی لەگەڵ قوتابخانەی فرانکفۆرت دا یەکناگرێتەوە.

بەڵام با لێرەدا بچینە ناو وردەکاری زۆر زیاترەوەو بپرسین خاڵی دەسپێکی سەرەکی بۆرگن هابرماز کامەیە؟ لە کتێبە گەورەکەیدا (تیۆرەی کردەی کۆمنیکا شیۆنخوان) کە ساڵی *1981* کەوتە بەردەستی خوێنەران، هابرماز هەوڵی ئەوە دەدات سەرلەنوێ مەسەلەی ئەقلانیەتی نوێ بێنێتەوە بەر باس. لەم سەروبەندەشدا کارەکانی سۆسیۆلۆژیبەناوبانگی ئەڵمانی: ماکس ڤیبەر (*1864*–*1920*) دەکاتە خاڵی دەسپێکی سەرەکی، لەبەرئەوەی ڤیبەر گەورەترین تیۆرسینی مەسەلەی ئەقلانیەت و مۆدێرنێتییە لە خۆرئاوادا (ئەڵبەتە لە دوای هیگڵ)ەوە.

ماکس ڤیبەر سەرنجی کۆمەڵگە ئەورووپیەکانی داوەو، بە چاکیش لەو گۆڕانکاریە پیشەسازی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیانە ورد بۆتەوە کە بەسەریاندا هاتووە. لێرەوە ڤیبەر پێی وابووە نهێنی جیاوازی ئەم کۆمەڵگایانە لە سەرجەم گەلانی دیکەی سەر رووی زەمین و، نهێنی سەرکەوتن و باڵادەستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ تەنها مەسەلەیەك: ئەویش مەسەلەی ئەقلانیەتە. ئەو لە وەها ئەقلانیەتێکی رماڵەرو سەراپاگیردا، هەم دیاردەیەکی سلبی و هەم دیاردەیەکی ئیجابی بەدی دەکرد.

هەرچی لایەنە نێگەتیڤەکەیەتی لە هاتنە ئارای ئەوەدایە کە ناوی نابوو (نائومێدی جیهان)، یاخود پاشەکشە کردنی پاکیەتی و ئەفسون لەسەر رووی جیهان. لە رابردوودا جیهان بە جادوو، بەجوانی، بە بلن و بەرامەی ئەفسانەو، بە سەرکێشیەکانی خەیاڵ دەور درابوو. پاشان ئەقلانیەتی زانستی هات بۆ ئەوەی ئەم رووپۆشە ئەفسوناویە لەسەر رووی هەڵبماڵێت. لە جێی راڤەکردنە میتۆلۆژیەکانیش بۆ دیاردەکان شیکردنەوەی ئەقلانی و زانستی دانا، لەپای ئەمەشدا ئەوە رووی‌دا کە بە دیاردەی مۆدێرنێتی ناودەبرێت. لەبەرئەوەی مۆدێرنێتی بەمانای گواستنەوە دێت لە دیدێکی میتۆلۆژی یاخود شیعریەوە بۆ جیهان، بەرەو دیدگایەکی

ئەقلانی و سروشتی کە جیهان وەکی خۆی دەبینێت.

هەرچی لایەنی پۆزەتیڤیشە لە ئەقلانیەت (یاخود لە مۆدێرنیتی)دا، ئەوا لە کۆنترۆلکردنی سروشت و پەیبردن بە یاساکانی و ملکەچ پێکردنی بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ و فەراهەم کردنی خۆشنودی مادی و ئابووری و، بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی و کەمکردنەوەی رەنج و ماندووبوونی مرۆڤەوە دێت، لە رێی داهێنانی ئامێرو ئەو پێشکەوتنە بێ سنوورەوە کە زانستی پزیشکی و. هتد، پێی گەیشتبوو.

بە کورتیەکەی بەرنامەی دیکارت -باوکی ئەقلانیەتی نوێی ئەورووپا- کە هێڵە پان و بەرینەکانی بەوپەڕی تواناو لێهاتوویەوە لە کتێبە بەناوبانگەکەی‌دا (وتارێك دەربارەی میتۆد) کێشابوو، هاتەدی. بەلام گرفتی مۆدێرنە بەپێی دەست نیشانکردنی ڤیبەر ئەوەیە لە کاتێکدا مرۆڤی لەو تێگەیشتنە تەقلیدیە رزگارکرد کە بۆ جیهانی هەبوو، لە هەمان کاتدا توریدایە نێو زەلکاوی بێ ماناییەوە، یاخود خستیە ناو بەتاڵیەکی بەرین لە ماناوە.

جیهانبینی کۆن مرۆڤی والێدەکرد هەست بە دلنیایی رۆحی بکات، لەبەرئەوەی بەهاکانی بەشێوەیەکی توندو تۆڵ دیاری دەکردو، مرۆڤی ناچار دەکرد پابەند بێت پێیانەوە. بەلام هەرچی جیهانبینی تازەیە مرۆڤی تەنها لە بەرامبەر رەفتارەکانی خۆیدا بەرپرسیار کرد.

راستە دیدگای نوێ مرۆڤی ئازاد کرد یاخود ئازادی پێ بەخشی، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا توڕی دایە نێو گێژەنی بەرپرسیارێتیەوە هاوکات مۆدێرنێتی دەرگای لەبەردەم فرەیی بەهاکان و دیدو بۆچوونە جیاجیاکاندا ئاوەلا کرد. کارێك کە رەنگە بێتە مایەی گەیشتن بە عەدەمیەت، ئەو عەدەمیەتەی فردریش نیچە بەشێوەیەکی جوان وەسفی کرد. بە واتایەکی تر هەموو شتێك نرخی خۆی هەیە، مۆدێرنێتیش باجی گرانی خۆی هەیە. هەروەها دەتوانین بلێین: مۆدێرنێتی نەیتوانی قەرەبووی ئەو بێمانایە بکاتەوە کە لە ئاکامی بەرتەسك بوونەوەی تێڕوانینی کۆن بۆ جیهان هاتبووە ئاراوە. بەم جۆرە مرۆڤ بووە کائینێکی ئازادو، ترساو لە قەوارەی ئەو ئازادیەی بوو بە خاوەنی. چونکە دواجار جیهانێکی بە ئەقلانیکراو خاڵی لە مانا، مسۆگەر بەرەو فرە بەهایی دەچێت. واتە بەهاکان رێژەیی دەبن، ئەمە لە کاتێکداو پێشتر بەهاکان رەهابوون و مانایان بە بوونی ئینسان دەبەخشی.

لێرەوە دەبینین ئەوەی مرۆڤ بەدەستێکی پەیدای دەکات بە دەستەکەی تری لە دەستی دەدات. لە پای ئەمەدا ئاقار گەلێك لە فەلسەفەی خۆرئاوادا هاتنە ئارا بۆ سەرکۆنە کردنی مۆدێرنێتی و ئەقلانیەتی راماڵەر، هەر لە فردریش نیچەوە تا قوتابخانەی فرانکفۆرت و میشێل فۆکۆ. تەنانەت ئەقل لای هەندێك زۆر بە ئاسانی بووە هاوتای چەمکی سەرکوتکردن و، زیندان و، هەیمەنەو، کۆنترۆڵ کردن.

لەم سەرو بەندەدا ماکس ڤیبەر پێی وایە کە بە ئەقلانی کردنی جیهان، یاخود کۆنترۆڵ کردنی ئەقلانیانەی تەواوی بوارەکانی ژیان و کارو چالاکیەکانی مرۆڤ، بۆ خۆی دیاردەیەکی تەواو ئەورووپیە. هەر بۆیە لە پای ئەمەدا ئەو پرسیارە دەکات: کە بۆچی وەها دیاردەیەك هەر لە ئەورووپادا روویدا، نەك لە جێگایەکی دیکەی جیهاندا؟

**سەرچاوە:**

هاشم صالح: قراءة الفكر الاوروبي الحديث -كتاب الرياض- الطبعة الاولى، 1994.

# قوتابخانەی فرانکفۆرت

## دامەزراندنی تیۆری رەخنەیی بۆ کۆمەڵگا

■ ئیبراهیم ئەلحەیدەری

● و: ئازا حەسیب قەرەداغی

**چەپی ئەڵمانیا.. خۆی لە رەخنەگرتن لە کۆمەڵگاو دامەزراوەکانیەوە دەگوازێتەوە بۆ رەخنەگرتن لە فیکرو میکانیزمەکانی تا تیۆریەکی رەخنەیی بۆ کۆمەڵگا داڕێژێ.**

هەمیشە لە بارەی رۆڵ و ئەرکی فەلسەفە لە ناو کۆمەڵگاو، ئەو چارەسەرانەی بۆ قەیران و مەینەتی و میوا ئایندەییەکانی مرۆڤی هاوچەرخ پێشکەشی دەکات، پرسیار دەکرێ.

بەر لە هەموو شتێ، فەلسەفە ئامرازێکی مەعریفیی رەخنەییە. رزگارکردنی مرۆڤ و دەرهێنانەوەی لەناو کەندەڵانی نەزانی و خورافەو قەدەری کوێرانەو، ناساندنی خۆی بە خۆی و، رەخنە لێگرتنی لە پێناوی راپەڕاندنی هوشیاریی مرۆیی لە مرۆڤدا ئامانجی فەلسەفەیە.

لەراستیدا رەخنە، ئێستاپشی لەگەڵدا بێ، گرنگترین و مەترسیدارترین کەرەستەی مەعریفیی (ر. دو) فەلسەفە بەهۆیەوە توانیویەتی رەخنە لە بیروڕاکان بگرێ و، لەوەش زیاتر لە واقعی کۆمەڵایەتیشدا پراکتیزەی بکات. ئەمەش ئەو کارە بووە کە تیۆری رەخنەیی قوتابخانەی فرانکفۆرت کردوویەتی، بەو پێیەی کە ئەم قوتابخانەیە یەکەم رەوتی فەلسەفیی -کۆمەڵایەتی رەخنەیی و هاوچەرخ بووە کە رەخنەی لەو بیروڕایانە گرتووە کە چەرخی رۆشنگەرایی بانگەشەی بۆ کردن، بەڵام لە جێبەجێکردنیاندا شکستی خوارد.

قوتابخانەی فرانکفۆرت بەم رەخنەیەی ویستوویەتی تیۆرییەکی رەخنەیی نەوتۆ بۆ کۆمەڵگا داڕێژێ بیرکردنەوەو کارکردن لە پەیوەندییەکی دیالیکتیکدا پێکەوە ببەستێتەوە.

کە بمانەوێ فیکر و فەلسەفەو پێشەنگانی دامەزراندنی قوتابخانە رەخنەییەکەی فرانکفۆرت بە پەلە بناسێنین، کارێکی سانا نابێ، بەتایبەتی کە ئەو قوتابخانەیە ئەمڕۆ لە بوارەکانی فەلسەفەو سۆسیۆلۆجیاو سایکۆلۆجیاو ئەنترۆپۆلۆجیاو تەنانەت بۆ ئەدەب و هونەرو مۆسیقاش بۆتە بناغەی زۆرینەی تیۆری و رەوتە رەخنەییەکانی پۆست مۆدێرنیزم.

هەروەها کارێکی ئاسان نییە کە موتابەعەی سەرچاوەکانی سەرەتاکانی دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیەو، رایەڵە تێکچرژاوەکانی پەرەسەندنی و، گەلاڵە بوونی تیۆرییە رەخنەییەکەی بکەین. بەپێی توانا هەوڵ دەدەین ئەو پەیوەندییە ئاڵۆزە بدۆزینەوە کە بیروڕای پێشەنگانی ئەم قوتابخانەیە هەیانبووە لەلایەکەوە بە فەلسەفەکانی هیگلیزم و ماکسیزم و پۆزەتیفیزمەوە، لەلایەکی تریشەوە بەو بزووتنەوانەوە کە لاوان و قوتابیان لەناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی رابردوودا تەقاندییانەوە.

هەوڵ دەدەین رەهەندە فیکری و فەلسەفی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەم قوتابخانەیەو کاریگەرییەکانی لە پەرەسەندنی بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتی‌و، بزووتنەوە کۆمەڵایەتی‌و کلتووری و سیاسییەکان لە رۆژئاوادا نیشان بدەین، کە هەر ئەمەیشە ئەم لە تیۆرییە فەلسەفی و سۆسیۆلۆجییەکانی دیکە جیا دەکاتەوە. هەروەها هەوڵ دەدەین باسێك لە گرنگترین ئەو کۆسپ و تەگەرانە بکەین کە هاتوونەتە رێی کاروانە فیکرییە درێژخایەنەکەیەوە. هەرچەندە مۆمی زۆربەی گەورە پێشەنگای ئەم قوتابخانەیە کوژاونەتەوە، بەڵام بیروڕا فەلسەفی و سۆسیۆلۆجییە رەخنەگەرلییەکانیان هێشتا زیندوون‌و، ئەوەش گەواهییە بۆ زیندوویێتی و هێزی کاریگەرانەی ئەو بیروڕایانە کە نوێنەرایەتی ئەوەیەکی نا ئاسایی کرد، ئەوەیەك کە ساتە مێژووییەکەیشی نا ئاساییانەو جیاوازانە تێپەڕی. ئێستا لە گەورە پێشەنگانی ئەم قوتابخانەیە تەنها "یۆرگن هابرماز" لە ژیاندایە و بەیەکێك لە گرنگترین بیرمەندان‌و فەیلەسوفە رەخنەییەکانی ئەورووپا دادەنرێ.

## تیۆرییەکی رەخنەیی بۆ کۆمەڵگا

تیۆری رەخنەیی، بە قوتابخانەی فرانکفۆرت بۆ لێکۆڵینەوە سۆسیۆلۆجییەکان دەناسرێتەوە. ئەم تیۆرییە بەر لە هەر شت تیۆرییەکی رەخنەییە بۆ کۆمەڵگاو جەخت لەلایەنە کۆمەڵایەتییە کردەییەکان دەکات لە رەفتاردا، بەوپەڕی توانا هەوڵ دەدات بە دوای ئەو وزانەدا بگەڕێ کە لە هەناوی ئازادی و دادوەری و بەختیارییدا هەن کاتێك لە بارودۆخێکی مێژوویی دیاریکراودا و، بەپێی مەرجی مێژوویی دیاریکراو پیادە دەکرێن. سستەمێکی کۆمەڵایەتی باشتر کە تێیدا ئەو وزانەو ئەو بارودۆخە فەراهەم دەبن ئامانجییەتی. وەك تیۆرییەکی سۆسیۆلۆجی پێوەرانە، تیۆری رەخنەیی هەوڵ دەدات هۆکارەکانی هەبوونی بارودۆخی خراپ لە واقیعی کۆمەڵایەتیدا دیاری بکات و تێیان بگات. ئەم ئامانجەش لەگەڵ وتەزاکانی پێشەنگانی ئەم تیۆرییەدا وێك دێتەوە، بە تایبەتیش ئەوی "ماکس هۆرکهایمەر" و "تیۆدۆر ئادۆرنۆ"، هەروەها لەگەڵ وتەزاکانی هاوەڵان و قوتابییە هاوچەرخەکانیشیاندا وێك دێتەوە، لەسەرووی هەموویشیانەوە "یۆرگن هابرماز".

هۆرکهایمەر ئاماژە بەوە دەکات کە تیۆری رەخنەیی بە پلەی یەکەم تیۆرییەك نییە بۆ مەعریفە یان بۆ حەقیقەت، هەرچەندە ئەویش بەشێکە لەو هەوڵە بەردەوامانەی لە پێناوی گەیشتن بە حەقیقەت دەدرێن. بەسەرچاوەگرتن لەوەیشەوە کە بایەخ بەلایەنی فەلسەفییانەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەدات، کەواتە هەوڵێکی جددییە بۆ دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیفێکی تیۆری -رەخنەیی فۆرمەلە کراو تا بە رووی ئەو تەوژمە فیکری و فەلسەفییە تەقلیدی و باوانەدا بوەستێتەوە کە خاوەنی دەسەڵات بوون‌و بەچەندین شێواز ویستوویانە لەناو بردنێکی خۆبەخۆیی لە مێژووی فەلسەفەدا دروست بکەن. مێژوویەك کە تیۆری ناچارکردوە پاشەکشە بکات لەبەر ئەمانە، تیۆری رەخنەیی لەسەر بناغەی راست و دروستی مەنهەجی بەستنەوەی

دیالێکتیکانەی نێوان تیۆر و پراکتیك دروست بوو. هەروەکو هۆرکهایمەر دووپاتی دەکاتەوە دەبێ دیالێکتیکی تیۆری و پراکتیك ناوخۆیی بێ، تەنانەت ئەگەر تیۆریێ پشتی کردە تێگەیشتنێکی خۆیی، لەساتە وەختی پێکهاتنی بەرژەوەندیدا، بەلام هاوکات دەبێ تیۆری رەخنەیی واز لە



هربرت مارکۆز

لێکچوون و بریارە یەکلاکەرەوەکان بهێنێ کە بەرژەوەندییەکان دەوروژێنن یان پێیانەوە گرێ دراون. هەروەها دەبێ واز لە هەموو ناو بژیوانییەکیش بهێنێ، چونکە بەهای هەر تیۆرییەکی رەخنەیی بۆ کۆمەلگا بەجیاکردنەوەی روالەتییانەی حەقیقەت بریار نادرێ، بەلکو بەوەی لەساتە وەختێکی دیاریکراوی مێژوویدا ئەرکی خۆی بە گوێرەی هێزە کۆمەلایەتییەکان جێبەجێ بکات. پیادەکردنی هەلوێستێکی وا لە بناغەوە لە پێناوی ئاراستەکردنی مەعریفەی خۆییە بەرەو کۆمەلگاو بەرژەوەندییەکی عەقلانی پۆزەتیڤ. ئەمەشە وای لێ کردووە ببێتە فەلسەفەیەکی کۆمەلایەتی کە ئامانجەکەی رەخنەگرتن لە کۆمەلگاو داشۆرینییەتی لەرێی رەفزکردنییەوە ئەگەر کۆمەلگایەکی نەگەتیڤ بوو. بە واتایەکی تر داشۆرینی کۆمەلگای پیشەسازی-بۆرجوازی و عەقلانییەتە تەکنەلۆجییەکەی و هەر ئایدیۆلۆجیایەك کە پێوەی پەیوەستە. چونکە رەخنەگرتن لە کۆمەلگا رەخنەگرتنێکی خۆییشە بۆ ئەو بیروڕایانەی ئەو کۆمەلگایە بەرهەمیان دێنێ.

ژمارەیەك بیریاری سۆسیۆلۆجی کە زۆریەیان سەربە "چەپی ئەورووپا" بەگشتی و هی ئەلمانیا بوون بە تایبەتی، نوێنەرایەتی تیۆری رەخنەییان کردووە. ئەمانە بەر لە خەلکی تر لەرێی رەخنەی فەلسەفی و سۆسیۆلۆژی و سیاسییانەوە، بەهۆی رەفزکردنی ئەو سیستەمە کۆمەلایەتییە هەبووەو، ئەو ئایدیۆلۆجیایەی لە هەناوی ئەو سیستەمەدا بووە ژمارەیەکی زۆر پرسیاری مەعریفیان ورووژاندووە کە بانگەشە بۆ گومان و رەوایی دیالێکتیك دەکەن. بەرچاوترین مەسەلەش کە ئەمانی لە غەیری خۆیان جیادەکردەوە، ئەوە بوو کە ئەمان لە هەولی دارشتنی تیۆرییەکی رەخنەییدا بۆ کۆمەلگا، لە رەخنەگرتن لە خودی کۆمەلگاو دامەزراوەکانیەوە، گوازرانەوە بۆ رەخنەگرتن لە لێکەرو میکانیزمەکانی. ئەمەش سەرنجی روشنبیرانی ئەورووپا و ئەمەریکای راکێشاو وای لێ کردن بایەخی پێ بدەن و، هاوکات لە شەستەکانی سەدەی رابردوودا لاوان و قوتابیانی بزواند بۆ بەرپاکردنی چەندین جموجولی ریفۆرمانە لە زانکۆو دامەزراوە زانستییەکانی زانکۆ، تەنانەت لەناو دامەزراوە ئابووری و کۆمەلایەتیو سیاسییەکانیشدا.

## قوتابخانەی فرانكفۆرت

ئەم تیۆرییە رەخنەییە بەناوی داهێنەرەكەیەوە "ماكس هۆركهایمەر- 1895-1973"و هاوەڵەكەی "تیۆدۆر ئادۆرنۆ -1903-1989"وە دەناسرێتەوە. ئەو دوانەش ناوەكانیان پەیوەستە بە ئەنستیتوی لێكۆڵینەوە سۆسیۆلۆجییەكان لە زانكۆی گۆتە لە فرانكفۆرت، كە پاشتر ناوی لێنرا "قوتابخانەی فرانكفۆرت".

قوتابخانەی فرانكفۆرت بە ژمارەیەك رەوتی فەلسەفی و كۆمەڵایەتی جیاجیاوە دەركەوتووە، كە دەكرێ بەم چەند دانەیە چڕیان بكەینەوە:

1-رەوتەكەی هۆركهایمەر و ئادۆرنۆ. ئەمان رێبازی رەخنەیی دیالێكتیكییان هەبوو. یەكخستنی تیۆری و پراكتیك و، پێشكەشكردنی تیۆرییەكی رەخنەیی بۆ كۆمەڵگا ئامانجیان بوو كە بتوانێ رووبەڕووی چەمكی خۆزاڵكردن و توندو تیژی ببێتەوە و هەوڵبدات فیكری رەخنەیی ببێتە لیبراڵ و نالیبراڵ لەیەك كاتداو، شەرم لە ململانێی كۆمەڵایەتی نەكاتو، لەوەشدا رەزیل نەبێ كە لەم ململانێیەدا، بەرامبەر هەردەسەڵاتێك نەرمی بنوێنێ، چونكە ئەو دەیەوێ سەربەخۆیی خۆی هەبێ و، كار دەكات لە پێناوی بەدیهێنانی دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر ژیانی خۆیدا، هەروەكو چۆن دەیەوێ دەسەڵاتی بەسەر سروشتدا هەبێ.

2-رەوتی هێربەرت ماركۆزا (1898—1979): رەفزكردنی ئەو كۆمەڵگا توندوتیژە بوو كە هەبوو. داوای دەكرد شۆڕشی لە دژ بكرێ. لەم شۆڕشەشدا رۆڵی یەكلاكەرەوەو شۆڕشگێڕانەی (عەقڵ)ی لەژیانی مرۆڤدا دووپات دەكردەوەو، داواشی دەكرد كە نابێ لە دیدێكی تاك رەهەندییەوە تەماشای كۆمەڵگا بكرێ.

3-رەوتی سایكۆلۆجی - شیكەرەوەیی كە لە بیروڕایەكانی ئەریك فرۆم و نیوفرۆیدیەكاندا بەرجەستەیە. ئەم رەوتە لەسەر زەمینەی پێشینە ماركسیزمییەكان لە شیكردنەوەی دەروونیدا دروست بووە.

4-رەوتی یۆرگن هابرماز (1929) كە رەوتێكی فەلسەفی ئەنترۆپۆلۆجییەو، هەروەكو لە تیۆرییەكەیدا سەبارەت بە رەفتاری پەیوەندگەرایی دایڕشتووە ئەوا هابرماز جەخت لەسەر دیراسە كردنی سەرمایەداریی ئەم دواییە دەكات، بەو پێیە كە كۆمەڵگایەكی پیشەسازی عەقڵانی خاوەن ئایدیۆلۆجیایەكی تەكنۆكراتییە.

بەپێی ئەوانەی ئاماژەمان پێكردن، دەردەكەوێ كە قوتابخانەی فرانكفۆرت لە درێژەی كاروانی خۆیدا چەند رەوتێكی جیاجیای گرتووە. ئەوەش لەلایەك بەهۆی پێشینەی كۆمەڵایەتی پێشەنگەكانیەوەو، لەلایەكی تریشەوە بەهۆی بایەخە جۆراوجۆرەكانی ئەوانەوە كە پەیوەندیدار بووە بە بیروڕایەكانی سەردەمی رۆشنگەرایەوە، واتە هەر لە میتافیزیكای كانت و هیگڵەوە تا لێكدانەوەگەرایی ماكس فیبەرو، فینۆمینۆلۆجیای هۆسرل. لەگەڵ ئەوەشدا و سەرەڕای جیاوازیان خاڵی هاوبەش لە نێوان ئەو پێشەنگانەدا هەن بەتایبەتیش لەوەدا كە هەموویان رەخنەیان لە كۆمەڵگای پیشەسازی شمولی و ئەو ناكۆكیانە گرتووە كە دەرهاویشتەی ئەو كۆمەڵگایەن. یەكێكی زۆر بەرچاو لەو ناكۆكیانە كلتوورو رۆشنبیریی بۆجوازییە.

## تیۆریو پراكتیك

یەكێك لە گرنگترین هۆكار كەوای كرد تیۆری رەخنەیی دروست ببێ و بەتەواوەتی لە هەموو گروپە ئەڵمانییە تەقلیدییەكان جیاوازبێ، ئاسەوارەكانی جەنگی یەكەمی جیهانیی و، كاریگەرییە كۆمەڵایەتیو ئابووری و سایكۆلۆجییە

جەرگبڕەکانیو، ئەو مەرگ و کاولکاری و دلڕمانە بوو کە لەو جەنگە کەوتنەوەو، دەرەنجامیش بەدوای خۆیدا قەیرانێکی قوڵی ئابووری دروست کرد، هاوکات وەرچەرخانی سیاسی گەورەیشی لێ کەوتەوە، لە سەرووی هەمووشیان شۆڕشی بەلشەوی (*1917*)و دامەزراندنی یەکەمین دەوڵەتی سۆسیالیستی بوو لە ئەورووپادا. هەروەها دامەزراندنی کۆماری فایمار لە ئەڵمانیا (*1919*) کە لە دوابەدوای ئەودا ململانێ و لێکترازاندنی سیاسییانە لە ریزەکانی چەپی ئەورووپادا رووی داو، بوونە هۆی دروست بوونی هەڵوێستی سێیەم کە بناغەی پێکهاتنی بیروڕایەکی رەخنەگرانەی نوێ بوو. چەقی بایەخی ئەم بیروڕایە پەیوەندی نێوان تیۆری و پراکتیزە کردنی لە واقیعی کۆمەلایەتیداو، پەرەپێدانی پێوەرێکی نوێ بوو کە پراکتیك بە پێزانینێکی تیۆرییانە تێر بکا، بەلام تیۆرییەك کە لەسەرەتاگەیەکی رەخنەگرانەوە هاتبێ و دیالیکتیکانە خۆی بە پراکتیکەوە گرێ بدا. بەو جۆرە کە ئیتر رەخنە ببێتە ئامانجی هەر چالاکییەکی شۆڕشگێڕانە.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە شکست خواردنی بزووتنەوە کرێکارییەکان لە ئەورووپاو دوورکەوتنەوەیان لە ئامانجە چینایەتییەکانیان هۆکارێکی دیکەی سەرکەوتنی نازیزم بوو لە ئەڵمانیا. ئەم فاکتەرانەو هی دیکەش نیشکالییەتێکیان لەسەر شانۆی سیاسی و فیکری دروست کردو وەك هۆرکهایمەر دەڵێ: "کەمەیەکی [illegible]کا[illegible]ەسات"یان رێکخست و دەرەنجام هانی کرمانەی "چەپی نوێ"ی دا لە ئەورووپادا کە وەك بابیرانیان "هیگلییە لاوەکان" کاربکەن بۆ چارەسەرکردنی ئەو مەسەلە قوڵانەی رووبەڕوویان ببوونەوە. ئەوە بوو سیمیناری "بوژاندنەوەی مارکسیزم" یان سازکردو، ژمارەیەك فەیلەسوف و بیریارانی گەورە بەشدارییان تێداکرد. لەوانە لۆکاش و فتفۆگل و هی‌تر. دەرچوونی کتێبەکەی لۆکاش بەناوی "مێژوو و هۆشیاری چینایەتی" گفتوگۆو دەمەقاڵێیەکی فراوان و توندی نایەوە چونکە ئەو رەخنەی لە دیالیکتیکە ماتریالییەکەی فردریك ئەنگلس گرتبوو. ئەو دەمەقاڵێ فیکرییانە پەرەیان بە تیۆری رەخنەیی داو، لە ئەنجامدا ئەنستیتۆتێك بۆ لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆجی لە زانکۆی گۆتە لەشاری فرانکفۆرت دامەزرا کە ئامانجەکەی درێژە دان بوو بە لێکۆڵینەوەو، گفتوگۆو، بانگهێشت بۆ دامەزراندنی تیۆرییەکی رەخنەیی کە لە توانایدا بێ بەرامبەر ئەو تیۆرییە سۆسیۆلۆجیە تەقلیدی و باوانە بوەستێ کە تا ئەو کاتەش لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا زاڵ بوون بەسەر فیکری کۆمەلایەتی و فەلسەفیدا. لە راستیشدا ئەو کاریگەرییە راستەوخۆیەی لەوکاتەدا تیۆری رەخنەیی نایەوە، لێکترازان بوو لەناو ریزەکانی چەپی رۆشنبیری ئەورووپادا، بەتایبەتیش بەگوێرەی هەڵوێستی ئەو چەپە رۆشنبیرانە لە مارکسیزمی تەقلیدی.

### پەراوێزەکان:

**ئیبراهیم ئەلحەیدەری نووسەرو لێکۆڵەرەوەیەکی عێراقیە لە بەریتانیا نیشتەجێیە.*

**ئەم بابەتە لە رۆژنامەی (الشرق الأوسط) ژمارە (79400) رۆژی 2000/8/24 بلاوکراوەتەوە.*

### سەرچاوەکانی نووسەر:

*1-Hork heimer, M, Kritische theorie der Gesellschaft, Band Frank furt, 1970.*

*2-Jay, M., Dielektische Phontaise, Frank furt, 1981.*

3-ابراهيم الحيدري، النظرية النقدية و ديالكتيك عصر التنوير، دراسات عربية. العدد 10/9، بيروت 1984.

# ڕەخنەو تۆژینەوە





ڕۆلان بارت

- ڕەخنەو حەقیقەت
- کۆمەڵێك نامەی کافکا بۆ میلنا

# رەخنەو حەقیقەت

■ رۆلان بارت

● و. لە فارسییەوە: عەتا نەهایی

"رۆلان بارت کتێبی رەخنەو حەقیقەتی لە سالی1966و لە گەرمەی کێشەی نێوان دوو بالی رەخنەی نوێ و رەخنەی کۆن لە فەرانسە بلاوکردەوە. یەکێک لە رەخنەگرانی بالی دووەم بەناوی پیکار رەخنەیەکی لەسەر کتێبی (دەربارەی راسین -بارت- 1963) نووسیبوو، لایەنگرانی رەخنەی فەرهەنگستانی لەملاولاوە چەپلەیان بۆ لێداو ستایشیان کردو، گوتەو رەخنەی بارتیان وەك شەپۆلێکی ورتە ئاسای، بێ ناوەرۆك لێکدایەوە. بارتیش لەوەلامی ئەواندا رەخنەو حەقیقەتی نووسی.. ئەم کتێبە لە نێو بەرهەمەکانی بارتدا جێگەی تایبەتی هەیە. نووسەر لەم کتێبەدا لە بونیاد خوازیەوە بەرەو پاش بونیاد خوازی و هێرمنۆتیك دەڕواو، ئەم نووسینە خالی وەرسووڕان لە نێوان دوو دیدگا لە بەرهەمەکانیدایە. بارت رۆشتن لە بونیاد خوازیەوە بۆ پاش بونیاد خوازی بە رۆشتن لە بەرهەمەوە بۆ دەق دەزانێ و لە دیدی پاش بونیاد خوازیشەوە، ئەوەی لە دەقدا قسەی سەرەکی دەکا وتنی سوورە، شاردراوەییو، مانای بۆشە.."* کتێبەکە لە دوو بەش پێکهاتووە. بەشی یەکەم زیاتر ئاوڕ لە کێشەی نێوان ئەو دوو جۆرە رەخنە دەداتەوەو باسی رەخنەی کۆن و ئاستەنگەکانی دەکا. لە بەشی دووەمدا دەچێتە چەقی باسەکەی خۆیەوە. لە زمان و زانستی ئەدەب و، رەخنەو، مەسەلەی خوێندنەوە دەدوێ. وەرگێڕ لەگەرچی بلاوبوونەوەی هەردووبەشەکە لە دووتوێی کتێبێکدا بە پێویست دەزانێ، بەلام تا ئەو دەرفەتە دەڕەخسێ بەم شێوە بەشی دووەمی کتێبەکە دەخاتە بەردەستی خوێنەران و رەخنەگرانی ئەدەبی کوردی.



رۆلان بارت

هیچ شتێك بۆ كۆمەڵگە بنەڕەتیتر لە خانەبەندی (پۆلێنكردن) زمانەكانی نیە. گۆڕینی ئەم خانە بەندیەو، گوێزانەوەی جێگای گوتار هەڵایساندنی شۆڕشێكە. لەماوەی دوو سەدەدا خاڵی تایبەتی كلاسیسیزم لە فەڕانسە بڕوا بە هەڵاواردن (تفكیك)، دانانی زنجیرە مەرتەبەو، نەگۆڕی دەربارەی نووسراوەكان بوو. شۆڕشی ڕۆمانتیكیش سەرهەڵدانی پەرێشانی لە پۆلێنكردندا بوو. هەروەها لە سەدەیەك لەمەوبەرەوە، لەمالارمە بەملاوە، ئالوگۆڕێكی گرینگ لە پێویستیە سەرەكیەكانی ئەدەبی ئێمە لە گەڕدایە. ئەوەی دەگۆڕێ، دزی تێدەكەوێ، یەك دەگرێتەوە، دوو جۆری كاركردی نووسراوەو، جیایی كاركردی شاعیرانەو رەخنەگرانەی نووسراوەیە.[1] وێڕای ئەوەی كە نووسەران خۆیان رەخنەش دەگرن. بەرهەمەكانیشیان زۆرجار هەلوومەرجی لەدایكبوونیان (وەك پرۆست) یان ونبوونیان (وەك بلانشۆ) دەگێڕنەوە. زمانێكی یەكە لە هەموو پانتای ئەدەب و، تەنانەت پەراوێزیشی لەگەڕدایە. بەم شێوە كتێب جێگای داهێنەرەكەی ناگرێتەوە. ئیتر نە شاعیر و نە ڕۆمان نووس هیچیان نین. جگە لە نووسراوە هیچ شتێكی تر لە ئارادا نییە.

## قەیرانی پەراوێز نووسی

كەواتە دەبینین رەخنەگر لە هەوڵ و جووڵەیەكی كاملكردندا دەبێتە نووسەر. بێگومان خواستی بوون بە نووسەر، بانگەشەی بەدەست هێنانی هەلوومەرج نیە، بەڵكو مەبەستی زیندوویوونە. با ڕۆماننووس، شاعیر، وتارنووس و مێژوونووس شكۆیەكی زۆریشی بێ، نووسەر نەوەك بەم پلەو پایانە، بەڵكو تەنیا بە هۆی شێوەیەك "وشیاری لە گوتاردا" دەناسرێتەوە.

نووسەر ئەو كەسەیە كە خەم و كێشەی زمانی بێ و، لەناخ و قووڵایی زمان بڕوانێ و، وەك كەرەسەو جوانی سەیری نەكا. لەم ڕووەوە گەلێ كتێبی جۆراوجۆری رەخنەیی هاتنە مەیدانەكەوە، كە ئەگەرچی نووسەرەكانیان نووسەر نەبوون و رەخنەگر بوون، بەو حاڵەش بەرهەمی رەهای (ناب) ئەدەبیان پێشكەش كرد. ئەگەر رەخنەی نوێ خاوەنی تایبەتمەندی خۆی بێ، ئەم تایبەتمەندیە لە یەكەی شێوەو ئوسلوویەكانیدا، یان لەوەش كەمتر لە خۆڕازاندنەوەیدا، نیە. بەڵكو لە تەنیایی و كۆشەگیری هەڵوێستی رەخنەگرانەیدایە. هەڵوێستێك كە لەمەودوا دوور لە پاكانەی زانست و نەریت، ڕاستەوخۆ لە پەیوەندی لەگەڵ نووسراوەدا دەناسرێتەو نووسەرو رەخنەگر كە لە دێرزەمانەوە بەیارمەتی ئەفسانەی كۆن و سواوی "داهێنەری بلیند مەرتەبەو خزمەتكاری ژێر دەستە هەردووكیان لە شوێنی خۆیاندا بۆ ئەدەب پێویستن" لەیەكتر دابڕابوون، لە هەلومەرجێكی گرینگی یەكسان و، لەبەرامبەر بابەتێكی یەكساندا (واتە زمان) بەیەك دەگەنەوە.

وەك دەركەوت ئەم سەرپێچی كردنە جێ نەكەوتووەو لەگەڵیدا ڕێنەكەوتوون. ئەگەرچی هێشتا دەبێ لە پێناوی سەپاندنیدا هەوڵ و تەقەلا بدرێ، بەڵام ڕەنگە بەو گۆڕانكاریانە كە لە داهاتووی نزیكدا روو دەدەن، جێ پێی خۆی قایم بكا. ئیتر ئەوە هەر رەخنە نیە كە دەستی بە "تێپەڕین لە نووسراوە"[2] كردووە، -كە ڕەنگە تایبەتمەندی سەردەمی ئێمە بێ-، بەڵكو ئەم ڕەوتە هەموو گوتاری عەقڵ خوازی گرتۆتەوە. لە چوارسەدە لەمەوبەرەوە "نیكناس لۆیزلا"[3] دامەزرێنەری كۆمەڵێك كە زۆرترین خزمەتی بەتیۆری گێڕانەوە كردووە، لە كتێبی "ڕاهێنانە

ڕۆحانیەکاندا" مۆدێلی گوتارێکی هونەرمەندانەی لەسەر بناخەی هێزێکی تری جگە لە "قیاس" (*Syllogisme*) یان "تەجرید" (*Abstraction*) شی کردۆتەوەو، "ژۆرژ باتای" بە هۆشمەندییەوە تەقەلای ڕوونترکردنەوەی داوە. لەوەدوا نووسەرلنێکی وەك ساد و نیچە ناوەناوە یاساکانی گێڕانەوەی عەقڵمەندانەیان "سوتاندووە". لەوە دەچێ ئێستاش هەمان گەڕیان بە بەربڵاوییەوە لە ئارادابێ. بیرکردنەوەی عەقڵمەندانە کەڵك لە لۆژیکێکی تر وەردەگرێ و، پێ دەنێتە هەرێمی ڕووتی "ئەزموونە دەروونیەکانەوە": لە هەموو جۆرە گوتارێکدا، گوتاری چیرۆکی، شاعیرانە یان ئیستدلالی، حەقیقەتێکی تاقانە و هاویەش هەیە، کە ئەم حەقیقەتە لەمەودوا حەقیقەتی خودی گوتارە. ژان لاکان لە هەرێمی گوتاردا بەربڵاوی سەرانسەری تەسەور *Image*/دەکاتە جێنشینی تەجریدی سوننەتی چەمکەکان، وەهاکە لە تەمسیل کردنی ئیدە دانەبڕێ، خۆی هەمان حەقیقەت بێ. لەلایەکی ترەوە کلۆد لیڤی شتراوس لە کتێبی "کولاوو کاڵدا" بەتێکشکاندنی چەمکی باوی "بەرەپێدان و کامڵ بوون" (توسع و تکامل) تیۆرەی گێڕانەوەیەکی نوێ دەربارەی "ئاڵوگۆڕەکان" پێشکەش دەکا، بەم شێوە لە دەوری فۆرم– کە لە بەرهەمەکانی زانستی مرۆڤانەدا کەمتر سەرنجی پێدراوە– دەدوێ. بێگومان گوتاری ئیستدلالی (*discursive*) لە حالی گۆڕاندایەو ئەمەش نووسەرو ڕەخنەگر لە یەکتر نزیك دەخاتەوە. ئێمە پێ دەنێینە ناو قەیرانی سەرانسەری پەراوێز نووسیەوە، کە ڕەنگە بەقەدەر ئەو قەیرانە کە لەم زەمینانەدا، تایبەتمەندیی پەڕینەوە لەسەدەکانی ناوەڕاست بۆ سەردەمی ژیانەوەبوو، گرینگ بێ. ناچاری سەرهەڵدانی ئەم قەیرانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە سروشتی هێمایی زمان، یان بەشێوەیەکی تر سروشتی زمانناسی هێما، دۆزرایەوە. ئەم دۆزینەوە ئیمڕۆکە لە ژێر کاریگەری هاوکاتی دەروون شیکاری و بونیادگەریدایە.

سەردەمانێکی زۆر کۆمەڵگای بورژوازی – کلاسیك جۆرێك کەرەسە، یان ڕەگەزێکی ڕازێنەرانەوەی لە گوتاردا دەدی. بەڵام ئێستا ئێمە جۆرێك حەقیقەتی تێدا دەبینین. کەواتە هەر شتێك سەروکاری لەگەڵ زماندا بێ، سەرنجمان ڕادەکێشێ. فەلسەفە، ئەدەب، زانستی مرۆڤانە.

بێگومان ململانەیەك بۆ دیاریکردنی دووبارەی جێگاو شوێنی ڕەخنەی ئەدەبی لە ئارادایە: دەق و زمان چ پەیوەندیەکیان بەیەکترەوە هەیە؟ بۆ خوێندنەوەی دەقێکی هێمایی (نمادین) چ یاساگەلێك پەیڕەو دەکرێ؟ ئایا ئیمکانی بوونی زانستی هێماکانی نووسین هەیە؟ ئایا دەکرێ زمانی ڕەخنەش زمانێکی هێمایی بێ؟

زمانی چەند لایەن (*La langage Plurielle*)

ئەلەن ژیرار کۆمەڵناس و موریس بلانشۆی[4] نووسەر دەربارەی "یادداشتی تایبەتی" وەك ژانرێکی ئەدەبی، دوو بۆچوونی تەواو لەیەك جیاوازیان دەربڕیوە. بە بۆچوونی ژیرار "دەفتەری بیرەوەریەکان" شەرحی هێندێك کێشەی کۆمەڵایەتی، بنەماڵەیی و، پیشەییە. بەڵام بە بۆچوونی بلانشۆ شێوەیەکی ماتەمبارە بۆ دواخستنی قەدەری تەنیایی نووسراوە. کەواتە دەفتەری بیرەوەریەکان لانیکەم دوو مانای هەیە کە هەرکامەیان بەهۆی پەیوەندی لۆژیکی خۆیانەوە جێگەی ئیعتبارن. بەم شێوەیە

رووبەڕووی کارێکی ئاسایی دەبینەوە کە دەشێ لەمێژووی رەخنەداو، لە نێوان هەموو جۆرە خوێندنەوەی بەرهەمێکدا، نموونەیان زۆر بێ: ئەمانە لانی کەم ئەو بەڵگانەن کە مانا جۆراوجۆرەکانی بەرهەمێك دەسەلمێنن. لەراستیدا مرۆڤ لە هەر سەردەمێکدا پێی وابووە لەمانای سەرەکی بەرهەم گەیشتووە، بەلام ئەگەر کەمێك بازنەی مێژوو بکەینەوە بۆمان دەردەکەوێ چۆن مانایەکی تاقانە دەبێتە ماناگەلی جۆراوجۆرو، دەقێکی داخراو دەبێتە دەقی کراوە.[5] ئەوسا پێناسەی دەقیش دەگۆڕێ: دەق لە واقیعێکی مێژووییەوە دەبێتە واقیعێکی مرۆڤ ناسی، چونکە هیچ مێژوویەك ناتوانێ کۆنی بکا. کەواتە جۆراوجۆری (جیاوازی) ماناکان هیچ پەیوەندیەکی بە دیدگای رێژەیی (نسبی نگر) بۆ داب و نەرێتی مرۆڤانەو، حەزی کۆمەلگا بۆ تێگەیشتنی هەڵە، نیە. بەڵکو لە ئامادەبوونی دەق بۆ کرانەوە سەرچاوە دەگرێ. بەرهەم، نەوەك لەبەر گومانی خوێنەرەکانی، بەڵکو بەهۆی بونیادی خۆیەوە لە یەك کاتدا چەندین مانا دەبەخشێ. کەواتە بەرهەم هێماییە: هێماش وێنەیەکی خەیاڵی *Image* نیە، بەڵکو چەند پۆیی ماناکانە.[6]

هێماکان نەگۆڕن. تەنیا روانینی کۆمەلگا بۆ هێماکان و ئەو مافە کە بەولنی رەوا دەبینێ، لە گۆڕاندایە. لەسەدەکانی ناوەڕاست، وەکو لە تیۆرەی چوارماناً[7] دەردەکەوێ، دان بە ئازادی هێماکاندا نراوە. بەلام لەسەردەمی کلاسیك بەهیچ شێوەیەك لە گەڵیاندا رێ نەکەوتوون: کۆمەلگەی کلاسیك چاوی لە ئاست هێماکان قووچاندووە، یان وەك نەوەکانی ئیمڕۆی خۆی سانسۆری کردوون: مێژووی ئەم سانسۆرکردنەش وەك مێژووی ئازادی هێماکان، مێژوویەکی

شەڕەنگێزانە (خشونت بار)یەو، مانای تایبەت بەخۆی وەردەگرێ: "بەبێ سزادان هێماکان سانسۆر ناکەن". لە هەر حالّدا ئەمە کردەوەی نەرێتەکانە، نەوەك بونیادەکان. کۆمەلگاکان بە هەر شێوەیەك بیربکەنەوە یان حوکم بدەن، بەرهەم لێیان تێدەپەڕێ و پێشیان دەکەوێتەوە. هەروەك فۆرم یان قالّبێك کە مانا مومکین و مێژووییەکان بەنۆرە پڕی بکەنەوە. ئەمری بەرهەم لەوەدا نیە کە تاقەمانایەك بە مرۆڤە جیاوازەکان رابگەیەنێ، بەڵکو لەوەدایە کە کۆمەڵێ مانای جۆراوجۆر پێشکەش بە تاقە مرۆڤێك بکاو، هەمیشە و لە هەموو سەردەمێکدا بەهەمان زمانی (رەمزی) و هێمایی باخێری: بەرهەم پێشنیار دەکا، مرۆڤ لە هەڵبژاردنا ئازادە.

هەر خوێنەرێك مل بە سانسۆری وشەکان نەدا، ئەوە دەزانێ: ئایا هەست بەوە ناکا لە جۆرێك جیهانی ئەوپەڕی (ماوراء *au-dela*) دەق نزیك بووەتەوە؟ وەها کە زمانی یەکەمی بەرهەم لە ناخی ئەودا وشەگەلی تری سازکردبێ‌و، فێری قسەکردن بە زمانی دووهەمی بکا؟ ئەمە هەمان شتە کە پێی دەگوترێ خەون (رۆیا) و بەگوتەی باشلار لە جادەی تایبەت بەخۆیەوە تێدەپەڕێ. زمانی دووهەمی بەرهەم ئەم جادانە لەبەرامبەر وشەدا دەکاتەوە.

ئەدەب پشکنینی ناوە. (*exploration du nom*) پرۆست لە چەند دەنگدا جیهانێکی تەواوی هەڵێنجاوە: "گرمانت"[8]. لە ئەنجامیشدا نووسەر هەمیشە لەو بڕوایەدایە کە نیشانەکان دڵخواز (*arbitraire*) نین‌و، ناوەکان سامانی سروشتیی شتەکانن.نووسەران لایەنگری کراتیلن[9] نەوەك هێرمۆژن. کاتێك دەڵێن ئێمە دەبێ بە ج شێوەیەك نووسراوە، بەهەمان شێوە

بیخوێنینەوە، واتە لەم کاتەدایە ئێمە ڕێز لە ئەدەب دەگرین. (ڕێزگرتن بەمانای "نوالندنی جەوهەرەکەی") چونکە ئەگەر وشەکان تەنیا مانایەکیان -مانا قامووسیەکە- نەبوایەو، ئەگەر زمانی دووهەم "حەتمیەتی" زمانی نەشێواندایەو، ڕەدی نەکردایەوە، ئیتر ئەدەبێك لە ئارادا نەدەبوو. کەواتە یاساکانی خوێندنەوە نەهەمان یاسای نووسین بەڵکو ئەم و مژاوین (مبهمن). هەروەها ئەو یاسایانە لە هەرێمی زمان ناسیدان نەوەك وشەناسی.

مەبەستی زانستی "فقه اللغه" دۆزینەوەی مانای ئەدەبی گوتارە، بەلام کاری بەمانا دووهەمەکان نیە. بەپێچەوانەوە زمان ناسی بێ ئەوەی بیەوێ لە ئەم و مژی زمان (ابهام) کەم بکاتەوە، هەوڵ دەدا تێیان بگاو، ئەگەر بۆی بکرێ سەقامگیریان بکا. زمان ناس لەو شتەی وا شاعیران لە دێرزەمانەوە پێی دەڵێن "ابهام" یان "خەیاڵ" نزیك دەبێتەوەو، لەگەڵ هەڵبەزو دابەزی مانادا بەرخوردێکی زانستیانە دەکا. یاکوبسن پێ لەسەر ئەم و مژە سەرەکیەکانی پەیامی شاعیرانە (ئەدەبی) دادەگرێ. ئەمە وادەگەیەنێ کە ئەم ئەم و مژانە لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ئیستاتیکی لەگەڵ ئازادی تەئویل، یان سانسۆری ئەخلاقی مەترسیەکانی، سەرچاوەی نەگرتووە. بەڵکو دەکرێ بەشێوەی ڕەمز (code) کۆبکرێتەوە:

زمانی هێمایی بەرهەمە ئەدەبیەکان لە ڕانگەی بونیادیەوە زمانێکی چەند لایەنەو، ڕەمزەکانی وەك هەموو گوتارێکیتر (بەرهەمێکی تر) سازکراوە. ئەم زمانە چەندلایەن و بۆیە کە بەرهەمی ئەو ڕەمزو هێمایانەیە، واتا گەلێ جیاوازیشیان هەیە. هەر ئەم باروبۆخە لە زمانیشدا، ("Langue"زمانی موتڵەق یان سیستەمی زمان)[10] کە ناحەتمی ترە، هەیە. بەمحاڵەش ئەم و مژەکانی زمانی ئاخاوتن لەچاو ئەم و مژەکانی زمانی ئەدەبی بەهیچ دەژمێردرێن. ئەم و مژەکانی زمانی ئاخاوتن بەیارمەتی ئەو هەلومەرجە کە تیایدا دروست بوون، لە کەم بوونەوەدان. (لەزمانی ئاخاوتندا) جگە لە رستە ئەم و مژاوییەکان، شتێکیتر، بۆ نموونە حاڵەت، یان جووڵە، یان بیرەوەریەك دەتوانێ یارمەتی تێگەیشتنمان بدا. ئەگەر بمانەوێ بەکردەوە هەوڵ بۆ لێکدانەوەی ئەو ئاگاداریە بدەین کە ڕستەیەك دەیەوێ پێمان ڕابگەیەنێ، لەم حاڵەدا ئیحتمالی بەهێزتری مانا خۆی ئاشکرا دەکا. بەلام بۆ بەرهەمی ئەدەبی، ئێمە خاوەنی هیچکام لەم ئیمکاناتە نین. بەرهەم بۆ ئێمە ئیحتمالی بەهێزتری نیەو، ڕەنگە ئەمەش باشترین تایبەتمەندی بەرهەم بێ: بەرهەم بەیارمەتی هیچ هەلومەرجێك سنووری ئاشکراو، دیارو، سەقامگرتووی نیە. هیچ ژیانێکی ڕاستەقینە لە بەرهەمدا، بۆ ئەوەی مانا حەتمیەکەیمان پێ بڵێ، ئامادەبوونی نیە. بەرهەمی ئەدەبی خاوەنی ڕەگەزێکی گێڕانەوەیە (*Citationel*). لەدەروونیدا ئەم و مژ بەتەواوی ڕەهایە (ناب): هەر چەندە زۆربڵەبیشی تێدا کرابێ، ڕەگەزێکی ئیجازی "پیتی"[11] ئاسای هەیە. گوتنەکان (دیالۆگ؟) لەگەڵ ڕەمزی سەرەتادا هاوئاهەنگن. (پیتی وێنەی نەدەکرد)و، لە هەمان حاڵیشدا بە هۆی ئەوەوە کە دوور لە هەموو جۆرە هەلومەرجێك گێردراونەتەوە -ئەڵبەت جگە لە خودی هەلومەرجی ئەم و مژ -ئامادەی دەربڕینی ژمارەیەکی زۆر مانان.

بەرهەم بەردەوام خاوەنی باروبۆخێکی پێشگۆیانەیە. بێگومان دەتوانم بەزیادکردنی وەزعی خۆم بەکردەی خوێندنەوەی بەرهەمێك،

له تەمو مژیەکەی کەم بکەمەوە.- ئەمە زۆرجار روو دەدا- بەڵام ئەم وەزعە بگۆڕە بەرهەمەکە تۆمار دەکا: لەو کاتەوە کە من خۆم بە رەمزی هێمایی خاوەن بەرهەمەکە دەسپێرم، واتە لەوکاتەوە کە ئامادە دەبم لە فەزای هێماکاندا بەرهەمەکە بخوێنمەوە، بەرهەمەکەش ناتوانێ مل بەو مانایە نەدا کە بۆی دادەنێم. ئەڵبەت ناشتوانێ کتوومت وەری بگرێ. چونکە رەمزی دووهەمینی بەرهەم سنووردارەو ئازادیەکی وا بەدەستەوە نادا. رەمزی دووهەمینی بەرهەم نەوەك هێڵەکانی مانا، بەڵکو بارستایی (حجم) مانا دەکێشێتەوەو گەڵاڵەی تەمومژەکان دەچنێ.

بەرهەمی ئەدەبی کە لە هەموو بارودۆخێك هەڵبڕاوە، دەبێتە بابەتی لێکدانەوەو، وەك کێشەیەك لە هەرێمی زماندا، رووبەڕووی نووسەر یان خوێنەر دەبێتەوە. کێشەیەك کە دەبێ بۆ ئەوەی لە سنوورەکانی نزیك بینەوە، بنەماکانی لێکبدەینەوە. بەم شێوە بەرهەمی ئەدەبی دەبێتە بابەتی توێژینەوەیەکی بەردەوام و بەریڵاوی وشەکان.[12] هەمیشە ئەو حەزە لە ئارادایە کە هێما جگە لە سامانی تایبەتی خەیاڵ، هیچی تر نەبێ. هێما کارکردێکی رەخنەگرانەی هەیەو، بابەتی رەخنەکەشی خودی زمانە. دەکرێ "رەخنەگریی زمان" بە "رەخنەگریی عەقڵ" کە فەیلەسووفەکان کردوویانە، زیاد بکرێو، ئەمەش هەمان ئەدەبە.

بەکورتی ئەگەر بەرهەمی ئەدەبی بەهۆی بونیادی خۆیەوە چەند مانا وەردەگرێ، کەواتە دەبێ دوو گوتاری جیاواز بگرێتەخۆ: لەلایەکەوە دەشێ لەبەرهەمێکی ئەدەبیدا هەموو مانا شاردراوەکان، یان مانایەکی بۆش کە هەموو ئەو مانایانە لەخۆ بگرێ، بدۆزرێتەوە. -ئەم دووحاڵەتە هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ یەکتر نیە-. لەلایەکی ترەوە دەکرێ تەنیا رووبەڕووی یەکێك لەو مانایانە بینەوە. نابێ لە هیچ حاڵەتێکدا بەهەڵە ئەم دوو قسە لەبری یەکتر وەربگرن. چونکە هیچ بابەتێکی هاوبەش و لایەنێکی یەکسانیان نیە. دەکرێ ئەم گوتارە گشتیە کە بابەتەکەی نەوەك فڵانە مانای تایبەت، بەڵکو خودی چەند جۆری ماناکانی بەرهەمە، بەزانستی ئەدەب بزانرێ -یان ناوی زانستی ئەدەبی لێ بنرێ- هەروەها ئەو گوتارەی تر کە وێڕای مەترسی زۆر، دەیەوێ مانایەکی تایبەت بەسەر بەرهەمدا بسەپێنێ، ناوی "رەخنەی ئەدەب"ی لێ بنرێ. بەڵام ئەم جیاوازیە بەس نیە. هەروەها کە ئەدرکاندنی مانایەکی رێ تێ چوو (احتمالی) لەگەڵ نووسینەوەو دەربڕینی ئەو مانایە جیاوازە، بەهەمان پێوانەش خوێندنەوەی بەرهەم لە رەخنە جیایە: خوێندنەوەی بەرهەم بەبێ ناوبژیە. بەڵام رەخنەی بەرهەم بەهۆی زمانێکی ناوبژی کارەوە، کە هەمان نووسینی رەخنەیە، بە ئەنجام دەگا. ئێمە بۆ ئەوەی تاجی زمان بخەینە سەر سەری بەرهەم دەبێ لە سێ گوتار کەڵك وەربگرین: زانست، رەخنەو، خوێندنەوە.

## زانستی ئەدەب

ئێمە مێژووی ئەدەبمان هەیە بەڵام زانستی ئەدەبمان نیە.بێگومان لەبەر ئەوە کە هێشتا نەمانتوانیوە سروشتی بابەتی ئەدەبی کە بابەتێکی نووسراوەیە بەچاکی بناسین. لەو کاتەوە دان بەوەدا دەنێین کە بەرهەمی ئەدەبی لە نووسراوە دروست بووە (هەروەها ئەنجامەکانیشی وەردەگرین) دورنك زانستی ئەدەب ئیمکانی بوونی دەبێ. بابەتی ئەم زانستە (ئەگەر رۆژێ لە رۆژان وەها زانستێك بێتە ئارا) نابێ سەپاندنی مانایەك بێ بەسەر دەقدا. وەها

که مافی رەتکردنەوەی ماناکانی تر بە خۆی رەوا ببینێ. چونکە لەم حاڵەتەدا خودی زانستەکە دەکەوێتە مەترسیەوە، (هەروا کە تا ئێستاش کەوتووە)، ئەم زانستە نابێ وەك زانستێکی مێژوویی ئێجگار وشك کار لەسەر تێمەکان بکا. ئەمە زانستێکە دەربارەی چۆنیەتی تێمەکان، واتە فۆرمەکان: بابەتی دڵخوازی ئەم زانستە، شێوە جۆراوجۆرەکانی مانا بەرهەم هاتووەکان‌و، ئەو مانایانەیە کە بەرهەم دەتوانێ (یان دەشێ) بەرهەمیان بهێنێ. ئەم زانستە تەئویلی حەتمی هێماکان ناکا، بەڵکو تەنها تەئویلە جۆراوجۆرەکان دەهێنێتە ئاراوە. بە کورتی، هەوڵی دۆزینەوەی مانا پڕەکانی بەرهەم نادا، بە پێچەوانەوە لە مانایەکی بۆش دەگەڕێ کە هەموو ئەو مانایانەی لە خۆ گرتبێ.

بێگومان مۆدێلی ئەم زانستە زمان ناسانە دەبێ. زمان ناس کە رووبەڕووی نامومکین بوونی دەسەلات بەسەر هەموو رستەکانی زمانێکدا بۆتەوە، دەزانێ پێویستە "مۆدێلێکی تەشریحی سەرەتایی" (modele hypothetque de description) دروست بکا. تا بەیارمەتی ئەو مۆدێلە چۆنیەتی سەرهەڵدانی رستەگەلی بێ ژماری زمانێك شی بکاتەوە.[13] زاراوەی پێویست بۆ ئەمە هەرچی بێ، نابێتە هۆی ئەوە کە واز لە پیادەکردنی ئەم مۆدێلە لەسەر بەرهەمە ئەدەبیەکان بهێنین. ئەم بەرهەمانە خۆیان لەرستەگەلێکی مەزن دەچن کە لە زمانی سەرانسەری هێماکان دابڕاون‌و لەنێوان زۆر گ[illegible]کاری ئاساوەرگرەوە تێپەڕیون‌و، لەوێشدا بە ش[illegible]کی گشتی‌تر، بەنێو جۆرێك لۆژیکی "دەلالەت گەر"دا رەت بوون. بەگوتەیەکی تر زمان ناسی دەتوانێ ئەم مۆدێلە گشتیە کە بنەمای هەموو زانستێکە -چونکە ئەرکی زانست هەمیشە رێك و پێك کردنی هەندێ یاسا بۆ شیکردنەوەی هەندێ بەرئەنجام بووە- بە ئەدەب ببەخشێ.کەواتە بابەتی زانستی ئەدەب ئەوە نیە کە بۆچی فڵانە مانا وەرگیراوە، یان وەرنەگیراوە. (ئەمە ئەرکی مێژوو زانە) بەڵکو ئەوەیە کە بۆچی ئەم مانایانە، نەوەك لەسەر ئەساسی یاساکانی زانستی وشەناسی لە نووسراوەدا، بەڵکو بەپێی کارکردی یاساکانی زمان شناسی هێما وەردەگیرێن.

لێرەدا دەبینین مەبەستی زمان ناسی نوێ، کە لێکدانەوەی یاسامەندی رستەکانە نەوەك دەلالەتەکانیان، بۆ ناوچەی زانستی گوتار گوێزراوەتەوە. بەم شێوە هەوڵێکە بۆ لێکدانەوەی "وەرگرتنی بوون" (acceptabilite)ی بەرهەم، نەوەك ماناکانی. کۆی مانا مومکینەکان نەوەك رێسایەکی وەستاو، بەڵکو وەك هێڵەکانی باروداخێکی بەجێهێنەری مەزن کە لە نووسەرەوە تا کۆمەڵگە دەکشێ، پۆلێن دەکەن. رەنگە لە دەروونی مرۆڤدا لە پاڵ "بەهرەی زمان"، ئەو چەمکە کە هۆمبۆڵت و چامسکی بە سەلماوی دەزانن، "بەهرەیەکی ئەدەبی"ش، واتە هێزێکی گوتاریش وجوودی ببێ کە هیچ پێوەندیەکی بە "نبووغ"ەوە نیە. چونکە نەوەك بەیارمەتی سرووش (ئیلهام) و خواستی شەخسی، بەڵکو بە یاساگەلێکی لەو پەڕ نووسەرەوە دروست دەبن. وێنەکان، فیکرەکان و شیعرەکان شتێکی ئەفسانەیی نین کە موس (خوای هونەر لە یۆنانی کۆندا) خستبێتیە گیانی نووسەرەوە. بەڵکو لۆژیکی گەورەی هێماکانن. ئەو فۆرمە بۆشانە کە ئیمکانی گوتن و کردن دەبەخشن.

بێگومان ئەم زانستە بە زەرەری نووسەر، ئەو کەسە کە ئێمە خۆشمان دەوێ یان پێمان وایە

خۆشمان دەوێ، تەواو دەبێ. بەڵام ئاخر زانست چۆن چۆنی دەتوانێ دەربارەی یەك نووسەر بدوێ؟ زانستی ئەدەب هەر ئەوەندەی پێدەکرێ تیشك بخاتە سەر بەرهەمی ئەدەبی. جا ئەگەر بەرهەمەکە بەهەڵە مۆری هەر ئەفسانە و ئوستوورەیەکی بەخۆیەوە لکاندبێ فەرق ناکا. ئێمە هەمیشە یان لانیکەم ئیمڕۆ، پێمان وایە کە نووسەر دەتوانێ لە مانای بەرهەمەکەی خۆی بگا، وەك مانایەکی مەجاز دڵنی پێدا بنێ. پشکنینی نارەوای ژیان، مەبەست و ئامانجی نووسەری مردوو، لەلایەن رەخنەگرەوە بۆ مەبەستی دەرکێشانی دەلالەتی بەرهەم لە خودی نووسەرەکەیەوە، لێرەوە سەرچاوە دەگرێ. دەیانەوێ بەهەر نرخێك بووە زمانی مردووەکە، یان جێنشینەکانی واتە سەردەم، ژانری ئەدەبی، دەقەکان و تێکڕا هاوچەرخەکانی نووسەر و میراتگرانی مافی نووسەری مردوو بەسەر بەرهەمەکەیدا، یەکالا بکەنەوە. لەوەش خراپتر. دەیانەوێ چاوەڕوانی مردنی نووسەر بین تا دوامەرگی بتوانین بەرخوردێکی بابەتیانەی (ئیبژکتیو) لەگەڵ بکەین. ئەمە لە کاری دێو دەچێ. راست لەو کاتەدا کە بەرهەمەکە دەبێتە شتێکی ئوستوورەیی گەرەکیانە وەك ئەمرێکی واقیع هەڵیسەنگێنن.

بەڵام بەراستی مەرگ بایەخێکی تری هەیە. مەرگ ئیمزاو ناوی نووسەر لەسەر بەرهەمەکەی دەسڕێتەوەو ئوستوورەی لێ سازدەکا. حەقیقەتی گێڕانەوەی کورت تۆزی حەقیقەتی هێماکانیش ناتەقێنێ. بیری گشتی بە جوانی هەست بەم خاڵە دەکا: ناچین سەیری "بەرهەمێکی راسین" بکەین، بەڵکو دەچین سەیری "بەرهەمێکی راسینی"بکەین. هەروەك "فیلمێکی کابۆیی"، دەڵێی بەپێی ئەو هەلوومەرجە تێی کەوتووین، لە ساتەوەختێکی حەفتەدا بۆ چێژ وەرگرتن لە ئوستوورەیەکی گەورە ئەم کارە دەکەین. ئێمە ئەوەك بۆ بینینی فێدر، بەڵکو بۆ بینینی "بێرما لە فێدر" دەچین. راست وەك ئەوە بمانەوێ لە ئۆدیپ و ئانتیگۆنەدا قسەکانی سۆفۆکل، فرۆید، هێڵدرلین و کێرکەگارد بخوێنینەوە. ئێمە لە دەروونی حەقیقەتداین، چونکە پێمان وانیە مەرگ زیندووەکانی لێ سەندووینەتەوە. ئێمە بەرهەم لە سنوورەکانی خواست و نیەتی نووسەر رزگار دەکەین و هەڵچوون و داچوونی (نوسان) ئوستوورەیی ماناکان دەدۆزینەوە. مەرگ بە سڕینەوەی ناوی نووسەر حەقیقەتی بەرهەم [illegible] تەموومژاویە بنیاد دەنێ. بێگومان ناتوانین لە[illegible] بەرهەمی "شارستانی" بەواتای مەردووم ئامانەی وشەکە وەك ئوستوورە بەرخورد بکەین. بەڵام جیاوازی، بۆ جەوهەری پەیامەکە دەگەڕێتەوە نەوەك بۆ ناوی نووسەرەکە: بەرهەمەکانی ئێمە نووسراون و ئەمە ئەوان رووبەڕووی جۆرێك ئیجباری مانا دەکاتەوە، کە ئوستووره نەنووسرلوەکان سەروکاریان لەگەڵدا نیە. کەواتە ئێمە رووبەڕووی ئوستوورە شناسی نووسراوە دەبینەوە. بابەتی ئەم ئوستوورە شناسیە ئەو بەرهەمە تایبەتانە نیە کە لە رەوتێکی دیاریکراودا لە کەسێکەوە (نووسەر) سەرچاوە دەگرن، بەڵکو ئەو بەرهەمانەیە کە لە نووسراوەیەکی مەزنی ئوستوورەییەوە تێپەڕیون و، مرۆڤ لەولندا دەلالەتەکان، واتە حەز و خواستەکانی خۆی ئاشکرا دەکا.

کەواتە دەبێ بابەتەکانی زانستی ئەدەب دووبارە دابەش بکەینەوە. نووسەرو بەرهەم هیچ نین جگە لە سەرەتای لێکدانەوەیەك کە ئاسۆکەی زمانێکە: ئاکرێ زانستێکی شکسپیر، دانتە یان

راسین ببێ، تەنها دەکرێ "زانستێکی گوتار" ببێ. ئەم زانستە بەپێی نیشانەگەلێك کە پەیوەندی لەگەڵیاندا هەیە، خاوەنی دوو هەڵبەندی گەورەیە. هەڵبەندی یەکەم نیشانەکانی "بن دەست" (*inferieur*) لە رستەدا وەك مەجازە ئەدیبیەکان، دیاردەکانی دەلالەتی ضمنی، "نەبوونی یاساکانی مانا ناس" (*anomalie semantique*) و... بەکورتی، هەموو رەگەزەکانی زمانی ئەدەبی دەگرێتەوە. هەڵبەندی دووهەم نیشانەکانی "ژوور دەستی" (*superieur*) رستەو ئەو بەشانەی گوتار کە دەکرێ بونیادێکی نووسراوە، پەیامی شاعیرانەو نووسینی (استدلالی) و... لێ هەڵێنجین، دەگرێتەوە. یەکە گەورەو بچووکەکانی گوتار لەگەڵ یەکتر پەیوەندیەکی "تەواوکەر"یان هەیە. (وەك فۆنیمەکان لە پەیوەندی لەگەڵ وشەکانداو، وشەکانیش لە پەیوەندی لەگەڵ رستەکاندا) بەڵام لە رووپەرێکی وەسفی سەربەخۆدا شکل وەردەگرن. لەم دیدگایەوە دەکرێ لێکدانەوەی دڵنیا لەسەر دەقی ئەدەبی بنووسرێ. بەڵام بێگومان ئەو لێکدانەوانەش شێلەو رەگەزێکی گرینگی بەرهەمەکە لە خۆ ناگرن. ئەو شێلەو رەگەزە پەیوەندی بەو شتەوە هەیە کە ئێمە تەنانەت ئەگەر حەزمان لە حەقیقەتی نوستوورەکانیش نەبێ، بە ئەساسی بەرهەمەکەی دەزانین. وەك: (نبووغی تاکەکەسی، هونەرو، مرۆڤایەتی) ئەبژکتیوتیەیەك کە ئەم زانستە نوێ بونیادە بەرهەمی دێنێ، ئیتر سەروکاری لەگەڵ خو ی بەرهەمەکە نیە (کە لە مێژووی ئەدەب، یان رشەناسیەوە سەرچاوەی گرتووە) بەڵکو دەربەستی مەعقولیەتی بەرهەمەکەیە. هەروەك چۆن فۆنۆلۆژی بەبێ ئەوەی حوکمە تەجرەبیەکانی فونێتیك رەتبکاتەوە لە زەمینەی واتای فۆنەکاندا عەینیەتێکی نوێی (نەوەك هەر کەیفیەتی روواڵەتی و فیزیکی) بونیاد ناوە، هەر بەو شێوەش ئەبژکتیوتیەی هێما جیا لە ئەبژکتیوتیەی پێویست بۆ سەقامگیرکردنی دەق، لە ئارادایە. ئەبژە پێویستیە جەوهەریەکان ئامادە دەکا نەوەك یاساکانی دەلالەت. "رێزمانی" بەرهەم هەمان رێزمانی ئایدیۆمی دەقی بەرهەمەکە نیە. ئەبژکتیوتیەی ئەو زانستە نوێیە وابەستە بەم رێزمانە دووهەمەیە. ئەو بابەتە کە زانستی ئەدەب حەزی لێیەتی بوونی بەرهەم نیە، بەڵکو تێگەیشتن و هەروەها خۆ بەدەستەوە دڵنیەتی بۆ تێگەیشتن، کە سەرەتای "ئەبژکتیوتیە"ی زانستی ئەدەبە.

کەواتە دەبێ واز لەو گومانە بێنین کە زانستی ئەدەب دەتوانێ ئەو مانایە کە بشێ بەسەر بەرهەمدا بیسەپێنین بدۆزێتەوەو، نیشانمان بدا: زانستی ئەدەب نە مانایەك دەدۆزێتەوەو، نە مانایەك دەهێنێتە ئاراوە. بەڵام باسی ئەوە دەکا کە ماناکان بەپێی کامە لۆژیك داهاتوون وەها کە لۆژیکی هێمایی مرۆڤەکان وەریان بگرێ. راست بەو شێوە کە رستەکانی زمانی فەرانسە بە "ئیدراکی زمان ناسی" خەڵکی فەرانسە وەردەگیرێ. بێگومان بۆ ئەوە بتوانین سەرو سامان بەزمانی گوتار بدەین، واتە زانستێکی راستەقینەی ئەدەب بە پێی سروشتی زمانی بابەتەکە دابهێنین، رێگەیەکی دوورو درێژمان لەبەرە. چونکە ئەگەرچی زمان ناسی دەتوانێ یارمەتیمان بدا، بەڵام ناتوانێ خۆی بە تەنها وەڵامی ئەو پرسیارانە کە ئەم بابەتە نوێیە دەیهێنێتە ئاراوە -واتە بەشەکانی گوتارو مانا دوو پۆو دوو لایەنەکان- بداتەوە. بەتایبەت بۆ ئەم مەبەستە دەبێ یارمەتی لە مێژوو وەربگرین تا پێشینەو رەمزە دووهەمەکانمان (وەك رەمزی

تیۆرەی گێڕانەوە) پێ بڵێ و، هەروەها دەستەو دامێنی مرۆڤ ناسی بێن تا لۆژیکی گشتی داڵەکانمان لە ڕێگەی هەڵسەنگاندن و هاو پەیوەندیە بەردەوامەکانەوە بۆ شی بکاتەوە.

**ڕەخنە**

ڕەخنە زانست نیە. ڕەخنە سەروکاری لەگەڵ ماناکاندایەو، زانست ماناکان بەرهەم دەهێنێ. بە بۆچوونی خاوەن رایان جێگەی ڕەخنە لە نێوان زانست و خوێندنەوەدایە. ڕەخنە زمانێك دەخاتە بەردەستی ئەو گوتارە ڕەهایە کە خوێندنەوە بە ئەنجام دەگەیەنێ، گوتارێك (لە نێوان گوتارەکانی تردا) بەو زمانە نوستووەبیە کە بەرهەمەکەی سازکردووە دەبەخشێ.

پەیوەندی ڕەخنە لەگەڵ بەرهەم هەمان پەیوەندی یەك مانا و یەك فۆرمە. ڕەخنەگر ناتوانێ بانگەشەی وەرگێڕان، یان ڕوونکردنەوەی بەرهەمەکە بدا. چونکە هیچ شتێك ڕوونتر و ئاشکراتر لە خودی بەرهەمەکە نیە. ئەوەی ڕەخنەگر دەتوانێ بیکا ئەوەیە کە بەهۆی جیاکردنەوەی مانا لە فۆرم، واتە لە خودی بەرهەمەکە جۆرێك لە مانا دابهێنێ. ئەرکی ڕەخنەگر لە کاتی خوێندنەوەی "کچی مینو و پازیفائە"دا، ئەوە نیە کە بیسەلمێنێ مەبەست لەم گوتە "فیدر"ە. (وشەناسەکان بەم ئەرکە هەڵدەستن). بەڵکو کاری ڕەخنەگر دەستنیشان کردنی کۆمەڵێك مانایە، بەو شێوە کە لەسەر بنەمای هەندێك دلخوازیە لۆژیکیەکان- کە بەمزووانە ئاوریان لێدەدەینەوە- تێمی (بن مایە) تاریکی و ڕۆشنی بەرهەمەکە لە خۆ بگرێ. ڕەخنەگر ماناکان دوولایەنە دەکا، لەژێر زمانی یەکەمی بەرهەمدا زمانی دووهەم دەخاتە جووڵە. واتە پەیوەندی لۆژیکی لە نێوان نیشانەکاندا سازدەکا. بەگشتی، جۆرێك پەرێشانی شکڵ لە ئارادایە، کە لەلایەکەوە دەبێتە هۆی ئەوە بەرهەم هەرگیز ڕەنگدانەوەیەکی یەك لایەنەی نەبێ. (بەرهەم بابەتێکی بەرچاوی وەك سێو یان سندووق نیە). لەلایەکی تریشەوە پەرێشانی لەشکڵدا خۆی شکڵ گۆڕیەکی چاودێری کراوەو ملکەچی سنوورەکانی بینینە. ڕەخنە بیر لە هەر شتێك بکاتەوە دەبێ بە تەواوی بیگۆڕێ و ئاشکرایە لە چوارچێوەی هەندێ یاسای تایبەتیدا بەم ئەرکە هەڵدەستێ. ئێستا با دەربارەی سێ ئیجباری ڕەخنە بدوێین.

ڕەخنەگر ناتوانێ "هەموو شتێك" بڵێ. ئەوەی بەری پێدەگرێ ترسی ئەخلاقی لە "وڕێنەکردن" نیە. پێشەکی چونکە ئەو ناڕەوای جیاکردنەوەی عەقڵ و شێتی بەخەڵکی تر، بەو سەدە سپاردووە کە سنووری ئەو دوو چەمکەی لەیەك جیاکردۆتەوە.[14] پاشان لەبەر ئەوەی کە لانیکەم لە سەردەمی لۆتر- ئامونەوە (*Lautreamont*) مافی "وڕێنەکردنی" پێدراوەو، ڕەخنە بۆی هەیە لەسەر ئەساسی هۆکارە شاعیرانەکان کە یەکەمی رایدەگەیەنێ بچێتە ئەو مەڵبەندەوە. دوا دەلیلیش ئەوە کە وڕێنەکانی ئیمرۆ زۆرجار حەقیقەتەکانی سبحەینێن: ئایا تێن لەگەڵ بوالۆدا[15] وڕێنەی نەکردووە؟ یان ژیدژ بلێن لەگەڵ برۆنتیر؟[16] نا، ئەگەر ڕەخنەگر قەرارە شتێك بڵێ (نەوەك هەموو شتێك) ئەوە دەگەیەنێ کە کارکردنێکی دەلالەت گەر بە گوتار (هەم گوتاری نووسەرو هەم گوتاری خۆی) دەبەخشێ، لە ئەنجامدا ئەو پەرێشانیە شکڵیە کە بە بەرهەمی دەبەخشێ بەهۆی ئیجبارە ڕواڵەتیەکانی ماناوەیە: لە هەر حاڵدا مانا ناخوڵقێندرێ (ئەگەر بەگومانێ تاقی بکەنەوە). ڕەخنەگر نابێ بچێتە هەرێمی مانای

بەرهەمەکەوە. بەڵکو دەبێ بچێتە هەرێمی مانای ئەوشتەوە کە خۆی دەربارەی بەرهەمەکە دەیڵێ.

ئیجباری یەکەم ئەوەیە کە دان بەوەدا بنێین هەموو شتێك لە بەرهەمدا دەلالەتگەرە: ئەگەر هەموو رستەکان لە چوار چێوەی رێزمانێکدا ئەگونجێن، رێزمانەکە تووشی گرفت دەبێ. ئەگەر هەموو گوتارەکان نەتوانن لە سیستەمێکی مانادا جێگەی شیاوی خۆیان بدۆزنەوە، ئەو سیستەمە ناتەواوە. ئەوەندە بەسە کە شتێکی بچووك زیادی بێ، تاوەسف بشێوێ. ئەم یاسا کۆنە کە زمان ناسەکان دەیناسن لەگەڵ ئەو جۆرە کۆنترۆڵە ئامارییە کە دەیانەوێ وەك کۆتێك لەگەردنی رەخنەگری بنێن جیاوازە. شێوە روانینێکی قیرسیچمانە کە دیسانەوە لاسایی مودێلێکی زانستی سروشتی (علوم طبیعی) دەکاتەوە، بەگوێی رەخنەگردا دەچرپێنێ کە بۆی هەیە تەنها قامك بخاتە سەر رەگەزە دووپاتەوەبوو، ئاساییەکانی بەرهەم. ئەگەر رەخنەگر مل بەمە نەدا تاوانی "شموولیەتی (تعمیم) نابەجێ"و "قامکی بێ رێوجێ خستنە سەر هەندێ شتی" دەدرێتە پاڵ. پێی دەگوترێ ناتوانێ ئەو باروودۆخە کە تەنها لە دوو یان سێ تراژدی راسیندا دەبیندرێ بلاویکاتەوە. پێویستە جارێکی تر[17] بیلێینەوە کە مانا لە روانگەی بونیادیەوە، نەوەك بەهۆی دووپات کردنەوە بەلکو بە یارمەتی جیاوازیەکان لەدایك دەبێ. ...ها کە وشەیەکی دەگمەن ئەگەر لە سیـ ـەمێکی پێکهاتە لە تاراندن و راکێشانەکان - . . ـر ـکرێتەوە زۆر زیاتر لە وشەیەکی بار قورسا‌ی دەلالەتی وەردەگرێ: وشەی بانۆباب[18] لە زمانی فەرانسەدا هیچ شتێکی زیاتر یان کەمتر لە وشەی دۆست نیە. باسی شموولیەتی یەکە دەلالەت گەرەکانیش جێی خۆی هەیەو، بەشێك لەزمان ناسی ئاوری لێدەداتەوە. بەلام ئەنجامگیری لە زەمینەی (دادە پەردازی) دایە، نەوەك دەلالەت و، لەدیدگای رەخنەوە بە بن بەست دەگا. چونکە لەو کاتەوە کە رادەی گرینگی هێماسازیەك، یان بەگوتەیەکی تر، رادەی توانای رازی کردنی تایبەتمەندیەك بەیارمەتی ژمارەی دووپاتەوە بوونی، پێناسە بکرێ. دەبێ دەربارەی ئەم ژمارەیە بریارێکی رێك و پێك بدرێ. باروودۆخێك دەبێ لە چەند تراژدیدا دووپات بووبێتەوە تامن بتوانم شموولی بدەم و بیکەم بە باروودۆخێکی راسینی. پێنج، شەش، دە؟ ئایا دەبێ لە ناوینێك (حد وسط) تێپەڕی تا ئەو تایبەتمەندیە دەرکەوێ و مانا بدۆزرێتەوە؟ ئەی لەگەڵ وشە دەگمەنەکاندا چی بکەین؟ ئایا دەبێ بە ناوی "شاز" یان "لادەر"ەوە پشت گوێیان بخەین؟ مانا ناسی (*Semantique*) بەوردی رێگەی پارێز لە زۆربەی ئەم هەڵانەمان نیشان دەدا. چونکە "شموول کردن"، وەك ئەنجامگیری حەقیقەتی تایبەتمەندیەك لە چەند پاتەوە بووندا، کردەیەکی چەندی نیە، بەلکو چۆنیە؛ واتە جێکردنەوەی هەر وشەیەك -ئەگەرچی دەگمەن- لە کۆی گشتی پەیوەندیەکاندایە. بێگومان وێنەیەك بە تەنها خەیاڵێك ساز ناکا، بەلام خەیاڵیش بەتەنها و بەبێ ئەم وێنەیە بەرهەم نایەت. شموولەکانی (تعمیم) زمانی رەخنە سەروکاریان لەگەڵ پانتای پەیوەندی گەلێك هەیە کە بەهێما سازی دەگەن نەوەك بە ژمارەی چەند پات بوونەوەی کەلك وەرگرتن لە نیشانەکان: رەنگە وشەیەك لە بەرهەمێکدا تاقە جارێك بەکارهێنرابێ، بەو حاڵەش لەدوا چەند جۆر گۆرینی بونیادی لە "هەموو شوێنێك"و "هەمیشە" ئامادەبوونی بێ.

ئەم گۆڕانکاریانەش سنووری تایبەت بە خۆیان هەیە. هەمان سنووری لۆژیکی هێمایی. لە بەرامبەر "وێنە"ی رەخنەی نوێ، "یاسا بنەڕەتیەکانی ئەندێشەی زانستی، یان تەنانەت ئەندێشەی لە گێڕانەوە هاتوو" دەهێننە ئاراوەو ئەمەش کارێکی زۆر هەڵەیە. لۆژیکی دال ئەگەرچی هێشتا بەچاکی نەناسراوە، بەڵام هەیە. هەرچەندە هێشتا نازانین دەکرێ بابەتی چ جۆرە ناسینێك بێ، لانیکەم دەتوانین لێی نزك ببینەوە. بەهەمان شێوە کە دەروون شیکاری و بونیادگەری دەیکەن: لانیکەم دەزانین کە ناکرێ بەهەر شێوەیەك قسە لە هێماکان بکەین. پێویستە راگوزاریش بێ، ئەو مۆدێلانە دروست بکەین کە ئیمکانی شیکردنەوەی چۆنیەتی رێچکەی زنجیرە هێماکان ئامادە دەکەن. ئەم مودێلانە دەبێ لە بەرامبەر سەرسوورمانی رەخنەی کۆن، ئەو کاتە کە خنکاندن بە دەرمان خواردوو کردن و سەهۆڵ بە ئاگرەوە دەبەسترێتەوە، راوەستن[19]. ئەم شێوە گۆڕانکاریانە هاوکات لە لایەن دەروون شیکاری و تیۆرەی گێڕانەوەوە (بەیان) پێشکەش کراون. دەکرێ بۆ : وونە ئاماژە بۆ ئەم بابەتانە بکەین: ئیختیاراتی شاعیری (مەجاز)، سڕینەوە (ئیجازی سڕینەوە)، تەردو عەکس (جیناسی تەواو)، جێگۆڕکە (تەشبیهی بەکینایە یان خوازەی شوێن)، تەکفیرو ئینکار (دژە رستە).[20] کەواتە رەخنەگر لە گۆڕانکاریە یاساوەرگرەکان دەگەڕێ، نەوەك هەڵکەوتەکان کە لە هەمان حاڵدا لە زنجیرەیەکی بەربڵاودا ئیش دەکەن (مەل، فڕین، گوڵ، ئاگر بازی، باوەشێن، پەروانەو سەماکەر لە شیعری مالارمەدا) ئەم ئاڵوگۆڕە یاسا وەرگرانە پەیوەندی گەلێ دوورەدەست بەڵام رەوا دەخولقێنن (چۆمی گەورەو ئارامو درەختی پاییزی)بە شێوەیەك کە بەرهەم، بە بێ خوێندنەوەیەکی وێنە ئاسا یەکپارچە و بەربڵاو بێ. ئایا ئەم پەیوەندیانە سادەن؟ بێگومان لە پەیوەندیەکانی دەروونی شیعر سادەتر نین.

کتێب جیهانێکە. رەخنەگر لە بەرامبەر کتێبدا هەمان شەرایتی گوتاری هەیە کە نووسەر لە بەرامبەر جیهاندا هەیەتی. لێرەدایە کە دەگەینە سێهەمین ئیجباری رەخنە. رەخنەگریش وەك نووسەرە. چونکە ئەو بێ شکلیە کە بە بابەتەکەی دەبەخشێ دەبێ بەلایەکی تایبەتدا رێنوێنی بکرێ. ئەم لایە تایبەتە کامەیە؟ ئایا بەرەو "سوبژکتیوتیە" دەچێ کە کردوویانە بە گۆپاڵێك و بەزۆور سەری رەخنەی نوێوە رایانگرتووە؟ گەلێ جار رەخنەگرەکان بەو گوتارانە دەڵێن "سوبژکتیو" کە تەنها باسی بابەتێکی زەنی دەکەن و گوێ بە عەینیەت نادەن و، بۆ بەزاندنی ئەم "سوبژکتیوتیە" تارادەی وەسف کردنێکی هەرج و مەرج خوازانەو فرەوێژانەی ئیحساساتە تاکە کەسیەکان، نزمی دەکەنەوە. چۆن دەکرێ لەمانە بگەیەندرێ کە سوبژکتیوتیەیەکی خاوەن سیستەم، واتە سوبژکتیوتیەیەك کە لە کولتوورەوە سەرچاوەی گرتبێ و، بەشوێن یاسا بەربڵاوەکانی هێماکانی بەرهەمەوە بێ، بەختی زیاتری بۆ بوون بە ئەبژەیەکی ئەدەبی هەیە تا ئەبژکتیوتیەیەکی بێ کولتوورو کوێر کە وشەکان بە سروشت دەزانێ و لەپشت ئەوانەوە خۆی شاردۆتەوە. بەڵام شتێکی دیکەش لە ئارادایە: رەخنە بەزاست ناژمێردرێ.(رەخنە زانست نیە). دەبێ لە رەخنەدا گوزارەی ئەبژە -نەوەك خودی ئەبژە- رووبەرووی سووژە بکەنەوە. بەزمانێکی‌تر،

ڕەخنەگر ڕووبەڕووی ئەبژەیەك دەبێتەوە كە خودی بەرهەم نیە، بەڵكو زمانی بەرهەمەكەیە. دەبێ ڕەخنەگر چ پەیوەندیەكی لەگەڵ زماندا ببێ؟ پێویستە لەم ڕوانگەوە پێناسەی "سوبژكتیوتیە"ی ڕەخنە بكرێ.

ڕەخنەی كلاسیك ئەم بڕوا گێلانەی بڵاوكردۆتەوە كە سووژە "شتێكی پڕە"و، پەیوەندی سووژەو زمان هەمان پەیوەندی مەبەست و گێڕانەوەی مەبەستە. گوایە كەڵك وەرگرتن لە گوتاری هێمایی بڕوایەكی دژ بەمەمان لەلابروست دەكا: سووژە گشتێكی دابڕاو نیە كەمافی ئەوەمان ببێ، یان نەمانبێ، لە دەروونی زمان دەریكێشین (بەپێی ژانری هەڵبژاردەی ئەدەبی). بە پێچەوانەوە بۆشاییەكە كە نووسەر گوتارێكی نێجكار گۆڕاوی (گوتارێك كە خۆی بە ئووری زنجیرەیەك گۆڕانكاریدا كردبێ) دەربارە دەڵێ. بەم شێوە هەموونووسراوەیەكی بێگەرد سەروكاری لەگەڵ ونی سووژەدا هەیە، نەوەك لەگەڵ سفەتە دەروونیەكانی سووژەدا. زمان گوزارەی سووژەیەكی لە وەسف نەهاتوو، یان كەرەسەیەك بۆ وەسف كردنی نییە.زمان خودی سووژەیە. من پێم ولیە (نیارە ئەم تەنها بڕوای منیش نیە) كە ئەم خاڵە گرینگترین تایبەتمەندی ئەدەبە. ئەگەر تەنها قسە لەسەر وەسف كردنی سووژەكان (بۆ نموونە لیمۆیەك)و كامڵ بوونی ئەبژەكان بەهۆی وێنەكانەوە بوایە، كەواتە ئەدەب بەكەڵكی چی دەهات؟ نووسراوە با ...ەكان بەم ئەركە هەڵدەستان. ئەوەی ناچاری بوونی هێماكان دەسەلمێنێ پێویستی دەرخستنی بەردەوامی پووچی "منە". ڕەخنەگر ئەگەرچی زمانی خۆی دەخاتە سەر زمانی نووسەرو، هێماكانی خۆی دەخاتە سەر هێماكانی بەرهەم، بەڵام ئەم كردە لەبەر ئەوە نیە ئەبژە "شكڵ شكێنی" بكا، تا بەزمانی خۆی بیگێڕێتەوە. یان نایەوێ بیكاتە گوزارەیەكی شەخسی خۆی. ئەو بۆجارێكیتر نیشانەی خودی بەرهەمەكان لە شێوەی نیشانەیەكی جیاو وەرگێڕ وەها دەسازێنێتەوە كە پەیامە هەڵبژاردەكەی سوبژكتیوتیەیەكی لەو بابەتە نیە. بەڵكو تێكەڵەیەك لە خودی سووژەو زمانە. بەشێوەیەك كە ڕەخنەو بەرهەم بەردەوام بڵێن: من ئەدەبیاتم و، بەشوێن ئەم گوتنەشیاندا، ئەدەب هەرگیز شتێكی جگە لە ونی سووژە ئەهێنێتە ئاراوە.

ڕەخنە بێگومان خوێندنەوەیەكی قووڵە. ڕەخنە لە بەرهەمدا شێوەیەك تێگەیشتن دەدۆزێتەوەو، پەی بە تەنویلێك دەبا، بەڵام ئەو شتەی كە دەینوێنێ مەدلوولێك نیە. (چونكە ئەم مەدلوولە بەردەوام بەرەو بۆشایی سووژە دەگەڕێتەوە) بەڵكو تەنها زنجیرە گەلێك لە هێماكان و پەیوەندیە نزیكبونەوەیەكی نوێیە لەگەڵ ئەو هێمایانە كە بەرهەمەكەیان لێ سازبووە. ئەوكاتەی، ڕەخنەگر تەباكانە: ئەو "مانا"یە كە ڕەخنە بەوپەڕی ئیختیارەوە بە بەرهەمی دەبەخشێ، لە ئەنجامدا تەنها مانایەكی هاوبەش لە "مەل"و "بارەشین" لە شیعرێكی مالارمەدا هەڵدەێنجێ- "هات و چوون، "بالقوە"- دوا حەقیقەتی وێنەكە ناكێشێتەوە، بەڵكو تەنها وێنەیەكی هەڵواسراوی تازەمان پێشكەش دەكا: ڕەخنە نەوەك وەرگێڕان بەڵكو بۆچوونە. ڕەخنە ناتوانێ بڵێ پەی بە قووڵایی بەرهەم بردووە، چونكە ئەم قووڵاییە خودی سووژە واتە ونبوونێكی: هەر خوازەیەك (استعارە) نیشانەیەكی رووكەشبەو ڕەوتی

هێماکان له جۆششی خۆیدا ئەم مەدلوولە دووره دەستە هەڵدەبژێرێ. رەخنەگر هەر دەتوانێ خوازەکانی بەرهەم درێژ بکاتەوە، نەوەك کورتیان بکاتەوە. جارێکی تر دەبینین ئەگەر لە بەرهەمدا مەدلوولێکی "شاردراوە" و "ئەبژکتیو" ببوایە، ئەوسا هێما تەنها تەعبیرێك (*euphemisme*) دەبوو، نەدەبیش جلوبەرگێکی دڕاو، رەخنەش زانستی (فقه اللغه). هەوڵدان بۆ ئاشکراکردنی رەهای بەرهەم بێ سوودە، چونکە لە ئان وساتدا هیچ شتێك بۆ گوتن لە ئارادا نیەو، بەرهەم نایەوێ مۆری بێدەنگی بخاتە سەر زمانی خوێنەرەکانی. هەروەها بێ سوودە ئەگەر لە بەرهەمدا بەشوێن رازێکی شاردراوە و گریمانەی شتێکی نهێنیدا بگەرێین. بیرکردنەوە لە بوونی رازێك کە بە دۆزینەوەی ئەو رازە هەموو شتێك روون ببێتەوە، بیرکردنەوەیەکی چەوتە. ئێمە هەر شتێك دەربارەی بەرهەم بڵێین ئەو هەروا وەك ساتەوەختی سەرەتای خۆی، زمان و، سووژەو، ونبوونەو هیچی تر.

پێولنەی هەڵسەنگاندنی گوتاری رەخنەگرانە دروستیەتی. هەروا کە لە مۆسیقادا، ئەگەرچی نۆتەیەکی دروست نۆتەیەکی حەقیقی نیە، بەڵام حەقیقەتی پارچە مۆسیقاکە بە دروستی ئەو نۆتەوە بەستراوەتەوە. چونکە دروستی لە یەکپارچەیی و تەباییەوە ساز بووە. بەبێ ئەوەش رەخنەگر بۆ نزیکبوونەوە لە حەقیقەت پێویستە دروستکاربێ و هەوڵ بدا لە زمانی خۆیدا، لەسەر ئەساسی "شێوەیەك میزانسنی[21] مەعنەوی" باروودۆخی هێمایی بەرهەمەکە دووبارە سازی بکاتەوە. رەخنەگر بێ ئەم کارە ناتوانێ "حورمەتی" بەرهەمەکە بپارێزێ. لەراستیدا دوو شێوەی جیاواز بۆ پشت گوێ خستنی هێما هەیە. شێوەی یەکەم، هەروا کە بینیمان زۆر بەپەلەو لەسەر بناخەی رەتکردنەوەی هێمایە. لەم شێوەدا هەموو پەیکەرەی دەلالەتی بەرهەمەکە دەکەوێتە داوی یەکنەواختی ئاخاوتنی رۆژانە، یان دەخرێتە بن بەستی "هەمان گوییەوە". بە پێچەوانەوە، شێوەی دووهەم هەوڵێکە بۆ تەئویلی زانستی هێما. لەلایەکەوە دەگوترێ بەرهەم مل بە ئاشکرابوونی رەمزەکانی دەدا (بەم بۆنەوە بە هێمایی دەزانین) لەلایەکی ترەوە ئەم ئاشکرا کردنی رەمزە بە یارمەتی کەرەسە گوتاریەکان کە خۆیان نەدەبیو، رووکەشیو، وشکن دەبنە هۆی لە جووڵەخستنی خوازەکانی بەرهەم، تا لەم بێ جووڵەییەدا "حەقیقەتەکەی" داگیر بکەن. نموونەی ئەم شێوەیە رەخنەگرتنی هێمایی بە مەبەست و هۆکاری زانستی (وەك کۆمەڵناسی و دەروون شیکاری)یە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا ناتەبایی دڵخوازانەی زمانەکان، واتە زمانی بەرهەم و زمانی رەخنەگر دەبێتە هۆی پشت گوێ خستنی هێماکان. ئاواتی بچووك کردنەوەی هێماکان بەقەدەر پێداگرتن لەسەر گەورەکردنەوەی لەفز، ناڕەوایە. هێما دەبێ بەشوێن هێمادا بگەڕێ. زمانێك دەبێ بە تەواوی دەربارەی زمانێکی تر باخێوێ. بەم شێوەیە کە حورمەتی وشە لە بەرهەمدا دەپارێزرێ. ئەو رەوتە بەرناوەژووە کە لە ئەنجامدا رەخنەگر بە ئەدەبەوە دەبەستێتەوە، سوودی زۆرە. بۆ نموونە ئیمکانی بەگژدا چوونەوەی مەترسیەکی دوولایەنەی بەدواوەیە. قسەکردن دەربارەی بەرهەمێك وەك ئەوە وایە بەرهەمەکەمان رشتبێتە ناو قاڵبی گوتارێکی پووچەوە. (جا ئەو گوتارە چ فرە وێژ بێ و چ بێدەنگ). یان رشتبێتمانە ناو

قالبی گوتارێکی "بەشت کەر"ەوە، کە ئەم گوتارەش ئەو مەدلوولانە کە پێیوایە دۆزیویەتیەوە لەگەڵ وشەگەلی تر تیلیان دەکا. لەرەخنەدا ئەگەر بەرپرسایەتی تەئویل بۆ بەرهەمەکە، لەگەڵ بەرپرسایەتی رەخنەگر بۆ گوتارەکەی خۆی یەك نەگرنەوە، گوتاری دروست ئیمکانی نابێ.

رەخنەگر تەنانەت ئەگەر کەمێك ئاگاداری زانستی ئەدەبیش بێ، کاتێ رووبەڕووی دەبێتەوە دەستی بەتاڵە. چونکە ناتوانێ وەك کالا یان ئامێر سوود لە زمان وەربگرێ. رەخنەگر نازانێ چۆن لەگەڵ زانستی ئەدەبدا بگونجێ. تەنانەت ئەگەر بە شێوەیەکی تەمسیلی (نەك تەوزیحی) ئەم زانستەی بۆ پێناسە بکەن، دیسان بە بەشێك لە خۆی نازانێ: ئەوەی رەخنەگر دەینوێنێ خودی زمانە، نەوەك ئەبژەی زمان. بەلام دەکرێ ئەم نێوانە تێپەڕێنێ بەو مەرجە کە نێوانەکە ئیجازەی بەربلاوکردنی تەوس بەرەخنە بدا. ئەوەی زانست لێی بێبەشە تەوسەو، تەوسیش جگە لە پرسیارکردن لەزمان دەربارەی زمان هیچی تر نیە. ئێمە خوومان بەوە گرتووە ئاسۆیەکی ئایینی یان شاعیرانە بەهێماکان ببەخشین. ئەم خووە ناهێڵێ ئەو تەوسە کە لە هێماکاندا هەیە ببینین. ئەو تەوسە کە شێوەیەکە بۆ ژێر پرسیار خستنی زمان لە رێگەی زیادە رۆیی ئاشکراو بێ پەردەی زمانەوە. دەشێ لە بەرامبەر تەوسی بێ مایەی فۆلتەری کە بەرامبەری خۆشیفتە بوونی زمانێکی بەدەمارە، تەوسێکی تر بێتە ئاراوەو ناوی بارۆکی لێ بنێین. چونکە کەمەی ئەم تەوسە لەگەڵ فۆرمەکاندایە نەوەك بوونەوەرەکان، لەبری وشکەڵ و سیسەڵ کردنی زمان، گەشەی پێدەدا. بۆ دەبێ رەخنە سوود لەم تەوسە وەرنەگرێ؟ رەنگە تەوس تاقە گوتارێکی جیدی (بنەوەشی) بێ کە بۆ رەخنە ماوەتەوە. لەبەر ئەوەی کە بناخەی زانست و زمان بەچاکی بونیاد نەنراوەو، ئەم بارودۆخە هەروا بەردەوامە، تەوس ئێستا ئەو شتەیە کە رەخنەگر دەتوانێ سوودی لێ وەربگرێ. کافکا گوتەنی؛ نەوەك بۆ بینینی حەقیقەت بەڵکو بۆ حەقیقەت بوون،[22] وەها کە بتوانین داوای لێبکەین: وام لێبکە بڕوا بە قسەکانت بکەم. بگرە لەوەش زیاتر، داوای لێبکەین کە وامان لێبکا بڕوا بە بڕیاری گوتنی قسەکانی بکەین.

### خوێندنەوە

هێشتا گومانێکی تر هەیە کە دەبێ خۆی لێ دامالین. رەخنەگر بە هیچ جۆرێك ناتوانێ جێگەی خوێنەر بگرێتەوە. بێ سوودە ئەگەر داوای لێبکەین دەنگێکی ئەگەرچی شیاو بۆ خوێندنەوە بدا بەقەرز بە خوێنەران و، خۆی ببێ بەو خوێنەرە کە خوێنەرەکانیتر لەبەر ئەوەی بە کەسێکی وشیاری دەزانن و،دەیانەوێ مافێکی گشتیش بەسەر بەرهەمەکەدا بسەپێنن، وەك وەکیلی خۆیان بۆ دەربڕینی هەستیان هەڵیبژێرن. بۆ؟ چونکە تەنانەت ئەگەر رەخنەگر بە خوێنەرێك بزانین کە دەنووسێ، بەو مانایەیە کە خوێنەر لەگەڵ ناوبژیەکی ترسناکی وەك نووسراوەدا رووبەڕووە.

کەواتە نووسین جۆرێك لەت و کوت کردنی دنیا (کتێب)و دووبارە دروست کردنەوەیەتی. لێرە دەبێ ئاماژە بۆ شێوەیەکی قووڵ و مامۆستایانە بکەین کە لە سەدەکانی ناوەڕاستا، بۆ تەنزیمی پەیوەندیەکانی کتێبی (گەنجینەی عەتیق) باو بوو هەروەها بۆ ئەو کەسانە کە

ئەركی ڕێنوێنی ئەم دەسمایە بەرێزەیان لە نێوان گوتارە تازەكاندا لە ئەستۆبوو.

ئێمە ئیمرۆ كەتەنها مێـژووزان و رەخنـەگر دەناسین (هێشتا دەیانەوێ وامان لێبكەن بۆ ناسینەوەو لەیەك جیاكردنەوەی ئەو دوو كەسە بەهەڵە بچین). لەسەدەكانی ناوەڕاستا چوار كاركردی جیاوازیان بۆ كتێب دادەنا: نوسخە نووس **Scriptor** (كە بەبێ زیادكردنی هیچ شتێك دووبارەنووسی بكاتەوە) موئەلیف **Compilator** (كە هیچ شتێكی خۆی پێ زیاد ناكا). راڤەكار **Commentator** (كە دەخاڵەتی لە دووبارە نووسینەوەی دەقدا نیە، مەگەر لە پێناوی تێگەیشتنیدا). لە ئەنجامدا خاوەنی بەرهەمەكە **autor** (كە دیدگاكانی خۆی بە پشت بەستنی هەمیشەیی بەسەرچاوەكانی تر دەگێڕایەوە). وەها سیستەمێك كە بەبێ شاردنەوە مەبەستی ئەوەبوو بە نیسبەت كتێبی پیرۆزەوە -واتە ئەو تاقە شتە كە بە كتێبیان دەزانی- "وەفادار" بێ، تەئویلی وەهای لە "عەهدی عەتیق" بە دەستەوەدەدا كە مۆدێرنیتە هەوڵی رەتكردنەوەی دەدا، لەدیدی رەخنەی ئەبژكتیوی ئێمەوە وڕێنەیە. كەواتە لەراستیدا جێگەی رەخنە بە **Compilator** ەوە دەست پێدەكا: پێویست ناكا بۆ "شكڵ شكێنی" دەقەكە لە خۆیەوە هیچی پێ زیاد بكا. ئەوەندە بەسە قامكی لەسەر دانێ و قاشیكا تا دەستبەجێ ئیمكانی تێگەیشتنی تازەی بڕەخسێ. ئەم ئیمكانی تێگەیشتنی تازەش كەم و زۆر وەردەگیرێ و یاساو رێسای خۆی پەیرەو دەكا. رەخنەگر تەنها **Commentator** شەرح كەرێكی تەواو عەیارەو (ئەم تایبەتمەندیەشی بەلاوە بەسە). چونكە لەلایەكەوە گوێزەرەوەیە، دەسمایەیەكی رابوردوو، (كە هەمیشە پێویستە، دەگوێزێتەوە: چونكە بۆ راستین خۆی بەقەرزاری ژۆرژ پولەو،[23] ورلەن خۆی بە قەرزاری پێر ریشارد نەدەزانی؟)[24] لەلایەكی تریشەوە ئامادەكارێكە (اجرا كننده– **Operateur**) كە بۆ جارێكی تر رەگەزەكانی بەرهەم بەو شێوە كە جۆرێك عەقڵ باوەری یان جۆرێك لەنێوانیان بداتێ، ئامادە دەكاتەوە.

جیاوازیەكی تری نێوان خوێنەرو رەخنەگر: ئێستا كە نازانین خوێنەرێك چۆن لەگەڵ كتێبێكدا دەدوێ، رەخنەگر مەجبوورە لەحنێكی (ئیقاع) تایبەتی ببێ. دیارە ئەم لەحنە، لە حنێكی سەلماندن (تەئیدی) دەبێ. رەنگە رەخنەگر لە دڵی خۆیدا بە هەزاران شكڵی نابەرهەس شك لە سانسۆرەكانی خۆی بكاو ئازاریان پێوە ببینێ. ئەو لە ئەنجامدا تەنها دەتوانێ هۆمەن بۆ نووسراوەیەكی پڕ، واتە گێڕەرەوە ببا. ئەگەر بەهۆی تەولزوع، گومان، یان هەر شتێكی ترەوە هەڵوێستی فێركارانەی نووسراوەكان رەتبكەینەوە، قسەیەكی نابەجێمان كردووە. لێرەش وەك هەموو نیشانەكانی تر رووبەرووی نیشانە رەمزدارەكان بووینەتەوە. نووسراوەكان رایدەگەیەنن كە زەمانەتی هیچ شتێكیان پێ ناكرێ، بۆیە بە نووسراوە لەقەڵەم دەدرێن. رەخنە چۆن دەتوانێ پرسیاركەر، بینەرو بەگومان بێ، لە هەمان حاڵیشدا بەهەڵە نەچێ؟ رەخنە نووسراوەیەو نووسراوەش لەگەڵ مەترسی هەڵخلیسكان و، بەردەوامی ئەزموون و هەڵەدا رووبەڕووە. ئەگەر نووسراوە پەیرەوی لە بنەمایەكی نەگۆڕ بكا، ئەم نەگۆڕە بەرپرسایەتیە نەوەك حەتمیەت.بەر پرسایەتی هەڵوێستێكە، هەڵوێستێكی بچووك كە لە نووسراوەدا بەردەوامی هەیە

کەواتە "پەیوەندی گرتن" لەگەڵ دەقێک، نەوەک لەرێگەی چاوەوە بەڵکو لە رێگەی نووسراوەوە، درزێک لە مابەینی رەخنەو خوێندنەوەدا دروست دەکاو، ئەمەش هەمان درزە کە هەموو دەلالەتێک لەنێوان سنووری دال و مەدلوولەکانی خۆی سازدەکا. چونکە هیچ کەس ئاگای لەو مانایە نیە کە خوێنەر بە بەرهەمی (وەک دالێک) دەبەخشی. لەبەرئەوەی کە ئەم مانایە جۆرێک ئارەزووەو، لەو پەڕی رەمزی سیستەمی زمانەوە رادەوەستێ. تەنها خوێنەر بەرهەمەکەی خۆش دەوێ‌و پەیوەندیەکی دڵخوازانەی لەگەڵ دەگرێ. خوێندنەوە واتە حەز کردن لە بەرهەم، تێکەڵ بوونیو، رەتکردنی دوولایەبوونی بەرهەم بەهۆی هەموو گوتارێکی دەرەکیەوە جگە لە گوتاری خودی بەرهەمەکە: تاقە شێوەی پەراوێز نووسینێک کە دەتوانێ خوێندنەوەیەکی رەهای بەشوێنەوە بێ‌و رێزی لێ بگرێ بەرەو پێرچوونێکی ئەدەبیە.[26] (وەک ئەوکەسانە کە تازە تاویان داوەتە خوێندنەوەو بەرەو پێرچوونی ئەدەبی، پرۆست دەکەنە نموونە) تێپەڕین لە خوێندنەوە بۆ رەخنە، مەیل گۆڕینە. واتە گوێزانەوەی حەز لە بەرهەمەوە بۆ زمانی بەرهەم. بەڵام بەشوێن هەموو ئەمانەشدا رەخنەگەڕاندنەوەی بەرهەمە بۆ مەیلی نووسینێک کە لێی چۆتە دەر. بەم شێوە گوتار لەدەوروبەری کتێب دەسووڕێتەوە: خوێندنەوە، نووسین: ئەدەب زنجیرەیەکە لە نێوان مەیلی بۆ خوێندنەوەو مەیلی بۆ نووسین. چەند نووسەر تا ئێستا تەنها لەبەر ئەوەی بەرهەمیان خوێندۆتەوە نووسیویانە؟ چەند رەخنەگر هەر بۆ ئەوەی بنووسن خوێندوویانەتەوە؟ ئەوان باوەشیان بە دوو رەهەندی کتێب‌و دوو رووپەڕی نیشانەدا کردووە تا لە ناخی ئەمانەوە گوتارێک بێتە دەر. رەخنە تەنها ساتەوەختێکە لەم مێژووە کە پێمان تێناوەو بەرەو یەکبوون و حەقیقەتی نووسراوە رێنماییمان دەکا.

## پەراوێزەکان:

*بەشێکی کورت لە پێشەکی کتێبەکە بەفەڵەمی وەرگێڕی فارسی، شیرین دۆخت دەقیقیان.

(1) ژرار ژێنت، "تیۆری بەیان و ئاگاداری لەسەدەی بیستەمدا" لە گۆڤاری ساڵیانەی 1966.

(2) بڕواننە وتاری "دانتەو تێپەڕین لە نووسراوە" نووسینی رەخنەگری فەرانسەیی فیلیپ سولر 1965.

(3) Ignace Loyola (1491–1551) دامەزرێنەری فیرقەی ژزوئیت، کە بڕوای بە تەئویلی دەقە پیرۆزەکان بوو.

(4) Alain Girard ئەلەن ژیرار لە یادداشتە تایبەتیەکاندا (1963) و، موریس بلانشۆ لە فەزای ئەدەبیدا (1955).

(5) و (6) بڕواننە دەقی کراوە نووسینی ئومبرتۆ ئێکۆ.

(7) مانای ئەدەبی، تەمسیلی، ئەخلاقی و باتنی. یەکێک لەو کەسانە کە سەرنجێکی وردی بەم تیۆریە داوە ئومبرتۆ ئیکۆیە. ئەو لە کتێبی دەقی کراوەدا، کە بارتیش ئاوڕی لێ دەداتەوە، وە بیرمان دەهێنێتەوە کە لە دوا سەدەکانی ناوەڕاست، بۆ یەکەم جار دانتە سەرنجمانی بۆ ئەم تیۆریە راکێشا کە پۆل قدیس، ژرومی قدیس، ئاگوستین قدیس، ڤیکتۆر قدیس و توماس قدیس باسیان کردبوو: بەپێی ئەم دیدگایە خوێنەر دەزانێ کە هەر رستەو هەر کەسایەتیەک خاوەنی دەلالەتە جۆراوجۆرەکانە کە ئەو دەتوانێ بیدۆزێتەوەو بەپێی هەڵبژاردنیان کلیلێکیان هەیە کە بەو کلیلە دەلالەتەکان دەدۆزێتەوە. ئێکۆ ئاماژە بۆ گوتاری ژمارە 13 دانتە دەکا. دانتە بۆ نموونە رستەیەک لە (عەهدی عەتیق) دەربارەی هاتنە دەرەوەی بەنی ئیسرائیل لەمیسر بەیارمەتی حەزرەتی موسا دەهێنێتەوەو، چوار جۆر تەئویلی ئەدەبی، تەمسیلی، ئەخلاقی و باتنی ئەم رستەیە دیاری دەکا. لە دوامانا ئەدەبیەکەی کە زوو خۆی بە دەستەوە دەدا، مانا تەمسیلیەکەی دەشێ رزگاری مرۆڤەکان بەیارمەتی مەسیح بێ. مانا ئەخلاقیەکەی تێپەڕینی رۆح لە دۆخی تاوانەوە بۆ لێبووردنە. پاشان ئەگەر لەشوێن مانا عیرفانیو باتنیەکەی بگەڕێین، ئەوە دەگەینە کە رۆحی پیرۆز لەدوا هاتنەدەر لە کۆیلەتی لەش، بە ئازادی و شانازی هەتاهەتایی دەگا. وەرگێڕاو لە: Omberto Eco. Loeuvre Ouverte Edition du seuil. 1962. P. 19-21.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە تیۆری تەئویل کە بە تیۆری ئاگوستینی قدیسی دەزانن، سێزدە سەدە بەر لە ئەو لەلایەن دوو فەیلەسوفی جولەکە- نوێ ئیفلاتوونی ئەسکەندەریەوە، کە ناویان فیلوون و، ئەریستۆ بولوس بوو لە ژێر کاریگەری رەواقیوونەوە کەوتە ئارا. ئەرستۆ بولوس راڤەی تەمسیلی تەوراتی کرد و بەخاوەنی رووپەرەمانایە جیاوازەکانی زانی. لەسەدەی یەکەمی زایینیدا پیاوێکی ئاینی جولەکە بەناوی رەبی عەقیوا کە رۆمیەکان کوشتیان، تیۆری تەئویل و رووپەڕی مانای نووسیەوەو، قوتابخانەیەکی تایبەتی بنیاد نا کە بۆ جیهانی مەسیحی و پاشان ئیسماعیلیەکان گوێزرایەوە. لەم بارەوە بڕوانە کتێبی:

*Hellenistic Jewish Philosophy* بەشەکانی *The History of Jewish Philosophy* هەروەها *Aquiban and Ishmaelian schools*

(8)*Guermante* شوێنێکی پڕ بیرەوەری بۆ پرۆست و ناوی بەشێک لە کتێبی "لەشوێن زەمەنی لەدەست چوو."

(9)*Cratyle* ناوی گوتارێکی ئەفلاتوون دەربارەی زێری زمانەو، هێرمۆژن ناوی فەیلەسوفێکی یۆنانیە.

(10)*langue* زمانی رەها یان سیستەمی زمان. کتێبی "وانەکانی زمان ناسی گشتی" سوسور بە لێکدانەوەی دوو چەمکی زمان و گوتارەوە دەست پێدەکا: "لێکدانەوەی زمان دووبەش دەگرێتەوە: بەشی سەرەکی پەیوەندی بەو زمانەوە هەیە کە لە جەوهەری خۆیدا کۆمەڵایەتی و بەنیسبەت تاکەوە سەربەخۆیە، ئەم موتالایە فیزیکیە. بەشی دووهەم پەیوەندی بە بەشی تاکەکەس زمان واتە ئاخاوتنەوە هەیە کە فۆنێتیکیش وەک موتالایەکی دەروونی - فیزیکی دەگرێتەوە."

وەرگیراو لە:

*F. De Saussure Cours de Linguistique Generale Payot, Paris. 1985.*

(11)*Pytique* وەرگیراو لە *Pytie* گەورەی ئاینی پەرەستگای ئاپۆلۆن لە ئەفسانەکانی یۆناندا.

(12)توێژینەوەی نووسەر دەربارەی زمان: مارت رۆبێر لە لێکدانەوەی کافکادا لەم بابەتە دواوە (کتێبی ... ، نەشری گالیمار، *1960*).

(13)لێرەدا بێگومان مەبەستم هەوڵەکانی چامسکی و پێشنیارەکانی رێزمانی گشتاریە (*Transformationnelle*).

(14)ئایا پێویستە ئەو شتە وەبیر بهێنینەوە کە شێتیەتی مێژووی هەیەو ئەم مێژووە هێشتا کۆتایی نەهاتووە؟" میشل فۆکۆ، مێژووی شێتیەتی لەسەردەمی کلاسیکدا *1961*.

(15)*Boileau* دیسپرۆ بوالۆ (*1636–1711*) هاوڕێی نزیکی راسین و لافۆنتین، شاعیرو رەخنەگری فەرانسەیی.

(16)*Brunetiere* فێردیناند برۆنێتێر مامۆستای رەخنەی فەرانسەیی (*1849–1906*) هەوڵیدا تیۆری تەکامول لەسەر ئەدەب پیادە بکا.

(17)بڕوانە رۆلان بارت بەشی "دەربارەی دوو بەرهەمی کلۆدلۆی ستراوس"

(18)*Baobab* ناوی درەختێکە لە ناوچەکانی (استوا) کە وشەیەکی شازە لە ناوچە ئانستواییەکان و بارتیش ئاماژە بۆ ئەمە دەکا.

(19)ئاماژەی بارت بۆ دولە بەرامبەرەکانی پەیوەندی هاونیشنی و جێنشینی و... کە یەکێک لە ئەسڵەکانی لێکدانەوەی بونیادی دەقەکانە، بۆ نموونە سەرو خوار، چەپ و راست، ژن و پیاو، لەو دولانەن کە رەخنەگری بونیانگەرا لە هەر *Lexis* یان یەکەیەکی خوێندنەوەدا لێیان دەگەڕێ، بۆ ئەوەی پەیوەندی بەشە دەروونیەکانی دەق لەگەڵ یەکتر بدۆزێتەوە. رەخنەی کۆن کە سەبەبەی ئەم شتە دەبلورە، دەینوانە سەری لێی سوور دەمێنێ.

(20)*Antiphrase* "ریشەی ئەم وشە یۆنانیە و مەبەست لە شێوەیەک گێڕانەوە بەهۆی دژەکەیەوەیە. بەوشێوە کە بە بەکارهێنانی وشەیەک بەهەست و بڕوای دژ بە خۆیەوە، دلوای مانایەکی تری لێبکەین. ئەم بونیادە هونەریە زیاتر لە تەوسدا *Irony* و، لە ئیسپات لە رێگەی رەتکردنەوە *Litotes* بەکاردەهێنرێ".

(21)زاراوەیەکی شانۆگەریە. بەمانای چۆنیەتی وەستان و جوڵەی ئەکتەرەکان لەسەر تەختەی شانۆ.

(22)کافکا: "هەموو کەس ناتوانێ حەقیقەت ببینێ، بەڵام هەموو کەس دەتوانێ حەقیقەت بێ."

(23)*Georges Poulet* رەخنەگری ئۆتریشی و نوێنەری قوتابخانەی "دیارناسی" لە رەخنەی ئەدەبیدا. لەم شێوە رەخنەدا بە پێچەوانەی قوتابخانەکانی تری پۆست مۆدێرن، بەها بەدەوری نووسەر بۆ ئاشکرابوونی مانای بەرهەمەکەی دەدرێ. ئاماژەی بارت بۆ ئەم خاڵە لە کاری پولە دلیە.

(24)ئێدز پولە نووسەری "یادداشتەکان دەربارەی سەردەمی راسین"و، پیێر ریشار نووسەری "بێ تامی ویرلەن"

(25)*Pastiche* واتە نووسینی بەرهەمێک بۆ بەرەوپێر چوونی بەرهەمێکی تر.

# نامەکانی کافکا بۆ میلنا

● و. لە فارسییەوە: رەووف بێگەرد



"نامە نووسین دۆستایەتی کردنە لەگەڵ تارماییدا، ماچە نووسراوەکان ناگەنە مەنزڵ، چونکە ماچەکان هێشتا نەگەیشتوونەتە جێ کە تارماییەکان لەنیوەی رێگادا خواردوویانەتەوە"

(لە نامەیەکی مارتی 1922دا بۆ میلنا)

## 1-یادداشت:

نامەکانی کافکا مرۆڤ بەسەرەگێژە دێنن، وەك چیرۆکەکانیشی هەمان تایبەتمەندیان هەیە، بەرهەمی کافکا پێش ئەوەی جۆرێك بن لە داهێنانی ئەدەبی، جیهانی زەینی خودی داهێنەرەکە دەردەخەن. نامەکانی کافکایش نامەگەلێکی ئاسایی نین و پەیامیان لە زەینێکی ئاوەژوو دنیایەکی ترەوەیە، نامەکانی وەك بەرهەمەکانی بریتین لە روانینێکی زۆر تایبەت بەرانبەر بە بوون و ئەو کابوسانەی لەو روانینەوە سەرچاوە دەگرن.

مەبەستی یەکەمی ئەم وتارە ئەوەیە کە جۆرێك لەو چوون یەکیانە دەربخات کە لە نێوان چیرۆکەکان و کابووس و نامەکانی کافکادا هەیە. کە تێکڕا دنیای زەینی تایبەتی کافکا پێك دەهێنن.

چیرۆکەکان، نامەکان، بەگشتی دنیای کافکا بۆ کەسانێك کە پێی ئاشنا نین کارێکی ئەستەمە. دەڵێیت هەر وشەیەك کە دەنووسرێت، لەباتی

ئەوەی رووناکیەك بخاتە سەر کارەکە، زیاتر مرۆڤ بەرەو گومڕایی دەبات، بە وتەی یەکێك لە پسپۆڕانی بەرهەمی کافکا: "ئەو روونکردنەوانەیش کە زۆر قایل کەرن دوای ئەوەی دەکەونە بەرچاو. بەهۆی ئالۆزی دنیای کافکاوە زۆر زوو بەرەو بن بەست دەچن، ئەو بەیارمەتی تواناو بێبەزەییانەی روانینی خۆیەوە لەدەست هەمووومان هەڵدێت"

کەواتە دەبێت چۆن لە نامەو چیرۆکی کافکا بگەین و لێکیان بدەینەوە؟ مەبەستی دووەم لەم نوسینە ئەوەیە کە رەخنەو روانینی دەروون ناسی، کۆمەڵناسی، لێکدانەوەی ئەفسانەیی یان مەزهەبی، یان هەر جۆرە رەخنەو شیکردنەوەیەك چەندە پێویست و بەکەڵك بێ هێشتا بەس نین و، تەنانەت هەندێك جار گومڕاکەریشن. بۆیە تاکە رێگایەك بۆ ئەوەی تەواو نەکەوینە نێو داوی روون کردنەوەی رەخنەگرانەو لە هەمان کاتیشدا گومڕاکەرەوە، ئەوەیە راستەوخۆ بچینە ناو دنیای زەینی کافکاوە. کافکا خۆی وتوویەتی بۆ دەرك پێکردن و تێگەیشتن لە بەرهەمەکانی دەبێت لە خودی خۆی، لە ژیان و کەسایەتی و خەم و خەوەکانی شارەزا بین. ئێمە دەمانەوێت لە پشت دنیا زەینیەکەی کافکاوە لە نامەکانی بڕوانین و هەر لەگەڵ نامەکانیدا رێ بە دنیای ئەوبەرین.

**2-لێکچوونی نامەو بەرهەمەکانی کافکا؛ ریشەکان، سەرچاوو کەرەسەکان.**

رەنگە سەرەکیترین و کاریگەرترین فاکتەر بۆ دروست بوونی دنیای زەینی کافکا ئەوە بێت کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی -نەمسا-مەجارستاندا کافکا سەر بە گرۆیەکی کەمایەتی کۆمەڵگای پراگ بوە، لە هەموو روویەکەوە کافکا بە بەشێکی کەمی ئەو گرۆیە دەژمێردرا. لە ئیمپراتۆریەتی نەمسا-مەجارستاندا کافکا چیکی بوە، لە کۆمەڵی چیکیدا جوولەکە بوە، لەنێو جوولەکەو چیکیەکانیشدا سەر بە بەشێکی کەم بوە لەوانەی کە بە زمانی ئەڵمانی دواون. سەرئەنجامیش ئەم دەستە نەمساویو مەجەریەی کە چیکیەکی جوولەکەو ئەڵمان زمان بوە، چ نەمساویەکان، چ چیکیەکان، چ جوولەکەکان و چ ئەڵمانیەکان بەگروی خۆیانیان نەدەزانین.

هەر لە منداڵیەوە، ئەم هەست بە کەمایەتی کردنە کاریگەریەکی تاڵی بەسەر کافکاوە هەبوە. ئەو ترس و ئازارەی کە هەر لە منداڵیەوە بەهۆی وابەستەیی کافکا بە کەمایەتیەکی ژێر گوشارو سوکایەتی پێکردنەوە هەستی پێ دەکرد نابێت هەر ئاوا بە ئاسانی تەماشا بکرێت، سووکایەتی و گاڵتە پێکردن لەلایەن زۆرایەتی فەرمان رەواوە زەبرێکی کەمەرشکێن بوو لەسەر پشت بەخۆبەستوویی و ئومێدەکانی منداڵێکی لەرولاواز.

ئێمە دەتوانین لە رێی هەندێك لەو نامانەوە کە کافکا بۆ ملینای نووسیوە شتێك لە سەردەمی منداڵی کافکا تێبگەین. منداڵیەکی شەرمن، ترساو، وەهم گیر کە دنیای واقیعی وەك مۆتەکەیەکی ترسناك دەهاتە بەرچاو.

نامەی ***21*** حوزەیرانی ***1920***ی کافکا بۆ میلنا باس لەوەیە کە چۆن کافکا دنیای لە بەرچاو رەش بووە، چونکە چێشت لێنەرەکەیان هەرەشەی ئەوەی لێ کردووە کە هەندێك لە کارەکانی ئاشکرا دەکات، کارێك کە هەرگیز کافکا دەستی بۆ نەبردوون. ئەوەی لە رووی دەروون ناسیەوە سەرنجمانی بۆ رادەکێشێت ئەوە نیە کە ئەمە منداڵێکی سادەو ساکارە، بەڵکو هەست کردنی ئەم منداڵەیە بە گوناه، راتەکاندن و ترسێکە وا لەو منداڵە دەکات خۆی بەدەست ئەو

هەرەشانەوە بدات کە درزن و چێشت لێنەرەکەیان بۆی هەڵبەستوە.

ئەم ترس و دڵەڕاوکێیە لەگەڵ جوولەکایەتیەکەی کافکادا پەیوەندی هەیە، تەنیا جوولەکەیەکی وەك کافکا دەتوانێت بانگەوازی ئەوە بکات کە: "مرۆڤ وڵاتی خۆی لە دەست داوە".

لەگەڵ ئەوەیشدا کە کافکا رقی لە کەنیسەو دژگەی ئاینی جوو بوە، بەلام لەو ئاینەو ئەو دنیا ترسناکەی جوولەکە وێنەی کێشابوو هەستی بە دڵنیایی نەدەکرد. جگە لەوەی کە ئێمە لایەنی ترسناکی جوولەکە لە هەندێك لە کەسایەتیەکانی کافکا "باوك، دادوەر، سەرۆکەکان، جوولەکە"دا دەبینینەوە، فەزای چیرۆکەکانی کافکایش وەك فەزا وشك و ترسناکەکەی چاخی کۆن (عەهدی عەتیق) ترسناکن. لە نامەکانی کافکاشدا بۆ میلنا ئاماژە بەوە هەیە کە ئەم ئاینە چەندە کاریگەری لەسەر بیری کافکا داناوە.

لە نامەی ***20*** حوزەیرانی ***1920***دا کافکا بە میلنا دەڵێت: "***38*** ساڵ جوولەکایەتی من بەرامبەر بە ***28*** ساڵ مەسیحیەتی تۆیە. (...) بەهەرحاڵ تۆ جوولەکەیەکیت و دەزانیت سەرلێشێوان مانای چی"

لە نامەیەکی تریدا دیسان یاداوەری دەکات: "کە تۆ دەربارەی ئاین دەدوێیت ئایا ئەوە فەرامۆش ناکەیت کە من جوولەکەم (...) تەنانەت لە داوێنی تۆیشدا جوولەکایەتی هەر سامناکە"

دیسان لە نامەی ***30*** مایسی ساڵی ***1920***دا بە درێژی باس لە جوولەکەیی خۆی دەکات و وەك نموونە دەنووسێت: ".. بەلام لە بارەی جوولەکایەتیەوە، کە دەپرسیت ئایا من جوولەکەم؟ رەنگە ئەم پرسیارەت تەواو گاڵتەیەك بێت، یان ئەوەتان مەبەست بێت کە ئاخۆ من لە جوولەکە ترسنۆکەکانم یان نا؟ (...) تەنیا جوولەکە تەریکەکان، لەوانە خودی خۆم، نموونەیەکی راستەقینەی ئەم ترسە (زۆر بەهێزە)ن. (...) جوولەکەکان لەو شوێنانەوە دەکەونە مەترسیەوە کە هەرگیز چاوەڕوانی نین، با وردتر بێ پەرواتر پێتی بڵێم کە جوولەکەکان بەهۆی هەڕەشەوە دەکەونە بەر هەڕەشە".

نموونەی لەمانە دیارتر لە کتێبی (گفت و گۆ لەگەڵ کافکای گوستاڤیانوشدا) هەیە.

با بڕۆینە سەر ئەو فاکتەرانەی کە کاریان لەسەر کافکا کردوە. رەخنەگرەکان لەو باوەڕەدان کە خوێندنی کافکا لە بەشی حقووقدا کاری لەسەر نووسینە پەخشانەکانی هەبوە، کافکا بە واژەگەلێك کە لە زمانی حقووقەوە وەرگیراون جۆرێك لە وردەکاری داوەتە پەخشان نووسینی. وشکی و بێ ئیحساسی ئەم پەخشانە لەگەڵ ناوەرۆکە پڕ لە مەترسیەکانیدا هاوسەنگیان دروست کردوە، ئەمە لە نووسینەکانیدا کاریگەریەکی دیاریان هەیە.

کافکا لەنامەی ***4-5*** تەموزی ***1920***دا کە بۆ میلنای نووسیوە ئەوەی وەبیردێنێتەوە کە ئەو نامەیەی بۆ باوکی نووسیوە نامەی پارێزەرێکی بەرگری کەرەو وای رادەسپێرێت کە هەوڵی ئەوە بدات هەموو فرۆفێڵی پارێزەرێکی بەرگری کەری تیا بدۆزێتەوەو هەرگیز ئەو (بەهانە) گەورەیە فەرامۆش نەکات.

تایبەتمەندی شێوەو نووسینی کافکا لە ئاستێکدایە کە رێگا لەسەر گەلێك راڤەکردن دەکاتەوە، وەك ئیمبرتو ئیکو دەڵێت: بەرهەمی کافکا "بەرهەمی کراوە"ن، نووسینەکانی پڕن لە مانای شاراوە، بەلام هیچ راڤەکردنێك ناتوانێت

دەستەبەری راستی و دروستی خۆی بێت. لۆژیکێك بەسەر زمان و پەخشانی کافکادا زاڵە، لۆژیکی سەر زەوی نیەو یاساکانی نەزانراون، رۆلان بارتیش لەو باوەڕەدایە کە تان و پۆی پەخشانی کافکا رەمز نیە، بەڵکو ئامازە و کینایەو خوازەیە، بۆیە زوربەی نووسینەکانی ئاڵۆزن.

نابێت سادەبینانە وابزانین کە ئەم ئاڵۆزیو نادیاریە تەنیا تایبەتە بە بەرهەمی چیرۆکی کافکاوە، نامەکانیشی هەر هەمان رەوشیان هەیە، لە نامەکانی کافکادا زۆر مەبەست لای میلنا روون نیە تەنانەت بەدحاڵی بوونیش هەیە. ئەگەرچی زۆرجار بەناچاری و بۆ روون کردنەوەی زیاتر بۆ بەرانبەرەکە ئامازەیان پێکراوە. زیاد لەوەی کە نووسینەکانی کافکا بە تەم و مژن بۆ خوێنەری نامەکانیشی هەر دژواری هەیە، ئێمە لێرەدا مەبەستمان لەو نامانەیە کە لە پرسیارو وەلامی بەرانبەرەکانی بێئاگاین، ئەم نامانە گفتوگۆی تایبەتی نێوانی دوو کەسن، دووکەس کە لە ئامازەکان، نامەکان، بەڵێنەکان، جێگاو مەبەستەکان ئاگادارن و، بۆ ئێمە نادیارو داپۆشراون. بۆیە گەلێك لە ئامازە شاراوەکانی نێو ئەم نامانە بۆ ئێمە هەر بە نادیاری دەمێننەوە.

لەم روانگەیەوە دەتوانین بڵێین کە ئەم جۆرە بەرهەمانە بەکاری خوێنەری ئاسایی ناخۆن و تەنیا کەڵکیان بۆ کافکا ناسەکان هەیە. بەڵگەیەکی تریش بۆ ئەم راستیە ئەوەیە کە بێ لە میلنا، توێژەرو وەرگێرەکانی بەرهەمی کافکا زۆرجار لە پەراوێزی خۆیاندا لەسەر کافکا، ئامازەیان بەوە داوە کە گەلێك مەبەست و رستەی نامەکانی کافکا ئاڵۆزو نادیارن.

ئەوەی جێگای سەرسووڕمانە ئەوەیە کە هەر جۆرە راڤەکردنێکی بەرهەمی کافکا بۆ روون کردنەوەو رێگا خۆش کردن بۆ تێگەیشتنی، بوە بە هۆی زیاتر ئاڵۆزکردن و لە نهێنیدا هێشتنەوەی دەقەکە، لە راستیا تێگەیشتن لە بەرهەمی کافکا کارێکی دژوار نیە، بەڵکو راڤەکردن و لێکدانەوەکان زیاتر دژواریان کردوە.

نووسینی کافکا وەك موتەکەی شەو، نادیارو ئاڵۆزەو قبوولی لێکدانەوە ناکات. ئەم مەبەستە بۆ نامەکانیشی راستە، لە راستیا کافکا لەنامەو بەرهەمەکانی، جۆرێك لە لێك چوون لە نێوان کابوس و نووسینەکانیدا بەدەست دێنێت. نووسینەکانی لەخەو دەچن، یان بەواتایەکی تر خەوەکانی کافکا رەش نووسی بەرهەم و بەرهەمەکانی پاکنووسی کابووسەکانین. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە نووسینی کافکا ئاڵۆز دەنوێنن. بەهەرحاڵ کافکا لە گەلێك نامەیدا کە بۆ میلنای نوسیوە باس لە خەوەکانی خۆی دەکات کە خەوی کافکایین، بۆیە دەشێت نامەکانی بکرێنە بەڵگەیەك بۆ خەو و بەرهەمەکانی کافکا.

"گیانەوەر زەدەیی" لە چیرۆکی کافکادا، کەم تا زۆرێك لە نامەکانیشیدا رەنگیان داوەتەوە، وەك دەزانین کافکا لە زۆرێك لە چیرۆکەکانیا دنیا لە دیدی سەگێکەوە (سووسەکانی سەگێك) مشکەکوێرە (لانە) مەیمون (پەیام بۆ فەرهەنگستان) قالۆنچە (مەسخ) مەخلوقی بێناو (بوونەوەری دووڕەگ)مان پیشان دەدات.

وردبینیەکانی کافکا لە پەیکەرە قالۆنچەییەکەی گریگوری سامسا لە چیرۆکی مەسخدا، گەلێك لە رەخنەگرو خوێنەری خستۆتە

سەر ئەو باوەڕەی کە کافکا بۆ نووسینی ئەو بەشە هەر خودی خۆی بە وردی لە قالۆنچە ڕاماوەو لە بارەیانەوە لێکۆڵینەوەی عەینی کردوە. هەندێك لە نامەکانی کافکا ئەم ڕاستیە دەسەلمێنن، کافکا لە زۆر نامەیدا بەهۆی بینینی خۆیەوە باس لە رەفتاری هەندێك گیانداری وەك قالۆنچە، مارمێلکە و باڵندە دەکات (بۆ نموونە نامەی مایسی **1920** نامەی **31** مایسی **1920**) زیاد لەمانەیش نموونەی (خۆ بەگیانەوەرزانی) و شوبهاندنی خۆی بە حەیوانیش دەردەکەون، (بۆ نموونە لە نامەی **14** ئەیلوولی **1920**)دا ئێمە ئاماژەیەك بۆ ئەو ئارەزووەو نیگایەك بۆ دنیای چیرۆکی کافکادا لە قاڵبی بە شت بوون ***Sachlichkeit*** مان بەدەست دێت.

لە دنیای کافکادا کەسایەتی دماڵین و ئامرۆییسازی مرۆڤ هێند بەرزدەبێتەوە کە هەندێك لە رەخنەگرەکان وای بۆ دەچن کە لەو بەرهەمانەدا دنیای شتەکان وردە وردە جێگای دنیای خود دەگرنەوە، ئەمە ئەوە دەردەخات کە هێزە پڕ لە نهێنیە دەرەکیەکان، کەسەکانی کافکایان وا لە خودی خۆیان خاڵی کردۆتەوە کە کەسایەتی خۆیان لەدەست داوەو ناتوانن بەرانبەر بەو هێزە دەرەکیە بەرگری بکەن و کەسایەتی سەقام گیرو سەربەخۆو بەتوانای خۆیان بپارێزن. هەر لەبەر ئەمەیشە کە گەلێك لە کەسایەتیەکانی کافکا تەنانەت ناوی خۆیان (کە ناو رەمزی شناسنامەیانە) لە ئارادا نیە، نموونەی هەرە دیاری ئەو کەسانە-جوزیف. ك-ە لە رۆمانی کۆشك و دادگاییدا. سەیر ئەوەیە ئەم ناوە تێك شکێنراو و ناتەواوانە لە نامەکانی کافکادا جێگایان هەیە. مۆری نامە بەراییەکانی کافکا بۆ میلنا بەبێ ناوهێنانی ناوی بچووکەو لە باتی ناوی کافکا دەنووسێت: کافی ئێوە.

پاشانیش تەنیا یەکەم پیتی ناوە بچووکەکەی خۆی دەنوسێت و سەرئەنجام ئەویش لادەبات و ناوەکە هەر نامێنێت. لە نامەی (**15**ی حوزەیرانی **1920**)دا وا مۆری خۆی دەکات "هی تۆ". لە پەراوێزیشدا دەنووسێت: "ئێستا تەنانەت ناوی خۆیشم ون کردووە، ناوی من بە مروری زەمان کورت تر بۆتەوەو ئێستا هەر ئەوەندەی ماوەتەوە: "هی تۆ" بەلام "هی تۆ"یش زلد برناکات و کافکا نامەکانی خۆی بێ ئیمزا کۆتایی پێ دێنێت.

لە نامەکانی کافکادا مەبەستێکی تریشمان دێتە بەرچاو، ئەویش دژواری و ئاڵۆزی نووسینی پەخشانیەتی، لەمەویەر لە بارەی ناوەرۆکی ناناشکرای نووسینەکانی کافکاوە قسەمان کردو ئێستا چەند ئاماژەیەك بە ئاڵۆزی ساختمانی رێزمانی پەخشانەکانی دەدەین.

کافکا چ لە چیرۆك و چ لە نامەکانیدا حەزی زلدی لە کرداری مەرجی (افعال شرطی) و ئیلتیزامی هەیە، کە لە زمانی ئەڵمانیدا - ئەگەرچی بەو جۆرە دەستەڵاتداریەك دەدرێتە قەڵەم لە دەستووری زمانەکەدا- سوودی کەمتری لێ دەبینرێت. هەروەها لەو ئالۆزیانەی لە ساختمانی پەخشانی کافکادا هەیە لە زیاد بەکارهێنانی رستەی لاوەکیدایە (***Nebensatz***) هەروەها لە بەکارهێنانی رستەی لاوەکیدایە لە رستەی لاوەکیداو وەسف کردنی جۆرلو جۆر بۆ ناوەکانە، ئەم مەسەلەیە نەك تەنیا وەرگێڕانەکانی چەواشە کردوە بەڵکو سەری لە خوێنەری ئەڵمان زمانیشی شێواندوە، کافکا زمانی ئەڵمانی وا بەکاردێنێت کە نووسینەکەی لە یەکەم بینیندا -بەهۆی بەکارهێنانە سەیرەکەیەوە- ناناشنا دێتە بەرچاو، ئەم

جـۆرە بەکاربردنـە، لـە دنیـا زەینیـــە ســەیرو تاریکەکەی ئەودا سەقامگیر دەبێت.

لای کافکا یـاری کـردن بـە زمـان زۆرە، بـۆ نموونـە کافکـا مـەیلی تایبـەتی بــە بـەکارهێنانی وشەی دوولایەن و چەند سەرەوە هەیـە، باشـترین نموونــە نـاوی رۆمانــە بەناوبانگەکــەی *Das Schloss*ە کە بە زمانی ئـەڵمانی هـەردوو مانـای کۆشك و قفڵ دەگەیـەنێت. هـەروەها لـە رۆمـانی مەسخدا سوودی لـە وشـەی *Ungeziefer* کردوە کـە بێجگـە لـە مانـای قالۆنچـەو مێروو بـە مانـای مرۆڤـی نـابودو بـێ کـەڵکیش دێــت. لــە رۆمـانی دادگاییشـدا بـاس لـە گرتنــە، وشــەی گرتــن (*Verhaftung*) لـە زمـانی ئـەڵمانیدا بـە مانـای گیرۆدەبیش دێت. لـە باری دووەمـدا چیرۆکەکـە رووپـەکی تـری بـۆ پـەیدا دەبێـت، یـەعنی بێجگـە لەوەی کە ئێمە سەروکارمان لەگەڵ مەسەلەیەکی حقووقی و جەزایی دادگایە، روەکەی دی گرنگترە کە گرێیەکی دەروونـی کەسایەتیەکەیە، یا بڵێین گیرۆدەیی دەرونیە.

لەم نموونانە لە نامەکانیشیدا زۆرن، کافکـا لـە شوێنێکدا لە وشەی *Verraten* سوود وەردەگرێت کـە هــەم بـە مانـای ناپاکییـەو هـەم بـەمانای دۆزینــەوەی ناپــاکی (خیانـــەت) یــان وشــەی *Stauend* کـە بەهـەردوو مانــای سەرسـوڕمان و وەسـتان بــەکاردێت. لــە رســـتەیەکدا وای بـەکاردەهێنێت: "مــرۆڤ بــەزۆر بەکاریانــەوە دەنووسێن نەوەکا ناپـاکی لەگـەڵ بیریـاندا بکـەن (یان: بیریان ئاشکرا بێت)". نموونـەی تـر بریتـین لە *Vertraulich* بـە مانـای ئاشـناو شـوێن بـاوەڕ *Nicht Verdienen* بــە مانــای ناڵایــەق و بێدەســەڵاتی لـە پــەیداکردنی ژەمــی رۆژانــە *Entwinden* بە هەردوو مانای هــەڵگرتن و لادان، دەبێت ئەوەیش لە یادنەکەین کە کافکا ئەم وشـە دوو مانایانە هۆشیارانە لە شـوێنێکدا بـەکاردەبات کە دەسـت نیشـان کردنـی مانـا راستەقینەکە بـۆ خوێنەر کارێکی دژوار بێت.

کافکا لە نامەکانیشیدا وەك چیرۆکـەکانی زۆر لـە وشـەگەلێکی وەك: دەشـێت، ئەگــەر، بـەڵام، بەڕواڵـەت، وا پـێ دەچێـت، لەگـەڵ ئەوەیشــدا، و ســـوودی وەرگرتــــوە، ئــارەزووی کافکـــا لـــە بەکارهێنانی ئەم وشانەدا لە پاڵ ئـەو حـەزەی بـە کرداری مـەرجی و ئیلتیزامیـەوە هـەیبووە، ئـەوە دەردەخـەن کـە کافکـا زەینێکـی پـڕ لـە گومـان، دوودڵـی، وێڵ و سـەرگەردانی هــەبوەو ئەمــەیش نیشــانەیەکە بــۆ ناســەقامگیری و شــــپرزەیی دەروونی کافکا.

نموونەیەکی تر بۆ لێکچوونی بەرهــەمی کافکـا لەگـەڵ نامـەکانیدا ناتـەواوی هـەندێك لـە هــەردوو بابەتەکەیە. زۆربەی بەرهەمی کافکا (وەك کۆشـك و ئەمریکا) ناتەواون، یان بە دان پێدانـانی خـودی کافکا بە پەلە تەواوی کردوون (وەك مەسخ، تیپی حوکمدراوەکـان و دادگـایی) و یـان لـە ناتــەواو دەچـن، وەك زۆر چـیرۆکی کـە مـرۆڤ وا هەســت دەکات هێشـتا دوا قسـەی تیـا نـەکراوەو، رەنگـە ئەم هونەری بەو جۆرە هێشتنەوەیە یـەکێك بێـت لـە رەوشـی زیرەکانـەی کافکـا بـۆ ئـەوەی بـیری خوێنەر بجوڵێنێت و زیاتر بەگەڕی بخات.

لـە نامــەکانی کافکایشـدا رسـتەی ناتــەواوی زۆرن، دەڵێیـت ئـەم تـەواو نەکردنــە نـەك تـەنیا تەکنیکیـە لـە فۆرمـی گێڕانــەوەی چیرۆکــەکان و نامەو یاداشتەکانی کافکـادا، بـەڵکو بەشـێکە لـەو دونیا زەینیەی کافکاو وەك ناوەرۆکی فیکریش لە قەڵەم دەدرێت. بەجۆرێکی دی لە دنیـای کافکـادا سـکێچ و پێکهاتـەو ونیـادی نوسینەکانی بـەرەو بابەتێکی مانادارو تەبەریمان دەبات.

هەندێك جار سنووری نێوان بونیادی شێوازەکەی و دنیای زەینی کافکادا زۆر تەسکە، بەجۆرێك کە ئەو دوو سنوورە تێکەڵ بە یەکتری دەبن و وەك وتمان گەلێك لە رستەی کافکا هەم جۆرێکن لە تەکنیك و هەم ئاماژەن بە دنیا زەینیەکەی. هەر لەم روانگەوەیە کە رۆلان بارت مانای بەرهەمی کافکا بە تەکنیك دەزانێت.

### 3-چوونە ناو دنیای زەینی‌ی کافکاوە:

"ئەی ئەو کەسەی کە دێتە ناوەوە، دەست لە هەرچی ئومێدێك هەیە بشۆ" دانتی – کۆمیدیای ئیلاهی– دۆزەخ

بلیمەتی کافکا لە خولقاندنی دنیایەکدایە کە تایبەتە بە خۆی، کە دەقێکی کافکا دەخوێنیتەوە لە ناکاودا هەست بەوە دەکەیت ئەوەی لەبەردەمتایە تەنیا دەقێکی دنیای زەین نیە کە راستەوخۆ چوویتە ناوی، دنیایەکی زۆر تایبەتی کە جیاوازە لە دنیای تۆو خەڵکانی تر، بەو جیاوازیەیشەوە دنیای خۆتە، دنیایەکە تۆ لە ناویدا یاریەکیت، بۆیە لێکۆڵینەوە لە سەردەمی کافکاو، رەگ و ریشەی ئەو فاکتەرە کاریگەرانە لەسەر بەرهەمی، تایبەتمەندی پەخشان و نووسینەکانی ئەومان بۆ روون دەکاتەوە، بەشێوەیەکی گشتی هەرجۆرە رەخنەیەکی تەقلیدی، فۆرمالیستی، دەروون ناسی، ئەفسانەیی و.. بەتەنیا دەتوانن زەمینە خۆشکەرو چەند ئامرازێکی یارمەتیدەر بن بۆ چوونە ناو دنیای زەینیی کافکاوە. هەر رەخنەیەك .. گایەك لەسەر دنیای کافکا نەکاتەوە چ ..رخێکی وای نیە، بەڵام با ئەوە لەبیر نەکەین کە دنیای کافکا، دنیایەکی روناك و ئومێدبەخش نیەو ناتوانین زەینیەت و دەروونی کافکایش بە تەندروست دابنێین. کەواتە وەك دانتی دەڵێت:

"ئەی ئەو کەسەی دێتە ناوەوە، دەست لەهەرچی ئومێدێك هەیە بشۆ"

لە نامەکانی کافکادا کۆمەڵێك مەبەست لە وردبینی، دەروشانەوە، مەبەست پێکان، شیکردنەوەو لێکۆڵینەوە و شتی تری لەم بابەتانە بەرچاو دەکەون کە خوێنەر سەرسام دەکەن، بەڵام ئەم جۆرە ئاسینانە زیاتر لە پەی پێبردنی مرۆڤی سەرخۆش یان تلیاك کێش دەچن، ئەزموونێکی ئاشنا بۆ ژمارەیەکی زۆری فێدارەکان، مەستەکان، تلیاك کێشەکان و ئەوانەی بەدەم خەوەوە دەڕۆن و لە پڕێکا لە خۆیاندا وا هەست دەکەن کە کەشفی شتێك یان مەبەستێکیان کردبێت و وا دەزانن ئەوە مانایەکی تازەی دیاردە ئاساییەکانە. بەڵام کافکا لە مەستی‌و خەوزەدەیی بە ئاگا نایەت. ئەو بەردەوام هەموو شتێك بە جۆرێکی تر دەبینێت و هەستی پێ دەکات. هەموو نامەکانی ئەوە دەردەخەن کە روانینی ئەو لە مەسەلەکان روانینێکی سوریالیستانەیە، هەر لەبەر ئەوەیشە کە هەر دیاردەیەك لە دیدی ئەوەوە دەبێتە چیرۆکێکی ئەودیو واقیع. ئەو لەنامەی یەکی ئابی *1920*دا دەنووسێت "روبەڕووی دەرگای ژووری سەرۆك دانیشتووم، سەرۆك لە دایرە نیە، بەڵام لای من سەیر نیە ئەگەر لە ژوورەکەی بێتە دەرەوەو بڵێت: "منیش تۆم خۆش ناوێت، هەر لەبەر ئەوەیشە دەمەوێت باش بم لەگەڵت"

من ئەڵێم: "سوپاست دەکەم، لەبەرئەوەی منیش بۆ ڤیەنا سەفەر دەکەم، پێویستی زۆرم بەمە هەبوو" ئەو دەڵێت: "باشە؟ کەواتە دووبارە من تۆم خۆش دەوێت و باش نابم لەگەڵت"

من ئەڵێم: "ئاه. من ئیتر ناتوانم بچمە سەفەر" ئەو دیسان دەڵێت. "نا، بەڵێ چونکە دووبارە من تۆم خۆش ناوێت بۆیە دیسان

دەمەوێت باش بم لەگەڵت" ئیتر هەر بەم جۆرە ئەم چیرۆکە بێ کۆتاییە درێژە دەکێشێت"

لە رووی دەروونییەوە کافکا نەخۆش بوو، گومان لەمەدا نییەو نووسینەکانیشی بەڵگەی ئەوەن. ئەو زۆرجار لە بارەی نەخۆشییە دەروونییەکانی خۆیەوە باسی کردوە، لە نامەی ***31*** مایسی ***1920***دا بۆ میلنا بە ئاشکرا لە بارەی نەخۆشی رۆحی خۆیەوە قسە دەکات و تەنانەت نەخۆشی لەشی (نەخۆشی سیل کە دوایی کوشتی) بە (هۆی سەرەکی نەخۆشی رۆحی) خۆی دادەنێت.

ئێمە کە باسی نەخۆشی دەروونی کافکا دەکەین و لەسەری دەوەستین لەبەر ئەوە نیە کە حوکمێکی دەروون شیکاریانە بەسەر کافکادا بدەین، تەنانەت لەبەر ئەوەیشمان نیە کە نەخۆش ئاسا نامەو چیرۆکەکانی کافکا بکەین بە نیشانەی لاوازی یا بەهێزی لایەنی هونەری بەرهەمەکانی بەڵکو تەنیا لەبەرئەوە لەسەر ئەم مەبەستە پێدادەگرین کە نەخۆشی کافکا چ کاریگەرییەکی بەسەر بەرهەمەکانییەوە هەبوە، نامەو نووسراوی کافکا بەوپێیەی کە تا ئەندازەیەك لە نەخۆشییەوە سەرچاوەیان گرتوە، بمانەوێت یان نەمانەوێت دەچنە ریزی ئەو کارانەوە کە تەفسیری نەخۆشی و لە بارەی نەخۆشییەوەن.

کافکا لە نامەی ***23***ی حوزەیرانی ***1920***دا دەنووسێت: "ئەگەر بەو شێوەیەی کە نوقمی پەشێوی دەبم نوقمی خەو ببومایە، ئێستا لە ژیاندا نەبووم" هەروەها بڕوانە نامەی دووشەمەی ***5***ی حوزەیرانی ***1920*** کە چۆن کێشەیەکی ئیداری کە دەشێت تووشی هەرکەسێك ببێت، لە دیدی کافکاوە تا سەرئێسقان کاریگەری لەسەر ژیان هەیە، دێوی ترسناکی دیوان سالاری کە لە رۆمانی دادگایی و کۆشك و چیرۆکەکانی وەك لەبەردەم یاسادا.. دەبینین، لە ژیانی تایبەتی کافکاو لەناو نامەکانیشیدا بەرچاو دەکەوێ، کافکا دنیا بە دیوانێکی گەورە دەبینێت کە هەموو لەژێر چنگیدا ئەسیرن، ئەو توانای گەورەی دیوان سالاری بە ئەندازەی جوزێف. ك بە جیدی دەگرێت. بڕوانە نامەی ***31*** حوزەیرانی ***1920***ی کە تیایدا باسی ئەوە دەکات کە بۆ ناتوانێت ژوان لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا بگرێت، ئەو داوای دڵدارەکەی رەت دەکاتەوەو لە چوون بۆ لای خۆی دەگرێت، بە بیانووی ئەوەی کە بۆ وەرگرتنی مۆڵەت لە ئیدارەکەی ناتوانێت درۆ لەگەڵ سەرۆکەکەیدا بکات، بێگومان کافکا لە بەر هۆیەکی ئەخلاقی نیە کە ناتوانێت درۆ بکات، بەڵکو تەواو لەبەر ترس و بێتوانایی ئەوە لە فریودانی دیوان سالارەکەدا، ئەو لە فریودانی دیوان سالارێك دەترسێت.

لە نامەی ***18*** ئەیلولی ***1920***دا، کافکا باس لە هەستی نەرمی و هەرەشەی ناشناسی دەکات و دەنووسێت: "ژیانی من، وجودی من، هەمووی هەرەشەی ژێر زەوییە، ئەگەر بوەستێت، منیش دەوەستم –ئەم هەرەشەیە– شێوەی بەشداری کردنی منە لە مەیدانی ژیاندا، ئەگەر ئەو بوەستێت منیش دەست لەژیان هەڵدەگرم".

لە نامەیەکی تریدا ئەوە دەردەخات کە لە دنیای تەنیاییدا گەلێك شتی سەیر هەن و سەیرترین شتیش ئەوەیە کە مرۆڤ هەموو رۆژێك لەخەو بە ئاگابێت!

کافکا لە نامەی ***10***ی ئابی ***1920***یدا بۆ میلنا باس لە ئەزموونێکی عاتیفی خۆی دەکات، لەگەڵ کچێکدا بەڵێنی جێژوانیان داوە، کەچی کە بۆ شوێنەکە دەچێت کچەکە لەگەڵ یەکێکی تردا دەبینێت، لەم بارەیەوە کافکا دەنووسێت:

"باشە، ئەمە ج جیاوازیەکی بۆ من نەبوو، من لە هەموو دنیا دەترسام و بەو پێیە ترسێکم لەو پیاوەیش هەبوو، تەنانەت ئەگەر لەوێیش نەبوایە، من هەر لێی دەترسام". لە پاڵەوانەکانی کافکادا گەلێك لەم تاقیکردنەوانە هەیە: دەستگیران یان دلدلری ئەو قارەمانانە هەمیشە لەلایەنی کەسی سێیەمەوە هەڕەشەیان لێدەکرێت.

نامەکانی کافکا زیاد لە بەرهەمەکانی تەعبیر لە کەسایەتیە لەرزۆکەکەی خۆی دەکەن، ئەو هەمیشە لە حاڵەتی پەیمانی دەست گیرانی بەستن و هەڵوەشاندنەوەیدا بوەو نەیتوانیوە بڕیارێکی بنەبڕ لەو بارەیەوە بدات. گیروگرفتی ژیانی سێکسی ئازاری پێ دەگەیاند، لە بەرهەمەکانیدا خۆشەویستی راستەقینە یان پەیوەندیە ئاساییەکەی نێوان ژن و مێرد بەدی ناکرێت، لەم روەوە بێ توانایی و ناجۆری جینسی لە دنیای کافکادا جێگای رامان و سەرنجە، ئەو ناجۆریە لەو نامانەدا کە بۆ میلینای ناردوە زۆر بە چاکی دەردەکەوێت.

لە سەرەتای نامەنووسینیدا بۆ میلنا، بە راناوی -ئێوە- دەیدواند، وەك پێش بینیش دەکرێت وردە وردە ئەم راناوە گۆڕا بۆ راناوی کەسی دووەمی تاك (تۆ). بەلام سەیر ئەوەیە دوای ماوەیەکی پڕ لە شۆڕوشەوقی عاشقانە کوت و پڕ راناوەکە بوەوە بە -ئێوە-

کافکا لە نامەکانیا پێشنیارەکانی میلنا بۆ پێك گەیشتن بە ترسێکی زۆرەوە رەت دەکاتەوەو خۆی لێ دەپارێزێت، کەچی دوای ماوەیەکی تر ... لەسەر بینینی دادەگرێت، ئەو دنەی میلنا ... دات بۆ ئەوەی هەموو رۆژێك نامەیەکی بۆ بنووسێت، کەچی لە پڕا داوای لێ دەکات کە ئیدی نامەی بۆ نەنووسێت و خۆیشی لە دوا نامەی مارتیدا دەنووسێت: ".. هەرچۆنێك بێت ئێوە دەزانن کە من چەندە لە نامە بێزارم" ئەمە پیاوێك دەیلێت کە نامەو نامەکاریەکانی لەگەڵ دەست گیرانەکەی پێشویدا نزیکەی دوو بەرگی ئەستوور دەبن.

### سەرنج:

کۆتایی ئەم وتارە رای تایبەتی نووسەرە فارسەکەیە لەسەر دەقە وەرگێڕاوەکانی کافکا بۆ فارسی و رەخنە گرتنە لە شێوەی وەرگێڕانی لە هەندێکیان، کە بۆ ئێمە پێویست نەبوو. بۆیە وازمان لێهێنا.

### سەرچاوە:

مانگ نامەی أدبیات و فەلسەفە ژمارە **33** سالی **1379**.

# دڵێکی نهێنی درکێن

■ ئێدگار ئالان پۆ

● و. لە ئینگلیزیەوە: د. هیوا عومەر ئەحمەد



ئێدگار ئالان پۆ

ئێستاش هەر مرۆڤە تورەکەی جارانم، بەڵام پێم مەڵێن شێت ڕاستە نەخۆشی‌یەك تووشی هەستم هاتووە، بەڵام تێیوڵنین و هەستی نەشێواندووم بە پێچەوانەوە، هەستی بیستنم هێندە تیژ بووە، گوێم لە هەموو خرتەو فرتەیەکی زەوی و ئاسمانە، زۆر جار شتی ناو دۆزەخیش ئەبیستم، کەواتە ئیتر من کەی شێتم؟ دە گوێم بۆ ڕادێرن. با بەرپەری دروستی و هێمنی‌یەوە هەموو بەسەرهاتەکەتان بۆ بگێڕمەوە:

نازانم یەکەم جار چۆن ئەم بیرەم بۆ هات، ئیتر بوو بە بیرکردنەوەی شەوو ڕۆژم. پیرەمێرێکی دەوڵەمەندم خۆش ئەویست. بە بیرم نایەت بۆ تەنها جارێك هەڵەیەکی لەگەڵداکردبم یان سەرزەنشتی کردبم. هەرگیز دڵم بۆ ماڵ و سامانەکەی لێ نەدابوو. وەکو بیری لێ ئەکەمەوە، حەزم لە چاوە شینەکانی کردبوو کە لەچاوی هەڵۆ ئەچوون. کاتێ لێم ڕائەما، خوێنم ئەکەوتە قوڵپ دان، وورده وورده ئەو بیرە لە سەرم دا گەڵاڵە بوو کە ئەم پیرە بکوژم. بۆ ئەوەی بە یەکجاری لە داوی چاوی ڕزگار بم،

لێرەدا بە شێتم نێ ئەگەن! بەڵام شێت چی ئەزانێ؟ خۆ منتان بینی چ بڕیارێکی ژیرانەم دا، ئێستاش ئەزانن کە چۆن بە دووربینی و بە ئاگایی و ئەشڵەژانەوە کەوتمە جێبەجێ کردنی بڕیارەکەم. هیچ کاتێ لەوەوبەر وەکو ئێستا بەزەییم پێدا نەئەهاتەوە، هەموو نیوەشەوێ درزێکی دەرگاکەیم ئەکردەوە. زۆر بە هێواشی، لەمپایەکی چوار لا قەپاتی وام ئەبردە ژوورەوە. گەر بت دیمایە چەند بە زۆرزانی سەرم ئەبردە ژوورەوە. دەستت ئەکرد بە پێکەنین. ئاگاداری ئەوە بووم ئەوەك بێدلری بکەمەوە، چ شێتێ وا بە ژیرانە ئەجووڵێتەوە؟ زۆر بە ئاگاییەوە درزێکم ئەخستە قەپاغی لامپاکە، تاکو تیشکێك ئەکەوتە سەرچاوە هەڵۆیییەکانیەوە. حەوت شەو ئەمە ئیشم بوو. بەڵام چاوەکانیم بە کراوەیی نەبینی تاکو بڕیارەکەم جێبەجێ بکەم، چونکە من ئەم ئەویست لەدەست پیرەمێردەکە ڕزگام ببێ، بەلکو لەدەست چاوە شەڕانییەکانی.

هەموو بەیانییەکیش وەك هیچ نەبووبێ، ئەچووم بۆ لایو لەگەڵیا ئەدوام و لەناخی دڵەوە بە ناوی خۆیەوە بانگم ئەکردو لێم ئەپرسی خەو ێشەوی چۆن بوو: ئیتر مەگەر پیرەمێردێکی نقدزان بێ دەنا چۆن گومان ئەکات کە من هەموو نیوە شەوێ بە سەرییەوە ڕائەوەستم. شەوی هەشتەم زۆر لەسەرخۆ دەرگاکەم کردەوە، میللی کاتژمێرەکە کەوتە پەلە لەوەو پێش هەستم بەو هەموو هێزو زیرەکییەیی خۆم نەکردبوو، هەست بە سەرکەوتن دەروونی داگیر کردبوورم، من بەم جۆرە دەرگاکەم ئەکردەوە، ئەویش هەر خەویشی بەو کارو بیرەی منەوە نەئەبینی. لە ژێرەوە پێدکەنینم بەم کارە ئەهات، کێ ئەڵێ گوێی لێم نەبووە؟ دەنا بۆچی تلێکیدا. لەوانەیە وا بزانێ لەگەڵ تل دانەکەیدا گەڕابمە دواوە، نەخێر ژوورەکە هێندە تاریك و نوتەك بوو نەیئەتوانی درزی دەرگاکە ببینێ، تا ئەهات دەرگاکەم زۆرتر ئەکردەوە،خەریك بوو درزی قەپاغی لەمپاکە گەورەتر بکەم، لە دەستم دەرچوو، درزێکی زۆر فراوانی تێ کەوت، ڕووناکییەکی زۆر کەوتە سەر دەم و چاوی. ڕاپەڕی و لەسەر جێگەکەی دانیشت و هاواری کرد:—

—/ئەوە کێیە ؟!/

ورتەم لێ نەهات، وەك بت ڕاوەستاوم جووڵەم لە خۆم بڕی، تا ماوەیەك پاڵ نەکەوتەوە، گوێی هەڵ خستبوو شتێ ببیستێ.

ناڵەیەك هاتە گوێم، ناڵەی ئازارو گرفتی نەبوو، نەخێر، ئەو دەنگە کپە بوو کە لە ناخی مرۆڤێکەوە هەڵ ئەستێ، کە ئەشکەنجەو ژان ژەنگیان بە گیانی هەڵ هێنابێ. دەنگەکەم زۆر باش ئەناسی. هەموو شەوێ، ئەو دەنگە، کاتێ لافاوی خامۆشی هەموو لایەکی دائەپۆشی، لە ناخمەوە بەرز ئەبووەوە. چ ناڵەیەکی ترسناك بوو، زلمی خەم و ژانەکانمی ئەهێنایە سوێ، بە پیرەمێردەکەش ئاشنایەو بەزەیی پێدا ئێتەوە. ئەمزانی لەو کاتەوە تلەکەیدا، خەوی زڕاوەو لە دڵی خۆیدا ووتویەتی:—

—/لەوانەیە دەنگی بای ناو دووکەڵ کێشەکە یان خرتەو فرتەی مشکێ بێت/.

بەڵێ دڵی خۆی بەم قسانە خۆش دەکات، ئەشزانێ بێ کەڵکن چونکە مەرگ وەك تارماییەکی سەرتاپا ڕەش لە بەردەمیدا وەستاوەو ئەیەوێ گیانی قۆچە بکات. بەڵێ چارە گرانی ئەو تارماییە خەوی لێ زڕاند بوو، دەنا باوەڕ ناکەم هەر ئاگای لە درزی دەرگاکەو سەری من بووبێ.

چاوەڕوانی یەکەم دڕێژەی کێشا، هەستم نەکرد پاڵ کەوتبێتەوە، بڕیارم دا دڕزێك بخەمە قەپاغی لەمپاکە، گووزە تیشکێکی وەکو داوی جاڵجاڵۆکە، کەوتە سەر ئاستی چاوی چاوی کرابۆوە، ئەبڵەق بوو بوو، بەڵێ چاوی زۆر کرابووەوە. کە چوومە ڕێکی سەری و تەماشام کرد. شڵەژام. زۆر لێی وورد بوومەوە، چاوی شینێکی کاڵ، تەمێکی سەیری بەسەرەوە بوو، ئەو تەمەی تاکو مۆخی ئێسقانی سمی بووم. لە دەم و چاوی بەولاوە هیچی ترم نەبینی، ڕووناکییەکەم ئاراستەی پنتە ئەفرەتییەکە کرد. ئەوەی ئێوە بە شێتی تێ ئەگەن، لە هەست و ژیری بەولاوە زیاتر نییە. گوێم لە دەنگێکی کپ و خێرای وەکو چرکە چرکی کاتژمێر بوو، کە کاتێ لەناو لۆکەدا پێچرابێتەوە. ئەو دەنگەم چاك ئەناسی، ترپەی لێدانی دڵی پیرەمێردەکە بوو، شێت گیر بووم. هەر چۆن ئەفسەرێکی سەربازی لە کاتی جەنگدا سەربازەکان بەرەو مەیدانی شەڕ هەڵ ئەنێ.

بێ جووڵە وەستام، لە سەرخۆ هەناسەم ئەدا، ئەمویست تیشکەکە لەسەر چاوی بهێڵمەوە. ترپەی لێدانی دڵەکەش زۆرترو خێراتر ئەبوو، ئەتووت ترسی پیرەمێردەکە گەیشتووەتە ئەوپەڕی، تا ئەهات بەرزرت ئەبووەوە.

لێم تێ ئەگەن چی ئەڵێم؟ پێم ووتن ئێستاش مرۆڤە تووڕەکەی جارانم، لەو نیوەشەوەدا، لە نێو خامۆشییە تۆقێنەرەکەی ئەم ماڵەدا، ئەو دەنگە هێندە سەیر بوو، جڵەوی ووێست و ئارەزووی لە دەست بەردام، بەڵام تا ماوەیەکی تر بێ جووڵە وەستام و هیچم نەکرد، دەنگەکەش تا ئەهات بەرزتر ئەبووەوە، وام بە بیردا هات دڵەکە شەق ئەبات. دوو دڵی دایگرتم، کێ ئەڵێ دراوسێکان گوێیان لەم دەنگە نییە. کار لەکار ترازا، قریشکانم و خۆم کرد بە ژوورەکەداو هەموو ڕووناکی لەمپاکەم کردەوە، پیرەمێردەکە ڕاپەڕی و قریشکاندی. لەچاو تروکاندنێکدا ڕام کێشایە سەر زەوییەکەو پێخەفە قوورسەکەم ڕاکێشایە سەری، خەندەیەکی سەرکەوتووانە، کەوتە سەر لێوم دڵی تا چەند خولەکێ لێیدا، بەڵام بە کپی. ئەمزانی ئەو دەنگە کپە ناگاتە دراوسێکان، ئەشڵەژام، کە دڵەکە لە لێدان کەوت، پێخەفەکەم لابردو لاشەکەیم پشکنی، بەڵێ مردبوو، لە حەوت سالان ڕاست بوو بووەوە. بۆ دڵنیایی چەند خولەکێك دەستم خستە سەر دڵی. بەڕاستی مردبوو، ئیتر لە داوی چاوی ڕزگارم بوو.

گەر تا ئێستا بە شێتم ئەزانن، گەر زانیتان چەند بە زیرانە لاشەکەیم شاردەوە، ئیتر پێم ناڵێن شێت، شەو زۆری نەمابوو، دەستم بە کار کرد، لە پێش هەموو شتێکدا ڕووتم کردەوە، قاچ و دەست و سەرم بڕی. سێ خشتم لەسەر زەوی ژوورەکە هەڵکەندو پارچەکانیم گۆڕ کرد، خشتەکانم وا بە ڕێکی خستەوە جێی خۆی، هیچ چاوێ، بگرە چاوی ئەویش گومانی پێ نەئەبرد. هیچ پەڵەیەکی خوێن جێنەمابوو تاکو پێویست بە شتن بکات، هەموو شتێ بڕایەوە ... ها ... ها ... ها.

کاتێ لێ بوومەوە کاتژمێر چوار-ی بەیانی بوو، بەڵام جیهان وەکو نیوەشەو ئەنگووستە چاو بوو. لەگەڵ لێدانی زەنگی کاتژمێرەکەدا، لە دەرگا درا، چووم بیکەمەو، لە هیچ نەترسام. سێ پیاو خۆیان کرد بە ژووردا، وەك خۆیان پێ ناساندم، ئەفسەری پۆلیس بوون، دراوسێکان گوێیان لە هاوارێ بووە و بۆ ئەم مەبەستە هاتبوون. لێکۆڵینەوە دەستی پێ کرد، لە پۆلیسخانەش پرسیارێکی زۆریان لێ کردم.

ئەفسەرەکان هاتن ماڵەکە بپشکنن، پێکەنینم ئەهات، جا لە چی بترسم؟ پێشوازیم لێ کردن. وتم پیرەمێردەکە لێرە نییە، شەو بە تەنیا بووم لە خەودا قریشکاندبووم. هەموو ماڵەکەیان پشکنی، ڕێم دان بە ئارەزووی خۆیان بگەڕێن، لە دوایدا بردمنە ژوورەکەیەوە، جل و بەرگ و پێخەفەکەیم نیشان دان، هیچ نەشێوابوون. بۆ دڵنیایی چەند کورسییەکم هێنایە ژوورەکەوە، داوام لێ کردن کەمێ بحەوێنەوە، کورسییەکیشم بۆ خۆم هێنا، لەسەر ئەو شوێنە دانیشتم کە لاشەکەیم تیا گۆڕ کردبوو. ئەفسەرەکان هێمن بوونەوە، هەڵس و کەوتم دڵنیایی کردنەوە، دانیشتن. پرسیاری شتی گشتییان ئەکرد، منیش وەڵامم ئەدانەوە. بەڵام زۆری نەبرد، شڵەژام، حەزم کرد هەڵسن بڕۆن. سەرم کەوتە ژان کردن، گوێم ئەزرنگایەوە، زرنگانەوەکە توندتر ئەبوو، زۆر قسەم ئەکرد تاکو زرنگانەوەکە لەبیر خۆم بەرمەوە، بەڵام بەردەوام بوو، بۆم دەرکەوت کە گوێم نازرنگێتەوە، ڕەنگم هەڵبزکا، بۆ شاردنەوەی ئەمە بە دەنگی بەرزو بە پەلە قسەم ئەکرد. دەنگەکە تا ئەهات بەرز ئەبووەوە، چی بکەم باشە؟ دەنگێکی نزمی کپ و خێرا وەکو چرکە چرکی کاتژمێرێك کە لە لۆکەوە پێچرابێ وابوو. هەنسکێکم هەڵکێشا. وا دیاربوو ئەفسەرەکان هەستیان پێ نەکردبوو. دەنگەکە تا ئەهات بەرزتر ئەبووەوە، هەستامە سەر پێ، بە دەنگێکی بەرز قسەم ئەکردو دەستم لەگەڵیدا ئەجووڵاند. دەنگەکەتا ئەهات بەرزتر ئەبووەوە. بۆچی هەڵناسن بڕۆن؟ کەوتمە ئەم سەرو ئەوسەری ژوورەکە، دەنگەکە تا ئەهات بەرزتر ئەبووەوە. خوایە من چی بکەم؟ کەوتمە وڕێنەو قسە بزرکاندن. سوێندم ئەخوارد، کورسییەکەم خستە جووڵە جووڵ، دەنگەکە تا ئەهات بەرزتر ئەبووەوە ئەفسەرەکان وەك ئاگایان لە هیچ نەبێ، لە قسەو خەندەی خۆیان نەئەکەوتن.

تۆ بڵێی گوێیان لە هیچ نەبووبێت؟ خوایە هاوار گوێیان لە هەموو شتێ بووەو گومانیان بردووە، چاك ئەزانن چی بووە. بەڵام ئەیانەوێ ئەشکەنجەم زۆرتر بکەن. کێ بەرگەی ئەم بارە ئەگرێ؟ حەوسەڵەم نەما، چی تر بەرگەی خەندە دوو ڕوویییەکەیان ناگرم. دەنگەکە تا ئەهات بەرزتر ئەبووەوە، قریشکاندم:–

–[چەپەڵینە، بەسە دوو ڕوویی. من ئەم کارەم کردووە. لێرەدا ئەو خشتانە لابەن، ئەمە دەنگی دڵە نەفرەتییەکەیەتی].

سەرچاوە:

***Edgar Allan poe: stories by laura bench1961*** چاپی ***page 25–17*** نیویۆرك/

# سێ پارچە پەخشان

■ *پابلۆ نیرۆدا*

● و. لە فارسییەوە: ب. سەمەند




## خەیاڵ

چیت لەگەڵما کرد، وا ئێستا لە پشت لاولاوەکانی باخەکەوە،

لەسروەی گوڵەکانی بەهاردا بەدوا یادی تۆدا وێڵم.

روخسارتم لەیاد کردووە؟ دەستەکانت؟ ماچە ئاگرینەکانتم نایەتەوە یاد؟

چیت لەگەڵما کرد، وا ئێستا پەیکەرە بەردینە بێدەنگ و خەوتووەکانی

ناو باخەکەم خۆشدەوێ.

دەنگتم لەیادکردووە، دەنگی هەمیشە شادت، چاوەکانتم لەیادکردووە.

ئێستا بەعەتری گوڵ مەستم، بەخەیاڵ و یادی تۆوە بەندم،

نوقمی ساتەکانی تۆم، ئەفسوس کە ئەو ساتانەم نایەتەوە یاد.

چۆن بریندار و گرفتاری دەردی تۆم.

وەك لاولاوی بەدیوارا هەڵخزاو لە ئامێزی ئەولزشەکانتدا،

عیشقتم لەیادکردووە، بەڵام لە پشت هەر پەنجەرەیەکەوە بەدوایدا

وێڵ و گەڕیدەم. چیت لەگەڵما کرد، وا ئێستا گشت هاوینێ

عەتری داخی باخچەکان ژان دەخاتە دڵمەوە. چیت لەگەڵما کرد،

وا ئێستا بەردەوام بەدوا هەوەسێکدا وێڵم، بەدوا ئەستێرە سەرگەردانەکاندا، بەدوا خەیاڵدا.

* * *

## بیرەوەری

هێدی هێدی بیرەوەرییەکانم کاڵدەبنەوە. لەپشت کۆڵانێکی ئاشناوە تێدەپەڕم، بەشیمانیە شپرزەکانی خەیاڵم وەلاوە دنێم. بەچاوی نووقاوەوە دەوەستم، لێوانلێوم لەگەمەی عەتری شتەکانی ڕابردوو، ئاوێزانی کورتم لەگەڵ ژیاندا دەهێنمەوە یادی خۆم. هەر دوێنێ بوو کە ژیام.

ئەمڕۆ لەگەڵ...، لەچاوەڕوانیی نەسیمی هەوەسبازی ترس و ئومێددا دانیشتووم. مۆرێکی کاتیی بە ڕوخسارەوەیەو بێ هیچ هەست و سۆزێك من بەلای خۆیدا رادەکێشێت.

دوێنێ، درەختێکی بەردار بوو کە خۆم خزاندە ژێر سایەیەوەو لەنێو بیرەوەرییەکانی خۆمدا ون بووم.

لەناکاودا دەڕوانم، بە سەرسوڕمانەوە دەبینم کاروانێکی درێژ لەکۆڵانەکە تێدەپەڕێت. ڕێبوارە ماندوو و خەواڵووەکان بەچاوانی پڕ لە بیرەوەری و خەیاڵاتەوە لەبەرخۆیانەوە گۆرانییەکانی ڕابردوو دەڵێنەوە. دەزانم بۆچی کەوتوونەتە ڕێ. بەتەنها لە پێناوی وەستاندا. قفڵی بێدەنگییان لەلێوی خۆیان داوە. بەواقوڕمانەوە دەڕواننە جەژنی ئەستێرەکان. دەزانم کە دواتر ئەوانیش چاوانی واقوڕماویان دەنووقێنن تا دیسانەوە ڕابردوویان ببیننەوە.

منیش هەر بەم ڕێیەدا دەڕۆم. بەنیگایەکی پڕ حەسرەتەوە، چاوەڕێی ڕۆژە دوور دەستەکانم. دەمەوێ دەموچاوم لە ئاوەکانی زەمەن بسڕمەوە، بەڵام بێهوودەیە.

ئەو ئاوە سازگارەی پێی دەگەم، لە بەلەمی ئاوەکانی دڵمدا زیندانە، دەزانم سبەینێ دەستە بیرەڵۆك و تەنیاکانم لەو ئاوانەدا ڕۆدەچێت.

# رزگارکەر

لەنائومێدیی خەیاڵمدا، بەدوا رزگارکەرە ونبووەکاندا دەگەڕێم،
سەرەتا نەمدەزانی لەکوێن. بەڵام ئەمڕۆ لەمابەینی تاوێرە بەرزەکان و
پێچ و پەناکانی ژیانەوە دەیانبینم بەڵاما تێدەپەڕن. بەڵێ، بەناکامی و
بێهوودە دەمەوێ ئەو سیفاتانەیان تیا بدۆزمەوە کە تیایاندا نییە.
ئای کە نائومێدو ماندووم لەدەست ئەم رزگارکەرانە.
کەسانێکم دێتەوە یاد کە تۆفانیش
نایاننووشتێنێتەوە، کەسانێک کە لەژێر زەبری یەکەم قامچیدا
دەم هەڵناهێننەوە، کەسانێک کە چیدی پێناکەنن و لەم
دەیجوورەدا، ژیان لەلایان چون چاڵێکی
گەورەی شێدار و تاریک و بێ هەتاوە.
چیدی ئەم کەسانە نابینم، ئەو رزگارکەرانەی کە سەرشاربووم
لەشەوق و تاسەیان.

سەرچاوە:

مجلة (بخارا) شمارە 11 فروردین‌وار دیبهشت 1379.

# وەڵامی فۆكۆ بۆ سارتەر

■ هوشیار ئەنساری فەر

● و. لە فارسییەوە: محەمەد كەریم

(بەلای ئەو كەسانەی كە لە بواری بیرو فەلسەفەی سەدەی بیستەمدا توێژینەوەو لێكۆڵینەوە دەكەن، ناوی كەسانی وەكو میشل فۆكۆ و ژان پۆل سارتەر زۆر ئاشنایە. ئەم دوو بیریارە هەردووكیان لە ماوەیەكی مێژووی ژیانی سیاسیو فەلسەفەی خۆیاندا كاریگەرییەكی زۆریان لە زەینی خەڵكی جیهان كردووە. لەسەرەتای جوڵانەوەی خوێندكارانەدا لە شەستەكانەوە هەتا ئێستا ئەم كاریگەرییە قابیلی دەرك پێكردن و تێگەشتنە. لەم گفتوگۆیەی كە لەبەردەستاندایە، هەوڵ دراوە روانگەی ئەنتۆلۆجی و ئەبستمۆلۆژیی ئەم دوو فەلسەفەیە بۆ حەقیقەت و ژیانی مرۆڤ و جیهانی دەوروبەر روون بكرێتەوە)

میشل فۆكۆ لەسەر یەكێك لە پڕ كەندو كۆسپترین كەنارەكانی مێژووی ئەندێشەی خۆرئاوا وەستاوە. هەڵبەتە ئەگەر بتوانرێت جێگایەكی مێژوویی بۆ كەسێكی وەك فۆكۆ دابنرێت كە بەدژایەتی كردنی مێژوو ناوبانگی دەركردووە. ماوەی سەرهەڵدانی فۆكۆ، لەگەڵ ماوەی دوای جەنگی جیهانی دووەم، هاوزەمانە لەگەڵ بە لوتكە گەیشتنی دەسەلاتی ستالین. سەر بەرزكردنەوەی ئەورووپای زاماری جەنگ، دەستپێكی پێشبڕكێی ئەتۆمی ویلایەتە یەككگرتوەكانی ئەمریكاو یەكێتی سۆڤیەت، كەرتبوونی بیری ماركسی بۆ مااویزم و تیتۆیزمو... بە گۆڕ بوونی شەماڵی سەربەخۆییخوازی كۆلۆنییەكانی پێشوو و بێداربوونەوەی جیهانی سێیەمو... لەپێش هەموو ئەمانەشدا، قەیرانی قووڵی زانستە مرۆییەكان لەو كاتەدا كێشەیەك بوو، بیریارێكی وەكو فۆكۆی هان دەدا بۆ وەڵامدانەوە. فەلسەفە وەك بوارێك لە مەعریفە كە بوارەكانی دیكە تیایدا خوازیاری یەكێتیەكی نارمانی بوون، لەناوخۆیدا دوچاری

بومەلەرزە ببوو. بزوتنەوە ئەدەبی هونەریەکان یەک بەیەک، دەسەڵاتەکانی فەلسەفەیان گرتە دەست و بەرەو بواری سنوردراوی فەلسەفەی زانستیان راونا. لەو ماوەیەدا کەسانی وەکو (فایرابەندو کوهـن) فیشەکی رەحمەتیان نا بە سنگی یەکێك لە گەرمترین و چالاکترین سەردەمەکانی بیری مرۆڤایەتیەوە. بەیەک دەربڕین، جیهان ببوو بە جیهانێکی نیچەیی. بەهاکان لەپاڵ دژە بەهاکانەوە، عەقڵ شانبەشانی شێتی، هەر شتێك لە شانی هەر شتێکەوە ریزبوو و هەموان لەچاوەڕوانیی راپەڕینێکدا بوون کە رەنگە ئەمجارە زانیبێتیان نایەت و فەیلەسوفی کۆچکردوو لەساڵی *1900* (واتە نیچە) جارێکی دیکە لە سەرەوەی ئاسۆی بیریارلندا وەستاو قسەی لەسەر زەردەشت کرد.

لەم نێوانەدا سارتەر لەو کەسانەیە کە هەوڵیاندا کەم تازۆر بەپشت بەستن بەهەمان شێوازە کۆنەکان، بەشێك لەو قەیرانانە چارەسەربکەن. هەوڵی فراوانی سارتەر بۆ رەخنەگرتن لە عەقڵی دیالەکتیك لە پێناوی سازاندنی زیهنی دیکارتی لەگەڵ مێژوودا گەواهی ئەم قسەیەیە. لەلایەکی دیکەوە و لە ئاقارێکی دیکەدا کەسانێکیش هەبوون کە بونیادەکانیان خستە ژێر پرسیارەوە. تیزی مەزنی فۆکۆ بۆ پرسیارکردن لەدایك ببوون و کاریگەری و سنوردارییەتیەکانی خودی مێژوو و خودی زیهن نمونەیەکی نایاب و بەبایەخی ئەم جۆرە ئاراستانەیە. لەم رووەوە مشتومڕو گفتوگۆی سارتەری مرۆڤ لەگەڵ فۆکۆی مرۆڤ گفتوگۆی دوو کەس یان دوو نەوە نییە، بەڵکو مەیدانێکە بۆ رووبەڕووبونەوەی چارەنووسسازی دوو جۆرە ئەپستمۆلۆژیا لەگەڵ یەکتریدا. ئەم گفتوگۆیەی کە دەیخوێنینەوە لەلایەن (ئیلکباخ)ەوە لەگەڵ فۆکۆدا ئەنجامدراوە. سەرەتا لە بڵاوکراوەی *La Quinzaine litteraire* بڵاوبۆتەوە.

***جەنابی میشێل فۆکۆ دەڵێن -رەنگە بەدەر لە خواستی خۆت- کە تۆ فەیلەسوفی، بەلای تۆوە فەلسەفە چییە؟**

**فۆکۆ:** سەردەمێك هەبوو -سەردەمی سارتەر و مۆلۆپۆنتی- کە سەردەمی گەورەی فەلسەفەی هاوچەرخ بوو. لەو سەردەمەدا دەقە فەلسەفی و تیورییەکان پێویست بوو بێ چەند و چۆن بڵێن کە ژیان و مردن و جنسیەت چییە، خودا هەیە یان نەخێر، پێناسەی ئازادی چییە، لە بەرامبەر کەسانی دیکەدا دەبێت چۆن رەفتار بکرێت و لەم بابەتە قسەوباسانە... پێدەچێت ئەم جۆرە فەلسەفەیە چیتر کارایی نییە و ئەگەر لەناویش نەچوویێت، بەلای کەمەوە پەرش و بڵاوبۆتەوە. جگە لەمەش پێدەچێت کە کۆمەڵێ کاری تیۆری هەن کە بەشێوەیەك دەکەونە ئەنیشتی یەکترییەوە. تیورە -یان هەمان چالاکی فەلسەفی- بەرهەمی چەند مەیدانێکی جیاوازە کە لەیەك جیان، چالاکی تیۆری هەیە کە بەرهەمی مەیدانی بیرکارییە، چالاکی تیۆری هەیە



که بەرهەمی مەیدانی زمانناسی یان ئەفسانەناسی یان مێژووی ئاینەکان یان بەرهەمی خودی مێژووە. دوا قسە ئەوەیە کە ئەم هەمە جۆری کاری تیۆریە، بۆتە مەیدانی ژیانی فەلسەفەیەك کە هێشتا سەبارەت بە خۆی تاکە بیرپارو یەکێتیەکی وتاری نییە.

**لە یەك جیابوونەوەی نێوان ئەم دوو ساتەوەختە کەی روویدا!!**

**فۆکۆ:** لەنێوان ***1950*** و ***1955*** بوو، لە کاتێکدا کە سارتەر بەرەسمی لە شتێك دوور کەوتەوە کە دەبێ بە گومان لێکردنی فەلسەفی ناوبەرێ، دواجار کەچالاکی فەلسەفی خۆی لە رەفتاری سیاسیدا بەرجەستە کرد.

**لە کۆتایی کتێبەکەی خۆتدا واتە (ئەزمی شتەکان) نوسیوتە مرۆڤ، نە کۆنترین مەسەلەی مەعریفەی مرۆڤە نە نەمرترین، بە قسەی تۆ مرۆڤ داهێنراوێکە کە ئۆنتۆلۆژیای بیری ئێمە باس لە دواکەوتن و رەنگە بە ئەنجام گەیشتنی کاری ئەو بکات. ئەمە لەو رستانەیە کە زیاتر لەوانی دی خوێنەرانی سەرسام کردووە. بەڕای تۆ مێژووی لەدایك بوونی مرۆڤ لە فەزای مەعریفەدا کەی بووە؟**

**فۆکۆ:** سەدەی نۆزدە، سەدەی ژمارەیەك داهێنانی زۆر گرنگە، وەکو عەقلی -بایلۆژیو (بەرقاتیس). هەروەها سەدەیەکە کە تیایدا زانستە مرۆییەکان داهێنرا. داهێنانی زانستە مرۆیەکان دەریدەخست کە مرۆڤ بۆتە بابەتی . عریفەیەکی شیاو. مانای ئەمە دروست ـردنەوەی مرۆڤ بوو وەکو بابەتێکی مەعریفە. لە هەمان کاتدا سەدەی نۆزدە، مەیدانی ئومێدو خەونی ئەفسانەیەکی گەورەی ئەوەی دی ناسی بوو. ئەوەی کە مەعریفەی ناوبراو بە شێوەیەك هەبێ کە بە خۆیەوە ئازادی مرۆڤ مومکین بێت ئازادی مرۆڤ لە تەواوی نامۆییو ئەو ناچاریانەی کە لەدەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤە، بەشێوەیەك کە لەسایەی ئەو مەعریفەیەدا کە سەبارەت بەخۆی هەیەتی بتوانێ دووبارە یان بۆ یەکەم جار خاوەنی دەسەڵاتی خۆی بێو خۆی گەورەی خۆی بێ.

بەدەربڕینێکی دیکە، مرۆڤ بوو بەبابەتی مەعریفە بەو نیازەی کە ببێتە زیهنی ئازادو ببێ بە خۆی.

لەگەڵ ئەمەشدا ئاوا هاتە پێشەوە - لەبەرئەوەش دەڵێم مرۆڤ لەسەدەی نۆزدەدا لەدایك بوو- بە ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوانە دەربارەی مرۆڤ و لەبەرچاوگرتنی وەکو بابەتی شیاوی مەعریفە رووداوێکی زۆر گرنگ روویدا: ئەم مرۆڤە بەناویانگە، ئەم سروشتە ئینسانیە، ئەم ناوەرۆکە ئینسانیە یا ئەم سیفەتە گەوهەرییە ئینسانیە، هەمیشە بەنادیاریی (بەکەشف نەکراوی) مایەوە.

بۆنموونە کاتێك یەکێك دەستی دایە شیکردنەوەی دیاردەی شێتی یان پەرێشانی دەروونی، بەرهەمی کارەکەی بریتی بوو لە دۆزینەوەی شتێك بەناوی نەست (لاشعور). نەستێك کە بە تەواوی لەبەردەم شەپۆلی غەریزەکان و تەکانەکاندا بوو، ئەو نەستەی کە کارەکەی لەسەر بنەمای چەند کردارو ئاسۆیەك بوو کە هەرگیز پەیوەندی بە پێشخستنی مرۆڤەوە نەبوو بۆ گەوهەری مرۆڤ، هەرگیز پەیوەندی بە ئازادیو بوونی مرۆڤەوە نەبوو، ئەونەستەی کە هەروەکو لەم دواییانەدا گوتراوە- کردارەکەی، لە جۆرێك لە زمان دەچێت. لەبەرئەوە هەرچەندە زیاتر لە قولاییەکەیدا بەدوای مرۆڤدا گەڕان زیاتر لەبەرچاو هەڵاتو ون بوو.

هەرچەندە چوونە پێشەوە کەمتریان نۆزیەوە، باری زمانیش هەر بەهەمان شێوە بوو. لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە زمانەکانی ئینسان خرانە بەر لێکۆڵینەوەو توێژەرەوەکان هەوڵیاندا لەم ڕێگەیەوە هەندێ لە کۆدە گەورەکانی زەینی مرۆڤ بدۆزنەوە. ئومێدیان وابوو بە لێکۆڵینەوەی ژیانی وشەکانو پەرەسەندنی ڕێزمانەکان و بە توێژینەوەی پراکتیکی زمانەکان لەگەڵ یەکتریدا، ماهیەتی خودی مرۆڤ بەشێوەیەك ئاشکرا ببێت، چ بەشێوەیەکی گشتی یان بە شێوەی بەشە بەشە جیاوازو جۆراوجۆرەکانی. بەڵام قوڵبوونەوە لەزماندا چ بەرهەمێکی بە دەستەوە دا؟ بونیادەکان و پەیوەستییەکان و ئەو سیستەمەی کە بە دەربڕینێك نیمچە لوجیکیەو مرۆڤ و ئازادی و بوونی مرۆڤ، دیسان ون ببوو.

***ئیجە مەرگی خوای ڕاگەیاند. وادیارە کە تۆ مەرگی بکوژی خوا، واتە مرۆڤ پێش بینی دەکەی. جۆرێك لە سزادان. ئایا دیار نەمانی خوا دیار نەمانی مرۆڤی لەگەڵ خۆیدا هەڵنەگرتووە؟**

**فۆکۆ:** دیارنەمانی مرۆڤ، ڕێك لەو ساتەدا کە ئێمە بە شوێن ڕەگو ریشەیدا دەگەڕاین، بەمانای دیارنەمانی زانستە مرۆییەکان نیە. من هەرگیز شتی وام نەوتوە. وتوومە کە زانستە مرۆییەکان لەمەودوا لە مەیدانێکدا ئامادە دەکرێت کە چیتر ئەم هیومانیزمە ئاسۆکانی داناخات یان پێناسەی ناکات. مرۆڤ لە فەلسەفەدا ون دەبێت، نەك وەکو زیهنی مەعریفە، بەڵکو وەکو زیهنی ئازادی بوونی خۆی. بەم حاڵەوە واقیعەت ئەوەیە کە مرۆڤ وەکو زیهنی خودی هوشیارو ئازادی خود، جۆرێك وێنەی لکاوە بەخواوە. مرۆڤی سەدەی نۆزدە خوایە کە لە بەشەریەتدا بەرجەستە بووە. جۆرێك لە بەخوا کردنی مرۆڤ، جۆرێك لە دابەزاندنی سەر لەنوێی خودا بۆ سەر زەمین لە کارا بوو کە لە ڕێگەیەوە، خودا لە شێوەی مرۆڤی بەخواکراوی سەدەی (19)ی لێهات. فۆیرباخ بە وتنی ئەوەی کە (دەبێ ئەو گەنجینانەی کە لە ئاسمان خەرجمان کردوە، بیگەڕێنینەوە بۆ سەرزەوی) چەند گەنجینەیەکی لە خەسڵەتی مرۆڤدا بەیادگار بەجێهێشت کە بەرلەوەی خرابوونە پاڵ خودا. ئیجە کەسێ بوو کە بە حوکمدانی لەسەر مەرگی خودا، لە هەمان کاتدا ئەم مرۆڤە خوا ئاسایەی کە خەونی هەمیشەیی سەدەی نۆزدەبوو مەحکوم کرد ئیجە بەراگەیاندنی دەرکەوتنی مەزنەمرۆڤ (سوپەرمان)، دەرکەوتنی مرۆڤێکی ڕاگەیاند کە چیتر نزیکی لەگەڵ خودادا نەبوو (ئەو خوادایەی کە مرۆڤ وێنەی ئەوی هەلگرتبوو) نەك دەرکەوتنی مرۆڤێك کە زیاتر لە خودا دەچوو تانەوەی لە مرۆڤ بچێت.

***هەربۆیە کە تۆ باس لە کۆتایی ئەو داهێنانە پاشکەوتووە دەکەی، دەڵێی (ڕەنگە)؟**

**فۆکۆ:** هەڵبەتە، دڵنیایی من لە چوارچێوەی ڕووداوناسیدا، ڕووداوناسی خۆم سەبارەت بە حاڵی حازر. ساتێك پێش ئێستا لەمنت پرسی کە فەلسەفە، چۆن و بەچ شێوەیەك گۆڕانی بەسەردا هات؟ ڕەنگە بشێ بگوترێ کە فەلسەفە، لە هیگڵەوە تا سارتەر بەرهەمی چالاکیەکی هەمەکیبین (کلی نگر) بوو.

ئەگەر لە قەڵەمڕەوی جیهان یان لە مەعریفەشدا نەبێ. بەلای کەمەوە لە مەیدانی ئەزمونەکانی مرۆڤدا وابوو. دەمەوێ بڵێم کە لە حاڵی حازردا ئەگەر چالاکیەکی فەلسەفی و پشت بەخۆبەستوو لە ئارادا بێ، ئەگەر بوونی فەلسەفەیەك لە دەرەوەی جۆرێك لە چالاکی تیۆری ڕووتدا لە قەڵەمڕەوی بیرکاریی یان زمانناسی یان ئابوری سیاسیدا بە مومکین بزانین. ئەگەر فەلسەفەیەکی ئازاد یان سەربەخۆ لەو مەیدانەدا لە ئارادا بێ، دەشێ ئەو فەلسەفەیە وەکو چالاکی ڕوداوناسی پێناسە بکرێ.

ڕووداوناسی حاڵی حازر بە مەبەستی دەرخستنی ماهیەتەکەی و چۆنیەتی جیاوازیی ڕەهای ئەم زەمەنەی ئێستا لەگەڵ ئەوەدا کە وجودی نییە، بە دەربڕینێکی دیکە لەگەڵ زەمانی ڕابردودا، ڕەنگە ئەرکی فیعلی فەلسەفە ئەمە بێ.

***ئەمڕۆ چ پێناسەیەك بۆ بونیادگەری دەکەی؟**

**فۆکۆ:** ئەگەر لەو کەسانە بپرسی کەلەژێر ناونیشانی بونیادگەریدا ریزبەندی کراون وەکو




لیڤی شتراوس، لاکان، ئالتۆسێر و زمان ناسان هتد. دەڵێن: هیچ ڕوویەکی هاوبەشیان لە نێواندا نییە، یان ڕووی هاوبەشیان زۆر کەمە. بونیادگەری وتەزایەکە بەلای کەسانی دیەوە بوونی هەیە، بەلای ئەو کەسانەوە کە بونیادگەر نین. لە دەرەوەیە کە کەسێك دەتوانێت بڵێت فلان و فیسار بونیادگەرن. دەبێ لەسارتەر بپرسی کە بونیادگەران چ کەسانێکن، چونکە ئەو پێی وایە کە لیڤی شتراوس و ئالتۆسێرو دومزیل و لاکان و من، یەك پارچە پێك دەهێنین کە جۆرێك لە یەکێتی تێدایە، ئەو یەکێتییەی کە خۆمان لێی بێخەبەرین.

***باشە کەواتە تۆ چ پێناسەیەك بۆ کاری خۆت دەکەی؟**

**فۆکۆ:** کاری خۆم؟ دەزانی کە کاری من زۆر سنووردارە. کە زۆر بمانەوێ قەڵەم بجوڵێنین، بریتیە لە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی شتێك لە بابەتی نەستی زانست و مەعریفەی ئینسان (*desconnaisances etdu savoir humain*) کە پاشکۆی بێ چەندوچونی یاسای گشتی ڕەوتی عەقڵ نیە کە فشاری بەدیهێنەری یاساکانی مێژووی خۆیەتی. لە ناخی ئەودا کە بەزانست خۆی دەزانێت، شتێك هەیە کە نایزانێت: مێژووی ئەو شتە ڕەوت (*devenir*)و دەوردان و ڕووداوەکانی ملکەچی ژمارەیەکی دیاری کراوی یاسا و دەستنیشان کراوە (*determination*).

ئەم یاساو دەستنیشان کراوانە چەند مەسەلەیەکن کە من هەوڵم داوە ڕوونیان بکەمەوە. من هەوڵم داوە بوارێکی پشت بەستوو بە خۆ بدۆزمەوە کە ناهوشیاری زانستە (*savoir*)ە. بوارێك کە یاسای خۆی هەیە، ڕێك بەهەمان شێوە کە ناهوشیاری تاك خاوەنی یاساو پێوەری خۆیەتی.

***هەر ئێستا ئاماژەت بۆ سارتەر کرد، تۆ ڕێزت لە هەوڵی بەرزی ئەو نا، ئەو هەوڵەی وەك خۆت دەڵێیت بۆ ئەو مرۆڤەی سەر بە سەدەی نۆزدەیەو تێدە کۆشێت کە لەسەدەی بیستەمدا بیر بکاتەوە. تەنانەت وتووتە کە ئەو دوا مارکسییە، لەو کاتەدا سارتەر وەڵامی تۆی داوەتەوە. ئەو سەرزەنشتی بونیادگەرەکان دەکات کە ڕێبازێکی تازەیان دروست کردووە. ئەو شتەی کە سارتەر بە دوا سەنگەری بۆرجوازی لە قەڵەمی دەدا لە بەرامبەر مارکسیدا، لەم بارەیەوە رات چییە؟**

**فۆکۆ:** لەوەڵامدا ئاماژە بۆ دوو خاڵ دەکەم. یەکەم ئەوەیە کە سارتەر مرۆڤێکە بە چەند شتێکی گرنگەوە سەرقاڵە -ئەدەبیات، فەلسەفە، سیاسەت- کە نایەڵن کاتی هەبێ بۆ خوێندنەوەی کتێبەکەی من، لە ڕاستیدا ئەو کتێبەکەی منی

نەخوێندۆتەوە، بۆیە ئەوەی کە ئەو دەربارەی قسە دەکات زۆر پەیوەندی بەمنەوە نییە.

دووەم ئەوەیە کە شتێك بـۆ تـۆ بدرکێنم. ماوەیەکیش زۆر بەر لە ئێستا چەند مانگێ -یان کەمتر- ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست بووم. لەو کاتەدا بە ئێمەیان دەگوت کە سارتەر دوا شورای ئیمپریالیزمی بۆرجوازییە. یان دوا بەردی بناغەی هتد.. ئێستا مایەی سەرسامی و سەرگەرمی منە کە دەبینم لەدوای (*15*) ساڵ دەربڕینێکی لەو جۆرە لەقەڵەمەکەی سارتەرەوە دادەچۆڕێ دەشێ بگوترێ من و ئەو بە نۆرە بەدەوری ئاشێکدا خولاوینەتەوە.

**•تۆ رەسەنایەتی لەم قسەیەدا نابینی؟**

**فۆکـۆ:** نەخێر. بیست ساڵە ئەم قسانە کەوتونەتە سەر زارو سارتەر بەکاریان دەهێنێت، حەقیشێتی. شتێك کە ئەڵتەرناتیڤی هەبێت گلەیی لێناکرێت.

***سارتەر سەرزەنشتی تۆو فەیلەسوفەکانی دیکە دەکات کە گوێ بە مێژوو نادەن و حورمەتی مێژووتان شکاندووە. ئایا ئەمە وایە؟**

**فۆکۆ:** هیچ کام لە مێژوو نووسەکان، ئاوا سەرزەنشتی منیان نەکردووە. مێژوو لای فەیلەسوفان جۆرێکە لە ئەفسانە، فەیلەسوفەکان بەشێوەیەکی گشتی ئاگایان لە مەیدانەکانی دەرەوەی قەڵەمڕەوی سیستماتیکی خۆیان نییە. ماتماتیکێك، بایلۆژییەك، هەروەها مێژوویەکی تایبەتی فەیلەسوفەکان هەیە، مێژوو بەلای فەیلەسوفەکانەوە جۆرێکە لە پەیوەندی فراوان و مەزن کە تیایدا ئازادی تاکەکان و تەرخانکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتیان بەیەکەوە چنراون و ئەگەر دەست لە پێکهاتەی یەکێك لە ناوەڕۆکەکان بدەی واتە- پەیوەستی بە گەڕخستنی کاریگەرانەی ئازادی مرۆڤ و کەوتنە رووی ئازادی تاکەکەسی هاوشانی تەرخانکردنی کۆمەڵایەتی- ئەو مەزن و جدیانە هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە کە هەوڵی لەناوبردنی مێژوو دراوە، واقیع ئەوەیە کە ماوەیەکە مرۆڤی وەکو مارك بلوخ و لوسین فور کۆتایی وەها ئەفسانەیەکیان سەبارەت بە مێژوو راگەیاندوە. ئەمانە بەشێوەیەکی تەواو جیاواز مێژوو دەنووسن. زۆر خۆشحاڵم ئەگەر ئەفسانەی فەلسەفەی مێژووم کوشتبێ، ئەو ئەفسانە فەلسەفییەی کە بە کوشتنی تاوانبارکراوم، چونکە ئەمە راست هەمان ئەو کارەیە کە حەزم دەکرد ئەنجامی بدەم، بەڵام نەك مێژوو بەگشتی، کەس کاری بە مێژوو نییە، بەو شێوەیە کار بەمێژوو هەیە کە لە فەلسەفەدا تەرح دەکرێت. ئەمە ئەو شتەیە کە نیازی کوشتنیم هەبووە.

***کام بیرو توێژەرەوەو فەیلەسوفانە کاریگەریان هەبووە لەسەرهەڵدان و فۆرمەلە بوونی بیری تۆدا؟**

**فۆکۆ:** من لە نەوەیەکەم کە ئاسۆکانی بیری بە شێوەیەکی گشتی لەلایەن هۆسریل، وردتر لەلایەن سارتەرو وردتر لەمەش لەلایەن میرلۆپۆنتییەوە پێناسەکراوە. لەبەر چەند هۆیەك کە لە هەمان کاتدا سیاسی، مەسلەکی، زانستییەو زۆر دژوار دەتوانرێ روون بکرێنەوە، ئەم ئاسۆیانە لەبەرچاوی ئێمە هەڵڕژان. لەناو سڕایەوەو ئێمە فەزایەکی بەتاڵمان لەبەرامبەر خۆماندا بینی کە تیایدا گۆڕانەکان زۆر سنووردارترو ناوچەیی تر بوون لە جاران و زۆر لەمەیدانخوازیان کەم کرایەوە. ئاشکرایە کە زمانەوانی بەشێوازی یاکۆبسن و مێژووی ئاینەکان و ئەفسانەکان و ئەفسانەناسی بە شێوازی دۆمزیل بۆ ئێمە چەند سەرچاوەیەکی بەنرخ بوون.

**•دەشێ چ پێناسەیەك بۆ هەڵوێستی تـۆ بکرێت لەبەرامبەر کارو سیاسەتدا؟**

**فۆکـۆ:** چـەپی فەرەنسا لەسـەر بنچینـەی جۆرێك ئەفسانەی نـەزانینی پـیرۆز ژیاوە. ئەوەی کە تازەیە باوەڕە بەوەی کە ڕاست بوونـی بـیری سیاسـی ئـەنجامی وردی و جدیـەتی زانسـتی ئـەو بیرەیەو لـەم ڕوانگـەیەوە پێمولیـە تـەواوی ئـەو کۆششـانەی کە ئـەمڕۆ گروپێك لـە ڕۆشـنبیرانی کۆمۆنیسـت بـە مەبەسـتی هەڵسـەنگاندنی سـەر لـەنوێی چەمکـەکانی مـارکس دەیکـەن، ئـەو کۆششانەی کە بۆ پەیداکردنی سەرچاوەکانی ئـەو چەمکانـــە و پاشـــان شـــیکردنەوەیان و بەدەستەوەدانی پێناسەیەك بۆ بەکارهێنانی شیاو و پێویستی ئـەو چەمکانـە ئـەنجام دەدرێ، بـە باوەڕی من تەولوی ئەو کۆششانە، هـەم سیاسین و هـەم زانسـتی و ئـەو حوکمـەی کـە خـۆ تـەرخانکردن بـۆ کـاری زەینـی و تیـۆری، بـەو شێوەیەی کە ئێمـە خۆمـان بـۆ تـەرخانکردووە، بەمەعنای ڕوو وەرگێڕانە لە سیاسەت، بە ڕای مـن بە ئاشکرا هەڵەیە، سەرلپا هەڵەیە. بەمەبەستی ڕوو وەرگێڕان نیە لە سیاسـەت کە ئێمـە لەچەند مەسەلەیەکدا نقوم بووین کە لـە ڕووی تیۆرییـەوە وەها ورد پێناسە کراوە. بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئێمە لەوە تێگەیشتووین کە کاری سیاسـی بەهـەر شێوەیەك بێ، تەنها لە پـەیوەندی جێگیر لەگەڵ بیرکردنـــەوەی وردی تیۆریـــدا ئەگـــەری دەرکەوتنی هەیە.

**فەلسەفەی وجودیەت خەڵکی بۆ کارو پـەیمان هاندەدا. ڕەخنەیان لە تۆ گرتووە کە بە پێچەوانـەوە کاردەکەی؟**

**فۆکۆ:** سەیر نیە کە ڕەخنەیەکی لەو جۆرەیـان لێگرتووم. بەڵام دیسـان دەڵێم کە جیـاوازی کـار لـەوەدا نییـە کـە ئێمـە سیاسـەتمان لـە تیـۆرو تیۆرکاری جیاکردۆتـەوە، ئاسـانە، مـادەم کـە بمانـەوێ ئـەم دوانـە لەیـەك نزیـك بکەینـەوە. سـەرپێچی دەکـەین لـە قبـوڵ کردنـی ئـەو سیاسـەتەی کە لەسـەر نـەزانینی زانایانـە بنیـات نـراوە ئـەو سیاسـەتەی کـە بـەڕای مـن دەستنیشـانکەری هـەمان ئـەو شتـەیە کـە نـاوی پەیمان (تعهد)ە.

**•زمانێکی دیکە یان فەرهەنگێکی دیکە، کامیانـە کـە ئەمڕۆ فەیلەسوفەکان و زانایان لە زۆربەی خەڵك جەماوەری هاوچەرخیان جیا دەکاتەوە؟**

**فۆکـۆ:** بـە پێچەوانـەوە، بـەڕای مـن ئـەمڕۆ گوێزانـەوەی مەعریفـە (*savoir*) فراوانـتر و سودبەخشترە. بۆ نمونە مەعریفە جۆرێـك بـوو لـە ڕازو بڵاوبوونەوەی یان بڵاونەبوونەوەی بەتـەواوی لـەناو کۆمـەڵێ کەسـی دیـاریکراودا، لەهـەمانکاتدا ئەوە زامنو پارێزەری ڕاستی ئەو مەعریفەیـە بـوو لەگەڵ بەگشتی بوونیدا، چیتر مەعریفە نـەبوو دیارە چیتر لە حەقیقەتیشەوە نزیك نەبوو.

ئـەمڕۆ ئێمـە لـە قۆنـاغێکی پێشـکەوتووی جموجۆڵێکدا دەژین کـە لـە سـەدەکانی حـەفدە و هەژدەوە دەستی پێکردوە، واتە ئـەو کاتـەی کە سەرئەنجام مەعریفە بوو بە شتێکی گشتی. زانـین بەمەعنای بە ڕوونـی بینینـی شتێك بـوو کـە هـەر کەسێك لـە هەلومـەرجی لەیـەك چوودا دەیتوانـی ببینێ و تەئیدی بکات. تا ئەو ڕادەیـە پێکهاتـەی مەعریفە عمومیەتی پەیدا کرد، هـەموان خـاوەنی مەعریفە بـوون. جیـاوازی تەنها لـە ڕادەو وردی و ڕێکخستن و...هتد بوو. بەڵام بـەو شێوەیە نـەبوو کـە لەمبـەرەوە نـەزانان و لەوبـەرەوە زانایـان وەستابن. ئـەوەی کە مەعریفـە لـەملاوە دەیکـات یەکسـەر لـەولاوە ڕەنـگ دەداتـەوەو بـەڕای مـن سـەرەڕای پسـپۆری لـە جـاران زیـاتر، ڕەوتـی پێوەندی مەعریفە بەپشت بەستن بـە خـۆی، بـەر لەوە هەرگیز بەو خێراییە بەرقەرار نەدەبوو.

**سەرچاوە:**

*ڕۆژنامەی عصر ئازادگان*

*ژمارە:* **53**

# فایلی ژماره



## فریدریش نیچه: فەیلەسووفی ژیان

-بەبۆنەی تێپەڕینی سەد ساڵ بەسەر مەرگیدا-

# پانۆرامای ژیانی نیچە

## -کرۆنۆلۆژیا-

■ سەردەم

● لە پانزەی تشرینی یەکەمی *1844* لە شاری (رۆکن)ی سەر بە هەرێمی سەکسۆنیا هاتۆتە دنیاوە. لۆدفیگ کارل نیچەی باوکی قەشە بووەو، فرانسیسکا ئۆیلەری دایکیشی کچی کابرایەکی قەشە بووە.

● *1846* لە دایک بوونی ئەلیزابیسی خوشکی، کە لە داهاتوودا دەبێتە خاتوو فۆرستەر.

● کاتێك تەمەنی دەگاتە پێنج ساڵی واتە لە *1849*دا باوکی دەمرێت.

● لە *1850* خێزانەکەی کۆچ دەکات بەرەو ناومبرگ و لەوێ خوێندنی قۆناغی ئامادەیی تەواو دەکات.

● ساڵی *1864* دەچێتە زانکۆی بۆن و لەوێ لای هەریەك لە ریچل و یان فیلۆلۆگیاو تیۆلۆگیا دەخوێنێت.

● لە تشرینی یەکەمی *1865* لەگەڵ ریچل دا دەچێتە لایبزگ، لێرەوە دەکەوێتە ژێر کاریگەری شوبنهاوەرو، سەرەتای پەیوەندی هاورێیەتی لەگەڵ رۆدەدا دەست پی دەکات.

● *1867– 1868* دەچێتە ریزی سوپاوە بۆ تەواو کردنی خزمەتی سەربازی، بەڵام دوای کەوتنە خوارەوەی لەسەر پشتی ئەسپ، دەگەرێتەوە لایبزگ و بۆ یەکەمین جار چاوی بە ریچارد ڤاگنەر دەکەوێت.

● ساڵی *1869* دەبێتە مامۆستای یاریدەدەر لە زانکۆی بزل لە سویسراو، یەکەمین لێکچەریشی کە پێشکەشی دەکات بە ناوی (هۆمیرۆس و فیلۆلۆژیای کۆن)ەوەیە.

● لەکۆتایی ئەو ساڵەدا سەردانی ڤاگنەر دەکات لە تریبشن، لۆزان لە سویسراو، لە سەرەتای ساڵی *1870*دا دەبێتە مامۆستا. پەیوەندی هاورێیەتی لەگەڵ هەریەك لە یاکوب بۆرکهارتی **J. Burckhart** مێژوونووس و، فرانتز ئۆڤەر برکی **F. Overbeck** تیۆلۆژی پرۆتستانتی دەست پێدەکات.

• ساڵی 1872 سەر لەنوێ سەردانی ڤاگنەر دەکات و تیایدا چاوی بە کۆزیما ڤاگنەر دەکەوێت. کتێبی گۆرانی تراژیدیا دەنووسێت.

• 1878 ڤاگنەر ئۆپێرای پارسیڤال پێشکەش بە نیچە دەکات و پەیوەندیەکانیان بەرەو خراپی دەچێت، هەمان ساڵ نیچە کتێبی (مرۆڤانە، زێدە مرۆڤانە) دەنێرێت بۆ ڤاگنەر.

• 1879 باری تەندروستی بەرەو خراپتر دەچێت، مۆڵەت لە زانکۆی بازل وەردەگرێت بۆ پشوودان.

• ساڵی 1880 خانەنیشین دەکرێ و، سەردەمی سەفەرەکانی دەست پێ دەکات.. زستانان لە نیس و هاوینان لە سلیزماریا بەسەر دەبات. بەڵام دڵگیر ترین شوێن لای ئەو ڤینیسیا بوو.

• لە بەهاری 1881 تەندروستی بەرەو باشتر دەچێت.

• ساڵی 1882 لەگەڵ لوسالومی دا پەیوەندی دەگرێت. نیچە داوای لێ دەکات ببێتە هاوسەری، لۆ ئەو داوایەی رەتدەکاتەوە.

• 1883 لە رابالو بەشی یەکەمی (زەرا .ەشت ر.های وت). تەواو دەکات.. ریچارد ڤاگنەر لە بوندوقیە کۆچی دوایی دەکات.

• هەمان ساڵ لە وەرزی بەهاردا دەچێتە رۆما، هاوین لە سلیس ماریا بەسەر دەبات و بەشی دووەمی زەرادەشت دەنووسێت. لە پایزدا دەگەرێتەوە ئەڵمانیاو داواکاریەك پێشکەش دەکات بۆ ئەوەی لە زانکۆی لایبزگ ببێتە راسەبێژ، بەڵام داواکەی رەتدەکرێتەوەو ناچار دەگەرێتەوە جەنەوا.

• زستانی 1883– 1884 مانەوە لە شاری نیس/ فەرەنسا، بەشی سێیەم لە کتێبی زەرادەشت.. نیچە توشی نائومێدی دێت لەبەرئەوەی وەکی پێویست پێشوازی لە کتێبەکەی ناکرێت.

• بەهاری 1884 لە ڤینیسیا و بال و زوریخ بەسەر دەبات و، پاشان دەگەرێتەوە بۆ سلیس ماریاو، دووچاری ژانە سەرێکی کوشندە دێت.

• زستانی 1885 لە نیس و مۆنتۆن لە فەرەنسا بەسەر دەبات.. بەشی چوارەمی زەرادەشت تەواو دەکات و، لەسەر ئەرکی خۆی بە چاپی دەگەیەنێت. بەهارو هاوینی ئەو ساڵە لە ڤینیسیا و سلیس ماریا دەبێت، پایز دەچێت بۆ منشن پاشان بۆ فلۆرەنساو دوای ئەوە دەگەرێتەوە نیس. خۆئامادەکردن بۆ نووسینی کتێبی ئیرادەی هێز، کە لە پاش مردنی خۆی بڵاودەکرێتەوە.

• 1886 راگەیاندنی شەر لە دژی ئاکاری مەسیحیەت و بورژوازیەت.

• بەهاری 1887 لە لۆنگاردین و کتێبی (لەو دیو چاکەو خراپەوە). هاوین لە سلیس ماریاو پایز لە ڤینیسیا. زستان لە شاری نیس لە فەرەنساو، کتێبی (ژینالۆژیای ئاکار).

• بەهاری 1888 بۆ یەکەمجار دەچێتە تورینۆ، پەیوەندی بەستن لەگەڵ جۆرج براندن)ی رەخنەگری دانیمارکی کە دواتر لە زانکۆی کۆپنهاگن چەند لێکچەرێك دەربارەی (فەلسەفەی نیچە) پێشکەش دەکات. هاوین لە سیلس ماریا دەبێت و پایز دەگەرێتەوە تورینۆ.

• زستانی 1888—1889 کتێبی: کێشەی ڤاگنەر، ئاوابوونی بتەکان، ئەنتی مەسیح/ Ecce homo (لە دوای مردنی بڵاودەکرێتەوە) دەنووسێت.

• ساڵی 1889 لە تورینۆ دوچاری شێتی و وڕێنەکاری دەبێت. بەناوی دیۆنیزوس و لە خاچ دراوەوە نامە بۆ ستریند بێرگ و بۆرکهارت

دەنێرێت. ماوەیەک لە نەخۆشخانەکانی بازل وبینا دەمێنێتەوە.

- سالّی *1890* دلیکی دەبیاتە لای خۆی لەناومبرگ و لە لایەن *Moebius* وە چاودێری دەکرێت.
- لە *1897* دایکی دەمرێت و ئەلیزابیس فۆستەری خوشکی دەیگرێتە خۆی لە شاری ڤایمار.
- لە بیست و پێنجی ئابی *1900*دا لە ڤایمار بۆ دواجار ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکات.



**ئامێری چاپەکەی نیچە**

# فریدریش نیچه

■ ئا: شوان ئەحمەد

(1)

فریدریش نیچـه لـه پـانزەی تشرینی یەکەمی سالّی **1844** له شاری (رۆکن)ی ئـەڵمانیا هاتۆتـه دنیاوه.. تەمەنی پێنج سالان بووه کـاتێك بـاوکی مـردووەو دایکـی ناچـار بـووه لەگـەڵ ئەلیزابیسـی کچیدا، کە دوو ساڵێك له نیچه گەورەتر بووه روو بکاته شاری (ناومبۆرگ) ئـەم شـارەش دەکەوێتـه سـەر روبـاری (سـال). لـەوێدا نیچـه خرایـه بەرخوێندن و خوێندکـارێکی سـەرکەوتوو بـوو. هەرکـه تەمەنیشـی گەیشـته چـوار سـالان لـه خوێندنگـای (بفۆرتـا)ی نـاوخۆیی وەرگـیرا. ئـەم خوێندنگایه تایبەت بوو بـه کەسانی دەستەبژێرو هەلبژاردە. تا ئەوکاتەی له زانکـۆ وەرگیرا لـەوێدا مایەوە.

خو ندنگـای (بفۆرتـا) ژمارەیـەك کەسـی بـەناوبانگی تێدابـوو، وەك شـاعیری رۆمانسـی (نۆفـالیس) و ، (فیخـتـه)ی فەیلەسـوف و، (رانکـه)ی مێژوونـووس و، هـەردوو جوتـه بـرا (شلیگل). هاوکـات خوێندنگا خـاوەنی ژمارەیـەك مامۆستای بەتوانا بوو.

نیچـه لـەو تەمەنـەیدا حـەزو ئـارەزووی جۆراوجـۆری هـەبوو: شـیعر، لێکۆڵینـەوە کلاسیکیەکان، میوزیك. وەکی باوکی مۆسـیقیەکی باش بـوو. لـه سـەرەتای تەمەنیدا پیانۆژەنێکی سـەرکەوتوو بـوو، هـەروەها دەستی بـۆ دانـانی هـەموو جـۆره ئـاوازێك دەبـردو، سـالانێکی زۆر لەسەر ئـەم کارەی بـەردەوام بـوو. لـه خوێندنگا خوێندکـارێکی هەڵسـوکەوت جـوان بـوو، ئەرکەکانیشـی بـه وردی جێبـەجێ دەکـرد. هەستێکی زۆریشی به لێپرسراوێتی دەکرد، بـەلام هەندێك جاریش توشی هەڵەو لادان بووه.

کاتێك خوێندنی له (بفۆرتا) تـەواو کـرد سـالّی **1864** چـووه زانکـۆی (بـۆن)، بـەو مەبەسـتەی لـەوێدا تیۆلۆژیـاو بابەتـه کلاسـیکیه کۆنـەکان بخوێنێت. بەلام (بـۆن) و زانکۆکـەی بـه دڵـی ئـەو نەبوون. ئەوەشی لەنامەیـەکدا لـه **30** حوزەیرانـی

*1865* کە بۆ دایکی نووسیوە روونکردۆتەوە. لەو نامەیەدا دەڵێت:

(من زۆر لە توندڕۆیی خەڵکی کاتۆلیکی ئێرە بێزارم، زۆر جاران وام لێ دێت بڕوا بەوە نەکەم ئێمە لە سەدەی نۆزدەدا دەژین). بەڵام سەرەڕای ئەوە پرۆفیسۆر فریدریش ولیەم ریچل (*1801*- *1876*) توێژەر لە بواری لێکۆڵینەوەی کۆن دا، بووە ئیلهام بەخشی و هانی ئەوەیدا لە نیوەی دووەمی خوێندنی ئەو ساڵەدا -سەرەڕای نارەزایی زۆری دایکی- واز لە خوێندنی تیۆلۆژیا بهێنێ و خۆی تەرخان بکات بۆ بابەتە کلاسیکیەکان، بەتایبەت شارستانیەتی ئێرینی گریک. لەوانەی نیچە لە (بۆن)دا ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا کردن و بوونە هاوڕێی هەمیشەیی (ئەروین رۆد) بوو، کە لە دوایدا بووە مەرجەعێك لە مێژووی کۆنی گریك دا. ساڵی *1865* کاتێك پرۆفیسۆر ریچڵ چووە زانکۆی (لایبزیك) نیچەو ئەروین رۆد لە گەڵیدا چوون، تا لەوێ بە ئازادی خوێندن تەواو بکەن.

(2)

هەرچەندە ئەو ماوەیەی نیچە لە (لایبزیك)دا بەسەری برد شتێکی وەهای تێدا نەبوو، بەڵام سەرەڕای ئەوە چەند رووداوێکی دیاریکراوی وای تێدابوو کە کاریگەری زۆری بەسەر ژیانیەوە بەجێ هێشت. لەوانە رۆژێکیان بە رێکەوت کتێبێکی کۆنی شۆبنهاوەری بەناوی (جیهان وەك ئیرادەو بیرۆکە)ی بەرچاو دەکەوێت و، دەست دەکات بە خوێندنەوەی. لە ماوەی دوو هەفتەدا بۆ زیاد لە جارێك ئەو کتێبە دەخوێنێتەوە، وەك ئەوەی لە هۆش خۆی چووبێت، کە لە خوێندنەوەی دەبێتەوە تێڕوانینی بۆ جیهان گۆڕانی تەواوی بەسەردا دێت. لێرەوە هەر زوو گیرۆدەی بیرو بۆچوونەکانی شۆبنهاوەر بوو، بەتایبەتی ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت: (هیچ خوایەك لە ئارەدا نیەو، چاودێری خوایانەش نیە. ژیان و گەردونیش مانایەکیان نیە. لە پشت هەموو ئەمانەشەوە جگە لە ئیرادەیەکی نابینا هیچی تر نیە. سەرەڕای هەموو کێشەو ژان و ژارێك ئەم ئیرادە سەراپاگیرە نائەقڵانیە شتێکە - تەنها خۆیەتی- و چاوگی هەموو دیاردەکانەو، لە رێی مێشکی مرۆڤەوە پەیی پێ دەبرێت. بەم جۆرە ئەوە تەنها هەر مرۆڤە کە هەست بەو ئازارو ژانە گەورەیە دەکات، کە لە کارکردەوەی ئەو هێزە گەردونیە نائەقڵانیەوە دەکەوێتەوە. بەڵام مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە ئەو ئازارە کەم بکاتەوەو تەنانەت لەناخی خۆشی دا سەرکوتی بکات، ئەویش لە رێگای فەرامۆش کردنی خودو خۆبەدەستەوەدانەوە، کە لە نیرڤانای خورهەڵاتی‌دا دەگاتە دواناستی خۆی).

لە زانکۆدا نیچە بەشێوەیەکی تایبەت کەوتە ژێر کاریگەری فەیلەسوفەکانی قۆناغی بەر لە سوکرات. لەو شاعیرە کۆنانەی گریك کە زۆر سەرنجی راکێشا (سیۆگنیس میگاری) بوو، ئەوەبوو وتارێکی لە بارەوە نووسی. ئاستی ئەم وتارەی هێندە بەرز بوو، وای لە پرۆفیسۆر (ریچڵ) کرد لە گۆڤاری (مۆزەخانەی راین)دا بۆی بڵاوبکاتەوە. ئەم گۆڤارەش تایبەت بوو بە نوخبەیەکی دیاریکراو، کە لە پاشاندا نیچە بەشداری تێدا دەکات. ساڵی *1867* بەهۆی پەیوەندی کردنی بەسوپاوە لە یەکەیەکی تۆپخانە لە (ناومبۆرگ) بۆ ماوەیەك لە خوێندن دابڕا. بەڵام ئەو خزمەت کردنەی لە ریزی سوپادا بەجۆرە نەهامەتیەك تەواوکرد.

لە نامەیەکی‌دا بە بەرواری (*22*- یۆنیۆی- *1867*) ئەم رووداوەی بۆ هاوڕێی قۆناغی

خوێندنی (ڤۆن غرزدرۆف) باسکردووەو دەڵێت:
(ڕۆژێکیان لە خۆهەڵدانێکی کتوپڕدا بۆ سەر پشتی ئەسپێك، سنگم بەر لێواری زینی ئەسپەکە کەوت و، لەلای چەپمدا هەستم بە ئازارێکی بێ ئەندازە کرد، بەڵام لە سواربوون بەردەوام بووم. بۆ ماوەی ڕۆژو نیوێك دووچاری ئێش و ئازارێکی زۆر بووم. لە ئێوارەی ڕۆژی دووەمدا دووچار لە هۆش خۆم چووم. ڕۆژی سێیەم لە جێگەدا کەوتم ، بەدەست ئازارێکی زۆرەوە دەمناڵاند. سەرباری ئەوەش سەریەشەو تایەکی زۆر دایگرتبووم. سێ دانە مانگ هێلنج و رشانەوەم نەوەستا. دواجار کاتێك ناو پێخەفەکەم بەجێهێشت، لە حاڵەتێکی هێندە کاس و وڕدا بووم ناچار بووم سەرلەنوێ فێری لەڕێ ڕۆیشتن ببمەوە).

ساڵی **1867** کاتێك گەڕایەوە (لایبزیك) لەگەڵ ریچارد ڤاگنەردا یەکتریان ناسی. ڤاگنەر ئەوکات بەسەردان چووبووە لای(برۆکهاوسی) خوشکی، لە ماڵی ئەواندا نیچە شەوێکی لەگەڵ ڤاگنەردا بەسەر بردو باسیان لە شوپنهاوەر و مۆسیقاکرد. لە کۆتایی دیدارەکەیاندا ڤاگنەر بەگەرمی دەستی نیچەی گوشی و، خۆشحاڵی نیشان دا لەوەی ئومێدەوارە لە دەرفەتێکی تردا چاویان بەیەکدی بکەوێتەوە. دووەمین دیداریان زوو بە ئەنجام گەیشت. بەشداری کردنی نیچە بە نووسین لە گۆڤارێکی ئاست بەرزی وەك (مۆزەخانەی ڕاین)دا، بووە مایەی ئەوەی لەلایەن ئەو ناوەندانەی بایەخیان بە باس و لێکۆڵینەوە کلاسیکیەکان دەدا گرنگی پێ بدرێت.

لە ئەنجامی ئەمەو لەو ساڵەدا پرۆفیسۆر (ر. چل) نامەیەکی بەدەست دەگات، لەو نامەیەدا پرسیاری ئەوەی لێدەکەن کە ئاخۆ خوێندکارە لێهاتووەکەی، ئامادەیی ئەوەی تێدایە تا کورسی مامۆستایی فیقهی زمانە کۆنەکان لە زانکۆی (بال) وەربگرێت؟ (ریچل) ئەو ئەرکەی بە نیچە سپاردو، بۆ دامەزراندنیشی زۆر بە گەرمیەوە خۆی تەزکیەی کرد، هەرچەندە هێشتا بڕوانامەی دکتۆراشی وەرنەگرتبوو. لە تەمەنی بیست و چوار ساڵی‌دا بوو بە یەکێك لە ئەندامانی کۆنترین زانکۆ لە سویسرادا، چونکە ئەو زانکۆیەی ئەو تێیدا بووە مامۆستا مێژووی دروستبوونی دەگەڕایەوە بۆ ساڵی **1460**.

نیچە کاتێك لەوێدا دەست بەکاربوو، خۆشبەخت بوو بەوەی لەنێو هاوەڵەکانیدا دوو توێژەری نامراویان تێدابوو، وەك: یەعقوب بۆرکهارت (**1818–1897**) مێژوونووسی شارستانیەتی یۆنان و سەردەمی ڕێنیسانس، لەگەڵ تیۆلۆژیەکی لیبراڵی وەك فرانز ئۆڤریك (**1837–1905**) پسپۆڕ لە مێژووی کڵێسادا. ئەم دووانە هەردووکیان بوونە هاوڕێ و ڕێنومایکەری. هاوکات دامەزراندنی لە (بال)دا هۆکارێك بوو بۆ تازەکردنەوەی پەیوەندیەکانی بە ریچارد ڤاگنەرەوە.

(3)

ڤاگنەر ئەوکات لە (تریبشن)ی نزیك (لۆسرن) دەژیا، کە لە (بال)ەوە زۆر دوور نەبوو. بۆیە هەر زوو نیچە سەردانی کردو ڤاگنەریش بەگەرمی پێشوازی لێکرد. کۆزیمای هاوسەری ڤاگنەریش (کە نزیکە سی ساڵێك لە ڤاگنەر منداڵتر بوو) بەهەمان شێوە پێشوازی لێکرد. کۆزیما ئەگەرچی بە پێوەدانگە تەقلیدیەکە ئەو جوانە نەبوو، بەڵام خاوەن کەسایەتیەکی بەهێز بوو، هەروەها بیرکردنەوەو خەسڵەتی تایبەتی و سەربەخۆی خۆی هەبوو. بەهۆی بلیمەتی و بایەخدانی زۆری بە مۆسیقای ڤاگنەر، کۆزیما نیچەی بە دڵەوە گرت. هەرچی ڤاگنەریشە بەهۆی

گرنگی دانی نیچە بە شوێنهاوەرو شارستانیەتی دێرینی گریك، زیاتر لە یەکدی نزیك دەبوونەوە. سەفەرەکانی نیچە بۆ (تریشن) زیادی کرد، بە جۆرێك وای لێهات زۆربەی پشووی کۆتایی هەفتەی لەگەڵ ڤاگنەرو کۆزیمادا بەسەر دەبرد.

دەربارەی ڤاگنەر، نیچە لە نامەیەکیدا (17-ئابی- 1869) بۆ ئەرۆین رۆد دەنووسێت: (ژیان لێرە زۆر دەوڵەمەندو بە برشتە، هەموو ئەوەی فێری دەبم و گوێ بیستی دەبم لە باسکردن نایەت. بڕوام پێ بکەن هەتا ئێستاش شوێنهاوەرو گۆتەو بنداد و ئەسکیلۆس زیندوون)!

نیچە لەوکاتەدا سەرگەرمی نووسینی یەکەمین کتێبی خۆی بوو دەربارەی (تراژیدیای یۆنانی). کاتێك خەریکی کۆکردنەوەی کەرەستەی پێویست بوو بۆی، نومێدی ئەوەی هەبوو بتوانێت رۆحی جێرمانی بە چاکترین شێوە بژێنێتەوە. ئەویش لە رێگای کاریگەرێتی (هیلینیەت) و مۆسیقای ڤاگنەرەوە، وەك ئەوەی خۆی لەو رۆژانەدا تێی گەیشتبوو. نیچە پێی وابوو لە نمایشە مۆسیقیەکانی ڤاگنەردا گەیشتۆتە حەقیقەتێکی وا، کە لەو بەرهەمانەدا سیمایەکی هاوچەرخانەی تراژیدیای گریکی دۆزیوەتەوە، وەك ئەوەی ئەسخیلۆس و سۆفۆکلیس بەرهەمیان هێنابوو. رەنگە ئەمەش هۆیەك بووبێت لەوانەی وایان لێکردبێت تا کتێبە تازەکەی ناوبنێت (گۆرانی تراژیدیا لە رۆحی مۆسیقادا-1869). بەرلەوەی ئەم باسە تەواو بکات ماوەیەکی کورتی دیکەی لە ریزی سوپای ئەڵمانیا لەکاتی جەنگی فەرەنساو پرۆسیادا (1870-1871) بەسەر برد. ئەمەش بووە هۆی تێکچوونی زیاتری باری تەندروستی.

کاتێك لە زانکۆی (بال) وەرگیرا، ناچار بوو رەگەزنامەی سویسری دەربهێنێت. بەڵام لەبەر هەستی زۆری نیشتمانی لەکاتی تێکچوونی باروتۆخی وڵاتەکەیدا، بڕیاریدا پەیوەندی بکات بەریزەکانی سوپای ئەڵمانیاوە. لەبەرئەوەی بووبووە هاووڵاتیەکی سویسری رێگەی پێنەدرا لەگەڵ هێزەکانی ئەڵمانیادا بچێتە شەڕەوە. هەروەها کزی چاوەکانیشی هۆکارێکی دیکە بوو بۆ ئەوەی بەشداری ئەو جەنگە نەکات. دواتر توانی دەرفەت وەرگرێت تاوەك خۆبەخشێك لە تیمە فریاگوزاریەکاندا کاربکات. سەرەنجامی ئەم کارەش خراپ کەوتەوە. چونکە لە کاتێکدا هەندێك سەربازی برینداری فەرەنسی لە لۆریەکی رەشە وڵاخ دا بۆ (کارلسروهی) دەگواستەوە، نووشی پەتای (رەبووە) بوو. دوای چاك بوونەوەی ئەو باوەڕەی پێشووی بە ئەڵمانیا نەما، بەتایبەت سەبارەت بە پروسیا.

لە (7-نۆڤمبەری- 1870)دا نامەیەك بۆ غیدزدۆرفی هاوڕێی دەنووسێت و دەڵێت: (راشکاوانە پێتی دەڵێم: ئەمڕۆکە من پروسیا بەهێزێك دەبینم، کە هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ سەر شارستانیەت.. پێویستمان بە برێك لە دانایی هەیە بۆ ئەوەی لەنێو ئەم گێژەن و بێ هۆشیەدا ئەقڵ رون بین. قۆناغی داهاتوو شارستانیەت ململانێی و زۆرانبازی زۆری دەوێت، بۆیە پێویستە خۆمانی بۆ ئامادەکەین). پێنج هەفتە دوای ئەوە نامەیەك بۆ دایکی و خوشکەکەی دەنێرێت و تێیدا دەنووسێت: (من وا نیتر بەرەبەرە خۆشەویستی خۆم بۆ شەڕو فتوحاتەکانی ئێستای ئەڵمانیا لە دەست دەدەم).

نیچە ماوەیەکی زۆری پشووداني لە (ناومبۆرگ) بەسەر بردو، دایك و خوشکی چاودێریان دەکرد. پاشان لەگەڵ ئەلیزابیسی خوشکی دا چوو بۆ (لۆنمانۆ)، بەو هیوایەی لە

ئازارەکانی کەم بێتەوە. کاتێك بە ڕێڕەوی (قەدیس گۆتهارد)دا تێدەپەڕی، خۆی لەبەردەم پیاوێکی بەتەمەنی خاوەن سیمایەکی تایبەت دا بینیەوە قسەی بۆ دەکات. دوای کەمێك بۆی دەرکەوت ئەو پیاوە (مازینی) نیشتمان پەروەری بەناوبانگی ئیتالیایە. ئەو دیدارە ڕێکەوت بوو، بەلاَم بە زیندوویی لە یادەوەری نیچەدا مایەوە.

(4)

نیچە کاتێك گەڕایەوە (بال) باری تەندروستی لەوپەڕی خراپیدا بوو، بەلاَم بە بەردەوامی کاری لە (گۆرانی تراژیدیا)دا دەکرد. تا لە دوارۆژەکانی ساڵی *1871*دا تەواوی کرد. ئەم کتێبەی پڕی بوو لە دیدوبۆچوونی تازەو سەرسوڕهێنەر. ئەمەش وایکرد خەڵکی زۆر بە پیریەوە نەچن و، چەند دانەیەکی کەمی نەبێت هیچی وای لێ نەفرۆشرێت. بەلاَم ڤاگنەرو کۆزیما وەك لێیان چاوەڕێ دەکرا بە پیریەوە چوون. (هیچ کتێبێکم لەم کتێبەی تۆ جوانتر نەخوێندۆتەوە... هەرچی تێدایە بەرزو شکۆدارە) ڤاگنەر ئاوای بۆ نیچە نووسی بو. بە کۆزیمام وت: (دوای تۆ ئەوم لە هەموو کەسێکی تر خۆشتر دەوێت). هەروەها ڕۆدۆ ئۆڤریکیش هەمان هەڵوێستی ئەوانی هەبوو. بەلاَم پرۆفیسۆر (رچڵ) بێ دەنگیەکی دیبلۆماسی نیشاندا، بێ دەنگیەکەشی بێ هۆ نەبوو. نیچە گوێی بەو بۆچوونە تەقلیدیانە نەدەدا، کە لە بارەی یۆنانیەکانەوە لە ئارەدا بوو. بۆ نمونە وەك ئەوەی دەڵێن: گریکە کۆنەکان میللەتێکی کۆك و ئەساو، گەشبین و بەدەماغ بوون. بەلاَم ئەو بە پێچەوانەی ئەمەوە پێی وابوو ئەوان (ئەمە یۆنانیەکانی سەدەی شەشەمی بەر لە زایین دەگرێتەوە) لە ژیانیان دا تووشی ڕەشبینی و گومانێکی بێئەندازە بووبوون، سەرەڕای ئەوەش بە دوژمنایەتی و حەسودی پلانگێڕان دەور درابوون. ئەم بۆچوونەش لەگەڵ هەڵوێستی (بۆرکهارت)دا دەگونجێت. نیچە هەر بەوەندەوە نەوەستا، ئەو پێی وابوو تراژیدیای گریك بۆ نموونە وەك ئەوەی لای (ئەسکیلۆس) هەیە، لە هەوڵی ئەوەدا بووە بەسەر ئەو دیدگا ڕەشبینەدا زاڵ بێت کە ژیان ئافەرۆزە دەکات. ئەمەش لە ڕێی هەڵوێستێکی تراژیدیەوە کە لەسەرو ڕەشبینی و گەشبینیەوەیە. هەڵوێستێك قارەمانانە تەئکید لەسەر بەهای ژیان دەکاتەوە، سەرباری هەموو ئێش و ئازارەکانی. ئەوەی کۆتایی بە جیهانبینیە ڕەشبینەکەی گریك و تراژیدیای ئەوان دێنێت بە باوەڕی نیچە جگە لە سوکرات کەسێکی تر نیە. هەر بۆیە شاڵاوێکی توند دەکاتە سەر ئەقڵیەتی سوکراتی، ئەو ئەقلانیەتە تیۆری و پەتیەی هۆکاری لەناوچوونی تراژیدیای یۆنانی بوو، پاش ئەسکیلۆس و سۆفۆکلیس.

نیچە لە ساتەوەختی خۆیدا و لە هەناوی ڕۆحیەتی جێرمانیەوە ڕەگوڕیشەی دیونیسیەتێکی بەدی دەکرد، کە وەك هێزێکی دژ بە ژیواری (سوکراتیزم) لە چرۆ کردن دایە. ئەم هێزە تازەیەش میوزیکی ئەڵمانیە، لە (باخ)ەوە بۆ (پتهۆڤن) و بۆ (ڤاگنەر). کەواتە سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ ڕۆحی تراژیدیا ئەگەرێکی شیاوە لە ڕێی گیانی ئەڵمانی خۆیەوە. بەلاَم ئەمە بەمەرجێك دەبێت ئەڵمانەکان بەر لە هەموو شتێ ئامادەی ئەوەیان تێدابێت بۆ ئەوەی لە تەنها کەلیکەوە فێربن ئەو کەلەش یۆنانیەکانن، فێربوون لە تەنها ئەو کەسانەشەوە بۆ خۆی شەرەفێکی گەورەیە. ڕۆحیەتی جێرمانی ناوبەناو ئامادەیی ئەوەی تێدابووە دەست بە هێزی دیونیتسیسیەوە بگرێت، هەر لە میوزیکەوە تا

ئەفسانە تراژیدیەکانی. بێگومان مەبەست لەمەش ئەوەیە کە ڤاگنەر هەڵگری مەشخەڵی ئەم جۆرە میوزیکەیە.

بە بڕوای شۆپنهاوەر لەنێو سەرجەم هونەرەکاندا تەنها میوزیک دەتوانێت راستەوخۆ گوزارشت لە ئیرادەی بوون بکات، هەر ئەویشە کە قووڵترین نهێنییەکانی ئەم ئیرادەیە دەگوێزێتەوە. نیچە کارە مۆسیقیەکانی ڤاگنەری بەهاوتای تراژیدیا یۆنانیە کۆنەکانی بەر لە یۆریپیدس دادەنا، پێی وابوو ڤاگنەر ئەو هونەرمەندە بلیمەتەیە کە دەتوانێت بە باشترین شێوە لە رێی میوزیکی دیۆنیسیۆسیەوە، تەعبیر لە ئەفسانە تراژیدیە جێرمانیەکان بکات. خودی ڤاگنەر بە بۆچوونێکی لەم جۆرە ئێجگار دڵشاد و بەختەوەر بوو، بەتایبەت کە لەو کاتەدا (تریبشن)ی جێهێشتبوو، لە (بایروت) لە ناوچەی (باڤاریا) نیشتەجێ بوبوو، ڤاگنەر لەوێ سەرقاڵی دامەزراندنی شانۆیەکی تایبەت بەخۆی بوو، بەو مەبەستەی بیکاتە پەرستگایەک و، بەتەنهاش تایبەت بێت بە پێشکەشکردنی بەرهەمەکانی خۆی. ئەم کارەشی زوو بۆچووە سەرو سەرکەوتوو بوو تیایدا.

(5)

لە بیست و دووی ئایاری ساڵی *1872*دا، ڤاگنەر بەردی بناغەی شانۆکەی دانا. لەنێو ئەو میوانە زۆرانەی بۆ ئەوێ داوەت کرابوون نووسەرێکی بەتەمەن و قارەمانێکی خاوەن بیرو بۆچوونی رادیکاڵی تێدابوو، ئەویش خاتوو (مالفیدا فۆن میزنبۆغ) بوو. مالفیدا لەو بۆنەیەدا بۆ یەکەمجار چاوی بە نیچە کەوت و، وەک هاورێیەکی دڵسۆزی مایەوە، ئەگەرچی هاورێیایەتیەک بوو نزیک لە دایکایەتیەوە.

لە (بایروت) ڤاگنەر ئەو مۆسیقارە بەناوبانگە نەبوو، وەک ئەوەی نیچە لە (تریبشن) ناسی بووی، بەڵکو بووبووە کەسێکی لوت بەرزو تووڕەو، ئیرەی بە کەسانی تر دەبرد. لەلایەکی ترەوە نیچە لە دۆخێکی رارایی و پشێویدا بوو. دوای ئەوەی لە دەرکردنی کتێبی (گورانی تراژیدیا)دا ئەو سەرکەوتنە چاوەڕوانکراوەی بەدەست نەهێنا، لە هێز و توانای شارستانیەتی ئەڵمانی کەوتە گومانەوە. لە دەرفەتێک دەگەڕا بۆ ئەوەی چی لە ناخیدا هەیە بیخاتەڕوو، ئەوە بوو دایڤد فریدریش شتراوس کتێبێکی بەناوی (باوەڕی کۆن و باوەڕی نوێ)ەوە خستە بەردەستی خوێنەران، ئەم کتێبە دەرفەتی قسەکردنی بۆ نیچە رەخساند. ئەگەرچی کتێبەکە کتێبێکی سادەش بوو، بەڵام زۆرترین ژمارەی لێ فرۆشرا.

شتراوس بەخودپەسەندیەکی زۆرەوە لەم کتێبەی دا باسی لەو دیدگا زانستیە تازەیە کردبوو، کە دەبێت نەک هەر تەنها جێگای بیروبۆچوونە کۆن و بەسەرچووەکان بگرێتەوە، بەڵکو دەبێت چارەسەر بۆ کێشەو گرفتەکانی بوونیش بدۆزێتەوە، بەتایبەت ئەو کێشەو گرفتانەی مرۆڤ بەدەستیانەوە دەناڵێنێت و، لە دادڕانە رۆحیەکانیش قوتاری بکات.

ئەم کتێبە ململانێیەکی رۆشنبیری لە نێوان بیریارە کۆنسێرڤاتیڤ و رادیکاڵەکان دا دروست کرد لە سەرتاسەری ئەڵمانیادا. نیچە یەکێک بوو لەوانەی رەخنەیەکی توندی ئاراستەی ئەم کتێبەو نووسەرەکەی کردو، وتارێکی درێژی لە بارەیەوە نووسی. لەو وتارەدا رووکەشی هەڵوێستی نووسەرەکەی خستبووە روو، هاوکات ئەڵمانەکانی وریا کردبووەوە لە خۆفودان و لوت بەرزی بەهۆی سەرکەوتنیان بەسەر فەرەنسیەکان

دا. چونکە رەنگە سەرکەوتنیان لە رووی سەربازییەوە تێکشکانێکی شارستانی بەدواوە بێت. نیشانەکانی ئەگەرێکی لەو جۆرەش لەو شۆڕەت و نێوبانگەدایە کە کەسانی وەك (د. ف. شتراوس) هەیانە. ئەم وتارە نیچەی رووبەرووی رەخنەیەکی توند کردەوە، بەو پێیەی وتارەکەی (نانیشتمانیانە)یە. بۆ (غێرزدۆرف) دەنووسێت: (تەواوی هێزو تواناکان لە دژی من خراونەتەگەڕ). لە بیست و حەوتی تشرینی یەکەمی *1873*دا راشکاوانە وتی: من لە هیچ زانکۆیەکی ئەڵمانیدا جێم نابێتەوە، رەنگە (بال)یش هەمان هەڵوێست وەربگرێت.

تەموزی ساڵی *1875* ڤاگنەر خەریکی مەشقکردن بوو لەسەر نمایشێکی مۆسیقی تر لە بایرۆت. بۆ ئەمە نیچە دلوەت کرابوو، بەڵام بڕیاری ئەوەی نەدا کە بچێت. ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك، لەوانە: ئەو رۆژانە باری تەندروستی بەرەو خراپی دەچوو، هەروەها لەگەڵ بێ هیوای و نائومێدی زۆر لە ڤاگنەر. ئەگەرچی لە هاوینی داهاتوودا سەردانی (بایرۆت)ی کرد، بەڵام پەیوەندی نێوانیان لەگەڵ ڤاگنەردا هەر ساردو سڕی پێوە دیار بوو، تازە رۆژانی خۆشی (تریبشن) بەسەرچوو بوو. ڤاگنەر سەرەڕای لێهاتوویی و کارامەیی لوت بەرزو لەخۆبایی بوو، چاوەڕێی ستایش و پیاهەڵدانی زیاتر بوو لە نیچە. هاوکات خۆی دابووە چەند بابەتێکی عیرفانی مەسیحی یاخود عیرفانیەتێکی پوچ و بەتاڵ، وەك نمونەی (پارسیڤاڵ) و، دەیویست لە رێی ئەمەوە کاریگەریەك لەسەر ئەڵمانیاو ئەورووپا دروست بکات. نیچەش لە هەموو ئەم کارانەی ناڕازی بوو، هەر بۆیە بڕیاریدا پەیوەندی خۆی لە گەڵیدا بپچڕێنێت. هەمان ساڵ (ریچارد ڤاگنەر لە بایرۆت)ی نووسی، ئەم نووسینەی جۆرە ماڵئاواییەکی جوامێرانە بوو لە هاوڕێی رۆژانی رابردووی. لەو نووسینەیدا ستایشی ئەو شتانەی لە ڤاگنەردا کردبوو کە شایستەی ستایش و باسکردنە. پێشتر لە باسێکی دیکەیدا لەژێر سەردێڕی (شۆپنهاوەر وەك مامۆستایەك) *1874*، پێوەی دیار بوو کە سەرەڕای سەرسامی زۆری بەو فەیلەسوفە مەزنە، جۆرە رقێکی بەرامبەر چەمکی (نیرڤانا) و خۆبەدەستەوە دان لەلا دروست بووە. ئەو پێی وابوو تەنانەت گەر گەردون بێ ئامانج و تەواو خاڵیش بێت لە مانا، بەڵام هەر مرۆڤێکی خاوەن ئیرادە دەمێنێت تا بەرووی ژیاندا دەنگ هەڵبڕێ و بڵێت: "بەڵێ".

ئەمەش لە پێناو خوڵقاندن و دروستکردنی مرۆڤی باڵاو، لە پێناو جۆرێك لە ژیانی بەرزو بڵند دایە. هەرچیەك رێگا لەبەردەم گەیشتن بەم ئامانجەدا بکاتەوە چاکەیەو، هەرچیەکیش کۆسپ و رێگر بێت خراپەیە. هەڵوێستی نیچە سەبارەت بەم مەسەلەیە لە وتارێکیدا بەناوی (زەرەرو زیانەکانی مێژوو بۆ ژیان) بەدەردەکەوێت. لە ساڵانی پڕ لە ژەنگ و ژاری زۆرو زەوەندا نیچە هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی بە ژیان بڵێت: (بەڵێ). هەر ئەم هەڵوێستەش بوو وای لێکرد لە هەریەك لە ڤاگنەر و شوپنهاوەر جیابێتەوە. سەرەڕای ئەو رۆڵە گرنگەی ئەوان لە قۆناغی سەرەتای ژیانی فیکری ئەودا بینیان.

نیچە وەختێك خۆی لەژێر کاریگەری شوپنهاوەرو ڤاگنەرو، هەموو جۆرە میتافیزیکایەکی رۆمانتیکیانە رزگارکرد، گرنگی دا بە تێڕوانینە زانستیە نیجابیەکان. لەمەودوا ئەوەی جێ بایەخی ئەو بوو رەخنەگرتنی ریشەیی بوو لە هەموو سیماو دیاردەکانی داوەشان و گەندەڵی ژیاری خۆرئاوا، چ لەسەر ئاستی فەردی بێت یاخود دەستەجەمعی.

سەرەتای ئەم کارەی بە رەخنەکردنی قۆناغ و سەردەمی خۆی دەست پێکرد، ئەمەش لە دوو بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا (مرۆڤانە، زێدە مرۆڤانە)دا بەدەردەکەوێت.

ئەوانەی لەم قۆناغەدا نیچە کەوتە ژێر کاریگەریانەوە زیاتر بیرمەندە فەرەنسیەکان بوون، نمونەکانیان وەکی: مۆنتان و، ڤۆلتێرو، رۆشوفۆکۆ و، ستاندال. هەروەها لەگەڵ چەندین نوسەری گەورەی تری وەك: ئیمرسۆن و دۆستۆیەفسکی. لە ئەڵمانیەکانیش نیچە نەیدەتوانی سەرسامی خۆی بەهەریەك لە گۆتەو شیللەرو هۆلدەرلین بشارێتەوە.

لە دوای ساڵی **1876**وە توانای بینینی کز بوو، هەروەها تەندروستیشی خراپتر بوو. بۆیە ناچار بوو شتەکانی خۆی بەهەریەك لە (پیتەر گازت) و (پۆل ری) بنووسێتەوە. ئەلیزابیسی خوشکیشی لەم ماوەیە زۆر بە تەنگیەوە بوو. ئەلیزابیس بە پێچەوانەی نیچەوە ئافرەتێکی عەمەلی و باوەڕ بەخۆ بوو، زۆر لە هەوڵی ئەوەدا بوو کەمێك ئێش و ئازارەکانی براکەی کەم بکاتەوە. بەڵام رۆژ بە رۆژ باری تەندروستی نیچە بەرەو خراپتر دەچوو، تا ناچار بوو ساڵی **1879** دەست لەکار کێشانەوەی خۆی وەك مامۆستایەك لە زانکۆی "بال" رابگەیەنێت. ئیتر لەو رۆژەوە بووە (وێڵگەردێکی ئەبەدی) و سەری بەهەموو جێگایەکدا دەکرد. هەندێ جار دەچووە سویسراو، پاش ماوەیەك رووی دەکردە ئیتالیاو فەرەنسا، جارناجاریش سەری ئەڵمانیاشی دەدا.

ئەو کاتانەی ئازارەکانی کەم دەبوونەوەو، هەستی بە پشوویەکی کورت خایەن دەکرد، زۆر بە گەرمی دەستی دەکردەوە بە نووسینەوەی هەموو ئەو شتانەی دەیویست بیاندرکێنێت. بەڵام لەبەرئەوەی رۆژبەرۆژ هاورێکانی لێی دوور دەکەوتنەوە، ئەمە وای لێکرد هەست بە تەنهاییەکی قوڵ بکات. هیچ یەکێك لەو کتێبانەی لە دوای (گورانی تراژیدیا)وە نووسینی، وەك (مرۆڤانە زێدە مرۆڤانە) و (سپێدەی رۆژ) و (زانستی شاد) پێشوازیەکی ئەوتۆیان لێنەکرا، نە لەلایەن خوێنەرانەوەو نە لەلایەن رەخنەگرانەوە.

## (6)

بەهاری ساڵی **1882** چووە ئیتالیا، خاتوو (مالڤیدا) داوەتی کرد بۆ ئەوەی بچێتە رۆماو وەختێ لەگەڵ دکتۆر (ری)دا بەرنە سەر. لەوێدا چاوی بە (لۆسالۆمی) کەوت، (لۆ) کچی ژەنەراڵێکی روسی بەناوبانگ بوو لە خانەدانەکانی (سان پەترۆسبۆرگ) و، بۆ خوێندن هاتبووە رۆما. سەرەرای ئەوەی بە تەمەن منداڵ بوو، بەڵام خاوەن کەسایەتیەکی بەهێز و، خانمێکی شۆخ و شەنگ بوو. هەر ئەمە وای لێکرد سەرنجی زۆرێك لە پیاوان بەلای خۆیدا رابکێشێت. ئەوانەی کەوتنە داوی خۆشەویستی ئەم خانمەوە ژمارەیان کەم نەبوو. سەرەتا دکتۆر (ری) فەیلەسوف پەیوەندی لەگەڵدا بەست. زۆرکات دکتۆر (ری) لە دانیشتنەکانیدا لەگەڵ (لۆسالۆمی) باسی نیچەی هاورێی بۆ دەکرد. (لۆ) خۆشحاڵی خۆی دەربری بۆ بینینی هاورێکەی. نیچە لەسەر داوای (ری) رووی کردە رۆماو، لەیەکەم دیداردا کەوتە داوی خۆشەویستی (لۆسالۆمی)یەوە. بیری لەوە کردەوە بیخوازێت و ژیانی هاوسەری لەگەڵ دروست بکات. ئەم داوایەی بە (ری) وت تا بیگەیەنێتە (لۆ). بەڵام (لۆ) داواکەی رەت کردەوەو، نەیدەویست پەیوەندیەکەیان لە هاورێیەتی زیاتر تێپەرێت. نیچە بەو وەڵامەی رازی نەبوو، بۆیە هەوڵی دیکەی بۆ خستەگەڕ. بەڵام دواجار هەمووی بە

شکست کۆتایی هات و لێکدی جیابوونەوە.
ئەوکاتەی لە یەکتر جیابوونەوە نیچە لە تەمەنی سی و هەشت ساڵان دا بوو. لە دەست دانی (لۆ) میحنەتێکی قورس بوو، وای لێهات بەبێ ئەفیون خەوی لێ نەدەکەوت. دوای ئەوەی ئەو ئەزموونە تاڵەی لەگەڵ (لۆ)دا بینی، تەواو دەستی لە ژن هێنان شۆری. نیچە بە ئیرادەیەکی زۆرەوە ئەو ئەهامەتیەی بڕی و، دوای ئەوە گەورەترین شاکاری فەلسەفی- شیعری خۆی نووسی: (زەرادەشت وەهای وت).


سەرچاوە:

1-یانکولافرین: نیچە- ترجمة: جورج جحا- المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت -الطبعة الاولى، 1973.

2-عبدالرحمن بدوي: نيچە -الناشر، وكالة المطبوعات، الكويت- الطبعة الخامسة، 1975.

3-د. فؤاد زكريا: نيچە- دار المعارف، القاهرة- الطبعة الاولى 1956.




خانووەکەی نیچە لە سیلس ماریا



نیچە لەسالی 1867 دا



نیچە بە جل و بەرگی عەسکەرییەوە



لۆ سالومە : خۆشەویستەکەی نیچەو هاوڕێی ریلکە



دایکی نیچه ( فرانسیسکا نیچه )



باوکی نیچه ( کارل لۆدڤیگ )



ریچارد ڤاگنەر



خوشکەکەی نیچه

# میراتی نیچە


■ کیت ئانسل پیرسۆن

● و. لە فارسییەوە: رێبین هەردی


"گومانی تیا نیە ئێمە هێشتا گوێگری بەك "ئۆدەبین"ین، ئێمە هێشتا پەیڕەوی کۆمەڵێ یاسای زبرو رەق دەکەین -ئەمەش دوا یاسایی ئەخلاقیە کە دەتوانێ خۆی بە گوێماندا بکەیەنێت.. ئێمە پیاوانی ویژدان کە ناماندەوێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو شتەی تەمەنی بەسەرچووەو بۆگەنی کردووە [ئێمە کە ناماندەوێت بگەڕێینەوە] بۆ شتێك کە "ئرخی باوەڕپێکردنی" نیە، جا ئیدی ناوی هەرچیەك بێت، خودا، چاکە، هەقیقەت، دادپەروەری، رەگەزدۆستی، ئێمە کە رێگە نادەین پردێك لە درۆ بە دروشمە کلاسیکیەکانەوە بمانبەستێتەوە، ئێمە کە دوژمنی هەموو جۆرە باوەڕ [ئیمان]، مەسیحیەتی ئەمڕۆ و دوژمنی هەموو جۆرە رۆمانسیەتێك و وڵات پەرستیەکین"

نیچە، بەرەبەیان، پێشەکی *1886*

### نیچەو چارەنوسی سیاسەتی ئەڵمانیا

وەك "گۆلۆمانی" مێژوناسی ئەڵمانی گوتویێتی، ئەڵمانیای بیسمارك نەك لەسەر بناغەی رێسا بەرزەفڕەکانی فەلسەفەی سیاسی کە یەکێتی ئەمەریکای لەسەر دامەزرابوو، بەڵکو لەسەر بناغەی پراگماتیزمێکی شێرانە بنیاد نرا"[1] بنیادنانی رایشی ئەڵمانیا نەك لەسەر بناغەی تێڕوانینە فەلسەفیە قوڵەکان لە بارەی خەسڵەتی مرۆڤ و کۆمەڵگاوە، بەڵکو لەسەر بناغەی جەنگ و داگیرکردن و ئیئتلاف و پەرلەمانی کومرگی کە بە بناغە باج وەرگرتن بوو، دامەزرابوو. بسمارك بە راگەیاندنی ئەو خاڵە دەسەڵاتی گرتە دەست کە حکومەتی "ئاگرو ئاسن" دەکاتە جێگری سیاسەتی "گوتاربێژیو بەیاننامە".

نیچە لەسەردەمی حکومەتی بیسماركدا کتێبەکانی خۆی نوسی و بەرگری لە فەلسەفە نیونیوسیسەکەی خۆی کرد. کاتێك بیسمارك دەسەڵاتی گرتە دەست، ئەو تەمەنی *17* ساڵ بوو *2* ساڵێکیش بەر لە لابردنی "سەرەك وەزیری ئاسنین" لە دەسەڵات، لە شێتیدا غەرق بوو. پەروەردەکردنی لە قوتابخانەی "پفورتا"

پەروەردەکردنێکی لیبرالیزمی کلاسیکی بوو. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە لایەنگری سەرسەختی ژیانەوەی لیبرالیزم بوو کە بە بڕوای ئەو بەهۆی ئاوێتەکردنی دروشمی کلتور *[Bildung]* (بە مانای هەوڵدانی تایبەتیکراو بۆ پەرەسەندنی دەروونی) لەگەڵ ئەو ناسیونالیزمە کلتوریەی لە لایەن یوهان گوتفرید هیردەرەوە (*1744–1803*) پێشکەش دەکرا، بە ئەنجام دەگەیشت[2]. فێرکارانی نیچە لە لیبرالە کلاسیکیەکان بوون بەو مانایەی بە نەرتیەکانی کلاسیزمی ڤایمارو ناسیونالیزمی پرۆسی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، دەناسرانەوە. هەروەها بیروباوەڕەکانی نیچە بەیاخی بوون لە پەروەردە دینیەکەی فۆرمەلە دەبوو. ئەوەی پێش خۆی دەیتوانی دابڕانی خۆی لە پاکژخوازی *Pitism* بە خەباتێکی دەروونی دلێرانە پێناسە بکات. بەڵام بەهۆی پاشەکشێی جیهانی پاکژخوازیەوە لە دەیەکانی *1850* و *1860*دا ئیدی ئەم پێناسەیە مومکین نەبوو. نیچەش وەك یاخیبوانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە کە لەناو نەریتی پاکژخوازیدا لە دایك بوو بوون، وەك ستریندبێرگ و ڤان کوخ، بە گران جێگەی خۆی لە خەبات دژی دیندا، دۆزیەوە، ئەوانەی شایەتی ئەمانی دەسەلاتی روحانیەت لە *1848*دا بوون، لە سەردەمێکدا گەیشتنە تەمەنی کامڵی کە مەسیحیەت دامالین لە نێوان پرۆتستانتەکاندا، خێرا بوو بوو. شکستی سیاسەتی دینی دەریخست کە کێشەی چارەنوسسازی روبەڕوبوونەوەی نیچەو هاوچەرخانی، ئادینی بوونی هەلومەرجەکانە. یەکێك لە ژیاننامەنوسانی نیچە پاش ئاوتوێکردنی نیگەرانی رۆحی ئەوەی نیچە، دەنوسێ: "ئاسینی بوونی هەلومەرج هەڕەشەی سەرگەردانی و ناڕەسەنی لێدەکردن، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوانی بەرەو ئەڵتەرناتیڤی شوناسێکی پاش دینی لە یەکەم "مرۆڤە تازەکان" دەبردە پێشێ"[3]. لایەنی دیاری گۆڕانی فکری سەرەتایی نیچە گۆڕانی هەڵوێست وەرگرتنی بوو لەبەرە سیاسی و دینیەکان.

نیچە لەناو رودانی دەسەلاتگرتنی بیسمارك و رووداوە سەیرەکانی دەیەی *1860*دا بوو کە گەیشتە کامڵی سیاسی. هاوچەرخانی ئەو خۆیان بە پێشڕەوانی بێ قەیدو شەرتی سەردەمی سیاسی و کلتوریی تازە دەزانی. نیچە لە سەرەتاکانی دەیەی *1860*دا لە رووی سیاسیەوە لایەنگری رەهای پاشایەتی بوو، پاشایەتی خوازی ئەو کە ئاوێتەی پێشینەی لیبرالیزمی کلاسیکی ئەو بوو بوو، رێزلێنان لە قارەمانانی مێژو، نەتەوە، رابەرانی مەزن و بیریارانی کلاسیکی بڵاو دەکردەوە. جەنگی پرۆس لەگەڵ نەمسا لە ساڵی *1866*دا، دیدی سیاسی نیچەی لە مەحەك دا، چەند هاوڕێیەکی بەشداریان لە خۆپیشاندان دژی جەنگ و دژی پرۆس دا کرد و یەکەم کاردانەوەی ئەویش لەبەرامبەر ئەم قەیرانەدا، پشتگیریکردنی بانگەشەی لیبرالانەی کرانەوەی پەرلەمانی ئەڵمانیا بوو بۆ رێگەگرتن لە مەترسی جەنگ. ئەو ئەم کارەی بە نیشانەی "سەرەڕۆی بسمارك بۆ دروستکردنی ئەڵمانیایەکی یەککگرتوو بەو شێوەیە"[4] دەزانی. بەڵام کاتێك جەنگ دەستی پێکرد نیچە بەرگری لە ماشێنی سەربازی پرۆس کرد، لەم سەردەمەدا تەفسیری ئەو پەشێویە گەورانەی بە چاوی خۆی دەبینی، بەهۆی فەلسەفەی بەدبینانەی "شوپنهاوەر"وە دەکرد. نیچە لەگەڵ سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکەکانی "پرۆس"دا بیری دەکردەوە "کە دەکرێ لەم کاتانەدا شتگەلێکی زۆر فێربین. زەوی کە ئەوەندە ئارام و سەقامگیر

دەردەکەوت، دەلەرزیّ. دەمامکەکان دەکەون، خۆپەرستی ئاشکرا دەبێت و لە هەموو ئەمانەش گرنگتر بۆمان دەردەکەویّ کە هێزی ئەندێشە چەند لاوازە"[5].

نیچە ئارەزوی دەکرد لە ریزی براوەکانا بێت. وەك پرۆسیەك لە "لایپزیگ"ی داگیرکراو، چووە ناو گروپێکی بچوکی لیبرالیە بیسمارکیەکانەوە کە خوازیاری دەست بەسەراگرتنی "زاکسن" لەلایەن پرۆسەوە بوون. رابەری بزوتنەوەی لایەنگری دەست بەسەراگراتن هاینریش خون ترایچکە بوو کە ئافەرینی شۆڕشی بسمارکی کردبوو وەك "شۆڕشێك لە سەرەوە" کە دواجار بە دروستکردنی ئەڵمانیایەکی مەرکەزی تازە، دووپارچەیی پرۆس و نەمسای لەناوبردبوو. نیچە لە دوایدا بە توندی رەخنەی ترایچکەی کرد کە چارەنوسی وابوو ببیّ بە مێژوناسی ناسیونالیستی بەناوبانگی رایشی نویّ، بەلاّم لەم وێستگەیەی ژیانیدا هەمان دیدی ترایچکەی بۆ دەوری پرۆس لە ئەڵمانیادا هەبوو. نیچە لە هاوینی *1868*دا راستەوخۆ لەگەڵ یەکەمین و دواهەمین خەباتی سیاسیدا دەستەویەخە بوو. ئەو بۆ یارمەتیدانی دروشمی پرۆس بووە پشتگیریکەری پڕ حەماسەتی "ناسیونال- لیبرالەکانی زاکسن" و لایەنگری گەرم و گوڕی نوێنەرەکەیان واتە شتیڤانی لە هەڵبژاردنی ناوچەیی "رایشتاگ" دامەزرێنەرانی کونفدرالیزنی باکوری ئەڵمانیا.. هەڵبژاردنێك کە گۆڕا بۆ هەمەپرسیەك لە بارەی دەوڵەتی نوێی بیسمارکەوە. "حیزبی ناسیونال- لیبرال" بەو مانایە ناسیونال بوو کە بەرگری لە ئیمپراتۆری ئەڵمانیا دەکردو بەو مانایەش "لیبرال" بوو کە بەرنامەکەی هەڵگری خواستە کلاسیکیەکانی لیبرالیزم بوو، وەك. ئابوری ئازاد، بازرگانی ئازاد، دەوڵەتی مەشروتە. خەسلەتی دیاری ئەم خەباتە تاوانبار کردنی دولایەنە بوو لە لایەن هەموو حیزبەکانەوە، چونکە وڵات پەرستانی ناوچەیی چەپرەو و راستڕەو دژی "خائینان"ی لایەنگری پرۆسی یەککگرتوو، یەکیان گرتبو. ئەم هەڵبژاردنە کارەساتێك بوو بۆ دروشمەکانی لیبرالیزم بەشێوەیەك کە ترایچکە رایگەیاند لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ئایندە نائومێد نیە بەلاّم هێشتا کاتی فەرمانڕەوای لیبرالیزم نەهاتووە. لە چەند ساڵی دواییدا بسمارك گەری نیچە وەك دڵساردی و بێزاری لە سیاسەتی حیزبی خۆی پیشاندا. سەرقاڵی سەرەکی نیچە لە دەیەی *1870*دا بریتی بوو لە سود وەرگرتن لە فەزای سیاسی تازە بۆ ژیانەوەی کلتوری تراژیدیاو بەدبینی کە لە فەلسەفەی شوپنهاوەرو موسیقای ڤاگنەرەوە وەری گرتبوو.. فەلسەفەو موسیقایەك کە بە بڕوای ئەو قوڵاییەکی تازەیان بە ئامانجە کلاسیکیەکانی پەروەردەو کلتوری ئەڵمانی دەبەخشی.

نیچەی دەیەی *1880* لەگەڵ نیچەی لاوی *1860* و *1870* دا زۆر جیاوازە. لەم قۆناغەدا نیچە دەبیّ بە رەخنەگرێکی توندی سیاسەتی مۆدێرنی ئەڵمانیا، بە وتەی یەکێك لەمێژونوسانی ئەڵمانیا، رەخنەگری وا وردبین لە هیچ جێگەو هیچ زەمەنێکدا هەرگیز بونی نەبووە"[6]. هەنوکە نیچە رایشی ئەڵمانیی بیسمارك وەك دەوڵەتێك دەبینیّ کە شانازی بە بیّ کلتوری خۆیەوە دەکات و سیاسەتی دەسەلاّتی خۆی بە رەوتگەلێکی نەژادپەرستانە، دەوڵەتخوازیانەو ناسیونالیستانە دەباتە پێشیّ. بە بڕوای ئەو دروشمەکانی ناسیونالیزم بەها کلاسیکیەکانی لیبرالیزمی خراپ کردووەو کلتوور چۆتە ژێر دەستی بیّ کلتوریەکی ترسناکەوە.

هۆیەکانی گۆڕانی قوڵی هەڵوێستی نیچە سەبارەت بە ڕایشی تازەی ئەڵمانیا بە ئەندازەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ پێگەیشتنی فکری و تێگەیشتن لەو خاڵەی کە هیواکانی سەرەتای بە تازەکردنەوەی ژیانی کلتوریی ئەڵمانیا، دروشمئامێز بون. ناڕازی بونی لە زیادی ئەو لە ڕایشی ئەڵمانیا پەیوەندیشی بە پچڕانی پەیوەندی لەگەڵ ریچارد ڤاگنەردا هەیە. ڤاگنەر خۆی سیمایەکی زۆر ئاڵۆز بوو کە لاوێتی خۆی بە بەرگریکردنی شۆڕشگێڕانە لە مافی مرۆڤەکان بۆ ژیان بە پێی ڕێساکانی خۆیان، دەست پێکرد،. ئەو لە سالّی **1860** دا بووە دەست پەروەردەو نوری چاوی باڤاریا کە ڤاگنەر ئامۆژگاری دەکردو وتاری لە بارەی سیاسەتی ئەڵمانیاو مانای ئەڵمانی بۆ ئەوە، بۆ دەنوسی. ڤاگنەر دواجار لەگەڵ ڕایشی بیسمارکدا ئاشتبۆوەو لە سالّی **1872**دا دەستی کرد بە دروستکردنی کۆشکی موسیقای خۆی لە بایرۆت. بڕیار بوو ئەم کۆشکە ببێ بە پەرەستگای هونەری ئەڵمانیاو ناوەندی یەکێتی نەتەوەیی. نیچە لە سەرەتا تا ناوەڕاستی دەیەی **1870** بەردەوام هاودەمی مامۆستاو ستایشکەری بوو، توانا فکریەکانی خۆشی بۆ پشتگیرکردن لە دروشمی ڤاگنەر، بەکار هێنا. نیچە ئومێدە سەرەتاییەکانی خۆی بۆ ژیانەوەی کلتوری تراژیدیا بە کۆشکەکەی ڤاگنەرەوە بەستەوە. ئەم کۆشکە بالکۆنێکی نەبوو کە نوێنەرایەتی جیاوازیە کۆمەلایەتیەکان بکات، ئامانجیشی تەنها پێشکەشکردنی نمایشە بازرگانیە پەتیەکان نەبوو، بەلکو هونەرەکانی بەشێوەی یەکێتیەکی نوێ کە شیعرو فەلسەفە، موسیقاو وێنەکێشان و پەرەستنی دینی دەگرتەوە، ئارێتە دەکرد. هەر لەبەرئەمەش بوو نیچە لە سەرەتادا بڕوای وابوو هونەری ڤاگنەرو ئەزمونی دیونیوسیس یەکپارچەیی و هاوئاهەنگی جیهان بۆ مرۆڤی مۆدێرن مومکین دەکات. بەلام نیچە هێواش هێواش لەو شتەی کە بە بڕوای ئەو رۆمانسیەت وشێتی خۆپەرستی ڤاگنەرە، رەنجاو لە دژ بە یەهودی بوونی ڤاگنەریش نیگەران بوو. جیابونەوەی نیچە لە ڤاگنەر لە هەمان کاتدا جیابونەوە بوو لە دروشمخوازی سیاسی و رۆمانسیانەی سەردەمی لاوی.

لەگەڵ ئەوەشدا کە نیچە لە دەیەی **1880**دا گۆڕا بە ڕەخنەگری بێ پەردەی ڕایشی بیسمارك بەلام هەر لە هەمان سەرەتاکانی دەیەی **1870**دا بێ متمانەیی خۆی سەبارەت بە حەساسیەتی ئەڵمانی ئاشکرا کردبوو. ئەو لێرە بەدواوە لایەنی دیاری ئەم حەساسیەتەی بە ڕەقی، بێ گیانی و حەماقەت زانی. ئەو لە نوسینە سەرەتاییەکانی خۆیدا بە وردی ئەو خاڵە دەڵێت کە مەسەلەی بنەڕەتی ئەو یەکپارچەیی بە مانای سنوردراوی سیاسی نیە، بەلکو یەکێتی رۆح و ژیانی ئەڵمانیە بەمانای کلتوری. ئەو هەڵوێستی خۆی لە یەکەم لاپەڕەی یەکەم بیرکردنەوەی ناکاوی خۆیدا لە بارەی دێڤید شتراوسەوە بە ڕونی دەردەبڕێ، هەڵوێستێك کە تیایدا لە نێوان "رۆح" (*Geist*)ی ئەڵمانی و "ڕایشی" ئەڵمانیدا جیاوازی گەلێك هەیە کە دەبێتە هۆی ڕوبەڕوبونەوەیان. نیچە لە کاتێکدا تەنها چەند ساڵێك بەسەر جەنگی فەرەنساو پروس و دامەزراندنی ئەڵمانیا وەك دەوڵەت و نەتەوەیەکی مۆدێرندا تێپەڕیوە؛ دەنوسێ رای گشتی ئەڵمانیا رێگە بە قوڵبونەوەی ورد لە بارەی مانای سەرکەوتن بۆ خەلکی ئەڵمانیا نادات. بە بڕوای ئەو یەکێك لە "دەرئەنجامە خراپەکانی" جەنگ، ئەو هەڵە بەربلاوەی رای گشتی ئەڵمانیایە کە پێیوایە گوایە لە جەنگی فەرەنسادا، کلتور (*Kultur*)ی ئەڵمانی

سەرکەوتوە. ئەو دەنوسێ "ئەم خەیاڵە *[توهم]* لە هەمووشتێ وێرانکەرترە" نەك لەو روەوەی کە خەیاڵە –چونکە بە بڕوای ئەو خەیاڵ و هەڵە دەتوانن بەرهەمهێن بن– بەڵکو لەبەرئەوەی سەرکەوتن دەکات بە شکست و "لەناوچونی رۆحی ئەڵمانی بە سودی رایشی ئەڵمانیا" دەگۆڕێت. (نیتشە، *1*، ص*3*). لە ئەڵمانیادا "چیدی هیچ تێڕوانینێکی ریون بۆ ئەوەی کلتور چیە، بونی نیە" (ه.س پ. ص*5*). نابێ ئەو شتانەی بوونە هۆی سەرکەوتنی ئەڵمانیا بەسەر فەرەنسادا وەك: لێهاتوی سەربازیانەی فەرماندە جەنگیەکان، دیسپلینی توندو یەکێتی و گوێ رایەڵی ریزەکانی سەربازان، لەگەڵ کلتوردا تێکەڵ بکەین.

نیچە لە بەرهەمەکانی سەردەمی پێگەیشتنی فکری خۆیدا، خۆی بە "دوا ئەڵمانیەکی دژ بە سیاسەت" ناو دەبا، بۆ ئەوەی خۆی نەك لە سیاسەت بە شێوەیەکی گشتی، بەڵکو بۆ ئەوەی خۆی لە سیاسەتی دزێوی ناسیونالیزم و دەوڵەتخوازی کە بە بڕوای ئەو بەسەر ئەڵمانیادا باڵادەستە، جیابکاتەوە. ئەو لە "ئێوارەی بتەکان"دا لەوە دەترسێ کە هاواری "ئەڵمانیا، ئەڵمانیای بەرزتر لە هەموان" "نیشانەی کۆتایی هاتنی بیرکردنەوەی جدی و کۆتایی هاتنی فەلسەفە لە ئەڵمانیادا بێ. (ئێوارە، "ئەوەی ئەڵمانیەکان خاوەنی نین"). جگە لەمەش نیچە لە ژیاننامەی خۆنوسی خۆیدا *[واتە]* لە "هەنوکە مرۆڤ"دا کە لە ساڵی *1888* دلو چەند مانگێك بەر لە کەوتنی نوسیوێتی و خوشکە دژ بە یەهودیەکەشی تا *1908* شاردبۆیەوە، بە توندی هێرش دەکاتە سەر ترایچکە ئەو دەنوسێ "ئەڵمانی" *[بوون]* بووە بە بەڵگەیەك و "ئەڵمانیا، ئەڵمانیای بەرزتر لە هەموان" بووە بە تێزێك و "توتن"*ە کان بون بە نوێنەری "سیستەمی جیهانی ئەخلاقی لە مێژودا.. ئێستا مێژونوسێك هەیە کە تایبەتی ئەڵمانیایە، تەنانەت بیردەکەمەوە مێژونوسینێکی دژ بە یەهودیەتیش هەبێ، مێژونوسینێکی دەربارەی هەیەو "ڤۆن ترایچکە"ش هیچ لێی تەریق نابێتەوە (هەنوکە "مەسەلەی ڤاگنەر"). بە بڕوای نتیچە "ناسیونالیزم" بە تەواوی مانا دەربڕینی "نەخۆشیەکی دژ بە کلتور"ە.

نیچە لە "لەسەرو چاك و خراپەوە" هەموان بۆ دارشتنی "سیاسەتێکی مەزن" بانگهێشت دەکات کە تیایدا نوخبەیەکی فەیلەسوفی– یاسادانەر ئەوروپا بۆ سەرو سیاسەتی دزێوی ناسیونالیزم، رێنمایی دەکەن و پەروەردەکردنی "ئەوروپاش باش" بڵاو دەکەنەوە. ئەم بەرهەمە سەرەڕای زیادەڕەویەکانی لە دەربڕیندا، بەردەوام دژی سیاسەتێکە کە نەژادپەرستی هاندەدات و بەتایبەتی هێرشی توند دەکاتە سەر ئەو سیاساتمەدارانەی ئەڵمانیا کەلە پێناوی بەرەوپێشخستنی سیاسەتی ناسیونالیزمدا، سود لە دژلیەتی یەهودیەت دەگرن (لە سەرو، *52*، *195*، *248*، *250*، *25*). ئەم کتێبە لەکاتی بڵاوبونەوەیدا بە کتێبێك ناسرا کە سوکایەتی بە ئەڵمانیەکان دەکات، چونکە لە سەر بناغەی "رێزلێینان لە یەهودیەکان" دامەزراوە[7]. تەوەرەی سەرەکی بیرکردنەوەی نیچە بریتیە لە پێداویستی "خۆباڵادەستی مرۆڤ" و لەگەڵ ئەوەشدا کە رەنگی دژلیەتی هیومانیزم لەلایەن نیچەوە سوکایەتی پێکردن بێت بە حەساسیەتە ئەخلاقیەکانی لیبراڵەکان، سوشیالیزمەکان و

---

* ناوی یەکێك لە تیرە دێرینەکانی نەژاد ژەرمەنە کە لە هەمان کاتدا بە هەموو ئەم نەژادەش دەوترێت. (و. ف).

مەسیحیە چاکەخوازەکان، بەلام هەرگیز بەهۆی نەژادپەرستی یان ناسیونالیزمەوە خۆی ئاراستە ناکات.

تێڕوانینی بەربلاو بۆ نوسەرێك کە دروشمی ئەوروپا کە لە بەرامبەر دروشمی ئەلمانیادا بەرز دەکاتەوەو هەموو شێوەکانی سیاسەتی نەژادپەرستی و بەتایبەتی دژایەتیکردنی یەهود، رەخنە دەکات وەك یەکێك لە بونیادنەرانی ئایدیۆلۆژیای نازیزم، کەم تا زۆر نەگونجاوە. سەرەڕای هەموو ئەو شتانەی کە لە پاش جەنگی جیهانی دوهەم بەدواوە لە بارەی نیچەوە نوسراوە، بەردەوام بەرەو روی ئەو مەسەلەیە دەبینەوە کە هەر کەسێك بۆ یەکەمجار، رودەکاتە بەرهەمەکانی بە تایبەتی لە بواری سیاسەتدا، هەر ئەم مانا شاراوانەی نازیستی لە نوسینەکانیەوە هەلدەهێنجێنن. ئەم پێکەوە گرێدانە چارەنوسسازەی نیچە لەگەڵ نازیزمدا چۆن دروست بوو؟

بلاوبونەوەو وەرگرتنی فەلسەفەی نیچە لە پاش تێکشانی دەرونیەوە لە سالی **1889**دا زۆر جۆراوجۆر بوو. بەرهەمەکانی یەکسەر لەلایەن راسترەوەکانەوە پێشوازی لێنەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا کە بانگەشە ئەرستۆکراتیەکانی و بێزاری لە سوسیالیزم/ زەمینەیەکی یارمەتیدەر بوو بۆ ئەم پێشوازیە. بە پێچەوانەوە بەرهەمەکانی نیچە تا دوو دەیەی پاش تێکشکانی دەرونی، جێی بایەخ و سەرنجی سوسیالیزمەکان، ئانارشیزمەکان و فەمەنیستەکان بوو کە هەموویان سەرقالی سەرەکی نیچەیان بە خواستی خۆدروستکردنی فەردی، دەزانی. بە بڕوای سوسیالیزمەکان بیروباوەڕەکانی نیچە لە بارەی کەسایەتی خولقێنەرەوە (*Personlihkeit*) دەیتوانی چەمکی زۆر پێویستی ئاکەکەسی رەسەن بۆ تیۆری سوسیالیزم زیاد بکات[8]. هەندێك لە هاوچەرخانی نیچە ئەویان بە سیمایەکی چەند رەهەندی دادەنا کە بەینی لەگەڵ هەڵوێستەکانی لایەنگری ناسیونالیزم و دەولەتخوازی ئەلمانیاش نیە.

باوەڕ نەبونیشی بە خوا نامۆی دەکرد بە پارێزگارانی ئەلمانی. لێرەوە هەڵوێستی نیچە نالۆز بوو، هەر ئەم نالۆزیەش دەریدەخات کە بۆچی نوسینەکانی ئەم دەیتوانی جێی سەرنج و بایەخی ژمارەیەکی زۆری خەلك بێت. وەك ئرنست نولتەی مێژوزانی ئەلمانی دەلێ ناوی ئەم لەم سەردەمەدا ئاشکراکەری "مەیدانی خەبات" (*Schlachtfeld*) بوو. خوێندنەرەی بەرهەمەکانی بۆ هەموو خوێندکارێکی ئەوروپی پێویست بوو، زۆرێکیش لە گرنگترین پیاوانی ئەم قۆناغە (لەوانە گوستاف لاندویر، بنیتۆمۆسولونی، کلاگیز، تۆماس مان، شتیفان، کتورگەو گابریل دانوتسیو) ئەو بەرهەمانەیان دەخوێندەوە[9].

ناوبانگی نوسینەکانی نیچە لە ئەلمانیای سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەمدا بوو کە سودوەرگرتنی نازیەکان لە نیچە ئەوی وەك لایەنگری ئایدیۆلۆژی نازیزم لە سەردەمی جەنگدا مومکین کرد (لە راپۆرتەکاندا هاتووە کە سەربازە ئەلمانیەکان لەکاتێکدا بۆ بەرەکانی جەنگ دەچون لە گیرفانێکی پالتۆکانیاندا کتێبی پیرۆزو لەوی دیانا "زەردەشت وای گوت" یان پێ بوو). نیچە بووە مەبەستی دروشمی نازیزم بۆ ئەوەی رەوایەتی فەلسەفی بەم بزوتنەوەیە بدات. ئەو هەنوکە لە ئاستی جیهانیدا بوو بوو بە فەیلەسوفێکی بەناوبانگ وتوێژ ووژێنەر کە بیروباوەڕەکانی بایەخ و هێزی فکری بە بیروڕای

نازیەکانی دەبەخشێ. ئەلیزابێتی خوشکی نیچە ڕۆڵێکی چارەنوسسازی بینی لەسڕانەوەی بیروباوەڕی نیچەو گۆڕینی بۆ فەیلەسوفی میلیتاریزم و ئیمپریالیزمی ئەڵمانی. ئەو کۆنترۆڵێکی تەواو پاشماوەی بەرهەمەکانی براکەی کردبوو، هەنوکەش بە شێوەیەکی بڕاوە ئاشکرا بووە کە ئەو نەك هەر ڕێگەی لە بڵاوبونەوەی دەست نوسە تایبەتیەکانی وەك "هەنوکە مرۆڤ" گرتووە بەڵکو دەستی بۆ بابەتەکانی نیچەش بردووەو نامەی بەناوی ئەوەوە نوسیوە[10]. ئەو چەند جار هیتلەری بۆ ئەرشیفەکەی نیچە دەعوەت کردو لە جارێکدا گۆچانەکەی نیچەی بەدیاری پێشکەش کرد (بە چ مەبەستێك؟ ئاشکرا نیە). پێدەچێ ویستبێتی بە پێشکەش کردنی نیچە بەو شێوەیە گرنگی و ناوداری خۆی زیاد بکات.

نازیەکان بەهاوکاری ئیلیزابێت نیچەیان کرد بە ناودارترین و پرخوێنەرترین فەیلەسوفانی ئەڵمانیاو جیهان، ئەوان نوسینەکانی نیچەیان لەبەرنامەی پەروەردەی خۆیاندا گونجان و تەفسیرو کەشکۆڵ و گوڵبژێری هەرزانیان لە بەرهەمەکانی بڵاوکردەوە. ژمارەیەك فەیلەسوفی زانکۆیی و پسپۆڕی ئەڵمانی وەك ئالفرێد بویملەر و ئالفرێد ڕۆزنبرگ کران بە لێپرسراوی پروپاگەندەکردن بۆ ئەندێشەکانی نیچەو ئامادەکردنی تەفسیرێکی نازیانەی دروست بۆ بەرهەمەکانی، بۆ نمونە بویملەر یەکێك لە یەکەمین بەرهەمەکانی لە بارەی سیاسەتی نیچەوە نوسی کە لە سالی ***1931***دا بەناوی نیچەی فەیلەسوف و سیاسەتمەدار بڵاوبۆوە. ئامانجی ئەم کتێبە تەفسیرکردنی نیچە بوو وەك فەیلەسوفی نەژادی نۆرد*. ئەم کارە بەهۆی کۆمەڵێ سادەکاری و شێوانی بیروباوەڕەکانی نیچەوە ئەنجام درا. هێرشی نیچە بۆ سەر خەڵکی ئەڵمانیا کە لە سەرتاسەری نوسینەکانیدا بەرچاو دەکەوێت، وەك هێرشی بۆ سەر ڕەگەزی مەسیحی و نائەڵمانی خەسڵەتی ئەڵمانیا، ڕون کرایەوە و هێرشی سەرزەنشت ئامێزی نیچە بۆ سەر هونەرمەندی مەزنی ئەڵمانیا، واتە ڤاگنەر، بە دەرئەنجامی حەسودی زانرا، فەیلەسوفانی دی تەفسیری ناشیانەتریان کردو یەکێکیان بەناوی "هایدنیش هێرتلە"وە کتێبێکی ڕێنمایکەری بەناوی "نیچەو ناسیونال سوسیالیزم"ەوە نوسی کە تیایدا ستایشی بیروباوەڕەکانی نیچە وەك بناغەی فەلسەفەی نازی، کرابوو.

نازیەکان بۆ سەرکەوتن لە بەنازیکردنی نیچەدا، سودیان لە ئامێری گومان لێکراو بەڵام زۆر کاریگەر، وەرگرت کاریگەرترین فێڵیان چاپی کۆمەڵێك گوڵچنی بچوك بوو لە "وتە نازیەکانی نیچە"[11]. ئەمانە بەناوی نیچەوە بەڵام بێ ئاماژەکردن بەوەی ڕێکخراون، بڵاو دەکرانەوە. لە ئەنجامدا خەڵك وایاندەزانی بەڕاستی وتەکانی نیچە دەخوێننەوە نەك هەڵبژێراوو تەفسیری ڕێکخەر. بۆ نمونە یەکێك لەم گوڵبژێرانە بەناوی "یەهودیەت، مەسیحیەت، ئەڵمانیەت"ەوە چەند پارچەیەك لە یاداشتە بڵاوکراو و بڵاونەکراوەکانی نیچە کە لەسەر بناغەی ناوەڕۆك پۆلێنکراون، پێشکەش دەکات. ئەو پارچە دەقانەی پەیوەندی بە یەهودیەکانەوە هەیەو پارچە دەقی بەناوبانگی "ئاژەڵی موبور" لە "جینالۆجیای ئەخلاق"دا لە

---

* نۆرد: نەژادی بڵند باڵا و سپی پێست و چاوشینی باکوری ئەوروپاو ئەڵمانیا کە بە لقێکی نەژادی ئارییەکان دەژمێردرێت (و. ف).

دەق هێنراونەتە دەرێ، بە شێوەیەك كە رێگە بۆ تەفسیری هەڵەی بەلگاندنەكانی نیچە دەكاتەوە. نازیەكان ناچار بوون. بۆ پیشاندانی نیچە وەك فەیلەسوفی ئەڵمانیا، ژمارەیەكی زۆر لە نوسینەكانی وەك ستایشكردنی كلتوری لاتین و هێرشەكانی بۆ سەر ناسیونالیزمی ئەڵمانی سانسۆر بكەن. بۆ نمونە چەمكی "ئاژەڵی موبور" چەمكێكی نازیانە نیە، چونكە بەتایبەتی عەرەبەكان و ژاپۆنیەكانیش دەگرێتەوە. _جینالۆجیا، *1* و *2*). نیچە هەرگیز بەهای تاكەكەس بە پێی بایەلۆژیا یان نەژاد پێناسە ناكات، بەڵكو ئەو بەهایە هەمیشە لەگەڵ "كلتور"دا پێناسە دەكات.

نمونەیەك بۆ ئەوەی چۆن نازیەكان بیروباوەڕو تێڕوانینەكانی نیچەیان بە نادروستی پیشاندەدا، لەلایەن "ژۆرژوباتای"ەوە كە بیریارو شاعیرێكی گەورەی فەرەنسایە، ئاشكرا كراوە. ئەو نمونەی ریچارد ئولیر دەهێنێتەوە كە كوڕی مام و هاوكاری خوشكە دژ بە یەهودەكەی نیچە بوو لە ئەرشیفدا و ئولیر لە كتێبەكەی خۆیدا بەناوی "نیچەو ئایندەی ئەڵمانیا" هەوڵدەدات نزیكایەتی قوڵی تێزەكانی نیچەو ئەو تێڕوانینانە پیشان بدات كە هیتلەر لە "خەباتی من"دا، بەرگری لێدەكات.

باتای ئەم پەرەگرافە لە كتێبەكەی ئولیر دەهێنێتەوە:

"گرنگترین خاڵ بۆ ئێمە بریتیە لەم ئاگاداركردنەوەیەی خوارەوە "هیچ یەهودیەكی دی قبوڵ مەكەن بەتایبەتیش دەرگاكان لەسەر خۆرهەلات دابخەن".. "ئەوەی لە ئەڵمانیا بە ئەندازەی خۆی یەهودی هەیەو ئەوەی كە تەنانەت گەدەی ئەڵمانی و خوێنی ئەڵمانی بۆ هەرس كردنی ئەم هێندە "یەهودی"ەش كێشەی هەیە (تا ماوەیەكی زۆریش كێشەی دەبێ) ئەمە لەكاتێدا كە ئیتالی و فەرەنسی و ئینگلیزەكان كە دەزگایەكی هەرسكردنی بەهێزیتریان هەیە، توانیویانە ئەم كارە بكەن- هەر ئەم گەواهە و زمانە رۆشنەی غەریزەی گشتیە كە دەبێ گوێی لێبگرین و بەپێی ئەویش كار بكەین"[12].

وەك باتای -كە بەناویانگترین بەرگریكەرو تەفسیركەری نیچەی دژ بە فاشیستە- پیشانی دەدا، ئەوەی لێرەدا بەرەو روی دەبینەوە نەك تەنها ساختەكاریەكی بێشەرمانەیە بەڵكو "درۆیەكی ناشیانەو هوشیارانەی دروستكراوە". ئەم رستانە لە پارچە دەقی "*251*"ی "لەسەرو چاكەو خراپ"ەوە هێنراونەتە دەرێ. كاتێ بۆ ئەم پارچە دەقە دەگەڕێینەوەو بەدروستی دەیخوێنینەوە سەرنج دەدەین كە ئەو بڕوایانەی راگەیاندراون، تێڕوانینەكانی نیچە نین، بەڵكو بیروباوەڕی دژ بە یەهودین كە نیچە هەڵیبژاردون بۆ ئەوەی گاڵتەیان پێ بكات:

هێشتا هیچ ئەڵمانیەكم نەبینیوە كە دڵخۆشیەكی لە یەهودیەكان هەبێت، هەرچەند هەموو ئەو كەسانەی كە زیهنێكی ئارام و سیاسیان هەیە دژلیەتیكردنی یەهودیان ***Antisemiterei*** بێ چەندو چون رەد كردۆتەوە، ئەگەرچی ئەم سیاسەت و ئارامیە لەگەڵ بونیادی ئەم هەستەدا جەنگ ناكات، بەڵكو لەگەڵ زیادەڕەوی ترسناكی ئەم هەستەدا نیە، بەتایبەتی لەگەڵ ئەو شێوە شەرم ئامێزو توندەدا كە ئەم هەستە توندڕەوە خۆی تیا دەردەخات- لەم بارەیەوە مافی ئەوەمان نیە خۆمان هەڵخەڵەتێنین. ئەوە كە ئەڵمانیا.. هتد*

---

* ئەم پەرەگرافەم لە دەقی كتێبەكەوە وەرگێڕاوە كە لەلایەن "داریوش ئاشوری"ەوە كراوەتە فارسی.. واتە

*26-Luce Irigaray, Speculum of the other Woman (1974), trans. G. C. Gill (New York: Columbia University Press, 1985), p. 224.*

*27-Luce Irigaray, Marine Lover of Friedrich Nietzsche, trans. G. C. Gill (New York: Columbia University Press, 1991), p. 25.*

*28- ibid., p. 23.*

*29- ibid., p. 34.*

*30-See Peter Sloterdijk, "Eurotaoism', in Tom Darby et al. (eds.), Nietzsche and the Rhetoric of Nihilism (Ottowa, Ontario: Carleton University Press, 1988), pp. 99-116, at 110-11.*

*31- ibid., p. 110.*

*32-Diana Coole, Women and Political Theory (Brighton: Harvester Press, 1988), p. 3.*

*33-Helene Cixous and Catherine Clement, The Newly Born Woman, trans. B. Wing (Minneapolis: University of Minnesota Press, 1986), p. 81.*

*34- ibid., p. 83.*

*11- ibid., p. 101.*

*12-Kelly Oliver. "Woman as Truth in Nietzsche's Writing", Social Theory and Practice, 10:2 (1984), 185-99, at 187.*

*13- ibid., p. 188.*

*14- ibid., p. 193.*

*15- ibid., p. 195.*

*16- ibid., p. 196.*

*17-Winders, Gender, Theory, and the Canon, p. 121.*

*18-Derrida. Spurs, p. 107.*

*19-Kelly Oliver. "Nietzsche's Woman: the Poststructuralist Attempt to do away with Women' , Radical philosophy, 48 (Spring 1988); 25-9.*

*20-Rosi Braidotti, "The Ethics of Sexual Difference: the Case of Foucault and Irigaray' Australian Feminist Studies, 3 (1986), 1-13, at 2.*

*21-Adrian Del Caro, "the Pseudoman in Nietzsche, or the Threat of the Neuter', New Gennan Critique, 50 (Spring/ Summer 1990), 133-56, at 145.*

*22- ibid., p. 150.*

*23-Sarah Kofman, "Baubo: Theological Perversion and Fetishism', trans. T. B. strong, in T. B. Strong and M. A. Gillespie (eds.), Nietzsche's New Seas (Chicago: University of Chicago Press, 1988), pp. 175-202. at p. 197.*

*24- ibid.*

*25-See Toril Moi, Sexual / Textual Politics (London: Routledge, 1988), pp. 127-50 for such a critique of Irigaray.*

# نیچە

## -گفتوگۆ لەگەڵ جەی. پی ستێرن دا-


■ برایان ماگی

● و. لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی


**پێشەکی:**

ماگی: هەر لیستێك بەناوی هەڵبژاردەیەك لەو فەیلەسوفانەی سەدەی نۆزدەهەم کە لە دەرەوەی بواری فەلسەفەدا فراوانترین کاریگەرییان هەبووە، لانی کەم دەبێ ناوی هیگل و مارکس و شۆپنهاوەر و نیچە لەخۆبگرێت. نیچە تەنانەت لە ئەوروپادا (جگە لە بەریتانیا) کاریگەرییەکی بێ سنووری لەسەر فەیلەسوفانیش هەبووە، بەڵام تا ماوەیەك لەمەوبەر جگە لە گەللەرەقی و بەدگومانی و فەرامۆشکردن هیچ شتێکی تری لەلایەن فەیلەسوفانی ئینگلیزەوە پێ رەوا نەبینراوە.. بەم دواییە کارەکانی بەشێوەیەکی دیار بۆتە جێی بایەخێك کە رۆژانە روو لە زیادبوونەو بۆ یەکەم جاریشە فەیلەسووفانی شیکاریی زمان (یان زمانشیکاری) گرنگیی پێ دەدەن. هەڵبەتە نیچە هەمیشە کاریگەریی قووڵی لەسەر هونەرمەندان -لەوانە هەندێ لە دیارترین نووسەرانی ئینگلیز، وەکو برنارد شۆ و یێتس و لۆرەنس- هەبووە. جوانیی پەخشانی خۆی شتێکی سەرسوڕهێنەو لەم رووەوە کەس شان لە شانی نادات.

فریدریش نیچە لە ساڵی *1844*دا لە ویلایەتی ساکسۆنی (لە ئەڵمانیا) هاتە دونیاوە. کە چووە زانکۆ، لە زمان و زانستەکانی لاتینی یۆنانیدا زیرەکێکی بێ وێنە بوو. هێشتا تەمەنی بیست و چەند ساڵێك دەبوو کە بە کورسی مامۆستایی گەیشت، ئەمەش شتێك بوو لەو رۆژگارەدا دەگمەن بوو. بەڵام دواتر وازی لەوانە وتەوەو لە زانکۆ هێناو گۆشەگیریی هەڵبژاردو بوو بە فەیلەسووف. بۆ ماوەی شانزە ساڵ بەردەوام خەریکی نووسین بوو. زۆربەی نووسینەکانی بریتین لە کتێبی قەوارە بچووك یان لە وتارو پەندو پەرەگرافی کورت. لە کتێبە بەناوبانگەکانی: لە دایکبوونی (یان سەرهەڵدانی) تراژیدیا، مرۆڤدۆست.. فرە مرۆڤدۆست، زانستی شاد، ئەودیو چاکەو خراپەو جینالۆجیای ئاکار، لەهەموو ئەمانەش بەناوبانگتر کتێبی زەردەشت وای وت (یان زەردەشت وەها ئاخافت)ە. سەرەتا بە قووڵی لە ژێر کاریگەریی بیروڕاکانی شۆپنهاوەرو ڤاگنەردا بوو، بەڵام پاشان لێیان یاخی بوو و کار گەیشتە ئەوەی کە هەندێ لە دیارترین نووسینەکانی دژی ڤاگنەر بنووسێت. نیچە تا چوار ساڵ بەر لە کۆتایی قۆناغی داهێنەرانەی لە ژیاندا، خەریکی دامەزراندنی هیچ سیستمێکی فیکری نەبوو. بەڵام دواتر وردەوردە بیری لەوە کردەوە کە هەموو بابەتە سەرەکییەکانی خۆی لەیەك بەرهەمدا کۆبکاتەوە کە دەیویست ناوی لێ بنێت ئیرادەی هێز یان هەڵسەنگاندنەوەی بەهاکان. بەڵام رۆژگار بە ئاراستەیەکی تردا رۆی. نیچە بەردەوام نەخۆش بوو تا لە کانوونی دووەمی *1889*دا ئەو نەخۆشیە دەروونیەی کە دوچاری بوو، کە لەوە دەچێت لە ئەنجامی سیفلیسەوە تووشی بووبێت، بە تەواوی پەکی خست و تا کاتی مەرگی لە ساڵی *1900*دا، کەوتە چنگی شێتیەوە.

ئەو کەسەی ئێستا لە گەڵمدایە تا پێکەوە دەربارەی نیچە بدوێین، پرۆفیسۆر (جەی. پی. ستێرن)ە، کە مامۆستای زمانی ئەڵمانیە لە زانکۆی لەندەن و، نووسەری یەکێکە لە کتێبە بەناوبانگەکان سەبارەت بە نیچە.

**ماگی:** نیچە یەکەمین فەیلەسووف بوو کە بە تەواوی ئەو راستیەی رەچاوکرد و رووبەڕووی بۆوە کە خەلکی خۆرئاوا باوەڕی خۆیان بە ئایین و بوونی هەرجۆرە دونیایەکی تر لە دەستداوە. ئەگەر خواو ئەو دنیا نەبێت، کەواتە دەبێ ئەوە قبووڵ بکەین کە مرۆڤ ئاکارو بەهاو حەقیقەت و پێوانە ئەقلّیەکان و هیچ جۆرە پێوەرێک لە دەرەوە خۆی وەرناگرێ و هەموو ئەوانە خۆی وەکو کاردانەوەیەک بۆ پێداویستیەکانی خۆی دەخولقێنێت. ئێمە خۆمان بەهاکانی خۆمان هەڵدەبژێرین، یا بمانەوێ زۆر دەست دانەگرین دەبێ بڵێین بەهاریەشی لەگەڵ ئەوانی تردا دەیخولقێنین. تیۆرەیەکی لەم جۆرە زۆر بیربزوێنەو تەواو ئاشوبگێڕانەیەو نیچە تەواو لەم شتەش بەئاگابوو. ئێوە لەو بڕوایەدان بتوانین لێرەوە باسەکەمان دەستپێبکەین؟

**ستێرن:** بەڵێ، لەو بڕوایەدام زۆر رەوایە کە لێرەوە دەستپێبکەین. سەرباری ئەو شتانەی ئێوە دەربارەی ژیانی نیچە وتتان، بەڕای من دەبێ باسی ئەوەش بکەین کە ئەو کوڕی خێزانێکی روحانی بوو. باوکی، کە بەرلەوەی نیچە پێ بنێتە پێنج سالانەوە، کۆچی دوایی کرد، قەشەی کلّێسایەکی لۆتەری بوو. دایکی حەزی دەکرد کوڕەکەی ببێ بە قەشە. نیچە چووە قوتابخانەی شۆلپفۆرتا، کە بەناوبانگترین قوتابخانەی شەوانەڕۆژی پرۆتستانتەکان بوو لە ئەڵمانیاو، کاتێکیش چووە زانکۆی بۆن، سەرەتا (عیلمی کەلام)ی خوێند.

هێرشی ئەو بۆ سەر ئایینی مەسیحی هێرشێکی توندو پڕچەنجاڵیەو رەنگە لە هەندێ رووەوە پڕهەڵچوونیش بێت نەک رووبەڕووبوونەوەیەکی بێلایەنانەو ئاشتیئامێزانە. هێرشێکە بۆ سەر مەسیحیەت نەک بۆ سەر عیسای مەسیح، ئەو خاڵەی باسیشت کرد کە بەو پێیەی نیچە دەستنیشانی کردووە، مرۆڤی سەدەی نۆزدەهەم دەبوایە بەبێ خۆهەڵپەساردن بەسەر دلرەعەسای ئیمان و هەرجۆرە پرەنسیپێکی دۆگماتیکدا و، بەتەنها لەسەر پێیەکانی خۆی بوەستایە، بە بڕوای من ئەم خاڵە لایەنێکی تەوەریی بەخۆوە دەگرێ سەرەتایەکی باشیشە بۆ تێفکرین سەبارەت بە فەلسەفەکەی ئەو. ئێمە دەبێ بەو چاوەوە سەیری ئەو بکەین کە وەکو تاکەکەس لە قووڵایی بوونیەوە نکوڵیی لە دادی خودایی و بەزەیی یەزدانی و دەسەڵاتی فراوانی دین کردووە، نەک وەکو ئەوکەسەی کە تەنها لافی جۆرە خودا نەناسیەکی بێ تام و بێ ناوەرۆک لێدەدات.

**ماگی:** ئەو ڕێیەی نیچە گرتبوویە بەر سەرەنجام گۆڕا بۆ بەرنامەیەکی گومانکردن لە تەواوی بونیادە فیکریەکانی خۆرئاوا. نیچە دەڵێت ئێمە دیلی داب و نەریت و پەیمانەکانین و ژیانمان لەسەر بناغەی کۆمەڵێک ڕێکەوت دادەڕێژین کە ئەگەر بێت و ئەو شتانەی لەم ڕێکەوتانەدا وەکو بەلگەنەویست وەرمانگرتووە بخەینە ژێر لێکۆڵینەوەوەو لێیان رابمێنین، رەتیان دەکەینەوە. بەم جۆرە، شێوەی ژیانمان شێوەیەکی ناڕەسەن و بێ رۆحە. پێویستە لە سەر بناغەی ئەو شتانەی کە بە راستی هەستیان پێدەکەین و بڕوامان پێیانە، دووبارە بەهاکانمان هەڵسەنگێنینەوە.

**ستێرن:** راستە، نیچە باوەڕی تەواوی بەوە بوو و لەهەمان کاتدا هەوڵی دەدا پیشانیشی بدات کە هەم ئەو ساختومانەی لەسەر بناغەی بەهاکانی مەسیحیەت بیناکراوە بێپایەو ساختەیەو دەبێ سەرنگون بکرێ، هەم ئەو ساختومانەش کە ئایدیالیستەکان بەسوود وەرگرتن لەو بەهایانە

بینایان کردووە. شتێکی دی دەبێ جێیان بگرێتەوە. هەڵبەتە ئەوەی کە چ شتێك دەبێ جێیان بگرێتەوە شتێکی ئاسان نیە؛ ئەوە ئەو مەسەلەیە بوو کە ئەو بە بەڵگەنەویستی دەزانی و بە پرنسیپی دەژماردو سەرگوزشتە– و لە راستیدا هەرا–ی نیچەو شێوازی کاری و تەواوی دیاردەی نیچە لەمەوە سەرچاوەی دەگرت. بەزۆری وا دێتە بەرچاویش کە نیچە لەزۆر رووەوە لە فاوست[1] و پیرگینت[2] دەچێت، کە دوو روخساری نموونەی درامای چاخی نوێن، زیاتر لەوەی لەو فەیلەسوفانە بچێت کە تۆ لەم کتێبەدا باست لێ کردوون. هەڵبەتە لێرەدا من مەبەستم لەوە نیە کە نابێ وەکو فەیلەسووفێکی جیددی سەیری بکەین. بە پێچەوانەوە، بەرای من دەبێ ئەو وێنایەی بۆ پێناسەی فەیلەسووف هەیە فراوانتر بکرێ.

**ماگی:** دووبارە هەڵسەنگاندنەوەی بەهاکان کە نیچە پێشنیاری دەکات کارێکی زەبەلاحەو باسەکەمان روونتر دەبێتەوە ئەگەر بابەتەکەمان بەش بەش بکەین. نیچە هێرشی کردۆتە سەر چوار نەریتی سەرەکی لە ژیاری خۆرئاوادا: نەریتی ئاکاری مەسیحی، نەریتی ئاکاری دونیایی کە فەیلەسووفانی ئاکار دامەزرێنەری بوون، ئاکاری رەمەکی و رۆژانەی خەڵکە نارۆشنبیرەکان (یان وەك خۆی ناوی نابوو "بەهاکانی گەلەی عەوام")، دواجاریش لانی کەم بەشێك لەو نەریتەی بەمیراتی لە یۆنانی کۆنەوە ماوەتەوە. بەتایبەتیش سوکرات.

با بەتۆرە چاوێك بەهەریەك لەمانەدا بخشێنین، ئەکرێ دەربارەی رەخنەی بنچینەیی نیچە لە بەها مەسیحیەکان کەمێك بۆمان بدوێیت؟

**ستێون:** بە بڕوای من هێرشی ئەو بۆسەر سیستەمی بیروباوەڕو ئامانجەکانی مەسیحیەت گەلێ سادەو سەرراستانەیە. تەواوی بەها پۆزەتیڤەکانی مەسیحیەت دەخاتە بەر رەخنەو رەتیان دەکاتەوە: وەکو ئەوەی دەڵێت ئەگەر زللەیەکیان لەملات دا ئەولاشتیان بدەرێ، هاوسێکەت وەکو خۆت خۆشبوێت، خەمخۆرو هاوسۆزی ستەمدیدەکان بە، هاوخەمی ئەو کەسانەبە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان بەش خوراون و ئێمە پێیان دەڵێین "چەوساوەکان" (ئەم زاراوەیە کە نیچە بە بیستنیشی بێزار دەبوو). هەموو ئەمانە بێ بایەخ دەبن، بەڵام نەك بەشێوەیەکی رەهاش، چونکە هەروەکو دواتر دەبینین –حەزیش دەکەم تەواو ئەم خاڵەتان لا روون بێ– نیچە بەردەوام سەرگەرمی خولقاندنی رێسای تایبەتە بۆ کەسانی تایبەت و بەتوندی دژی بە گشتیکردن و تەشەنەدانە بە رێسا– واتە وەکو ئەوەی کانت سەبارەت بە "کاری رەها" کردوویەتی–. کەواتە یەکەمین شت ئەوەیە کە هێرشەکەی نیچە ئاراستەی مەسیحیەت کراوە نەك کەسی عیسای مەسیح خۆی، لەبەرئەوەی بە بڕوای ئەو، مەسیحیەت لە راستیدا لایەنگری دۆڕاوەکانە، لایەنگری کەسانێکە کە ناتوانن لەسەر پێی خۆیان بوەستن و پێویستیان بە خەڵکانێك هەیە خەمیان بخۆن، پێویستیان بە سۆزو بەزەیی هەیەو بەشێوەیەکی ناشایستە دەیانەوێ کەسانێك لە دەرەوە هاوخەمیان بن.

**ماگی:** نیچە بۆچی دژایەتی هاوخەمی دەکردو ئەوەندە لێی پەست بوو؟

**ستێون:** ئەگەر خەمخۆریەکە لەلایەن کەسێکی بەهێزەوە بێت، نیچە لەگەڵیدا ناکۆك نیە. ئەوەی ئەو لێی پەستە پشتگیری کردنی ئادەمیزادی لاوازە، ئیدی سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت: لە

کەسێکی دیکەو هەستی هاوخەمییەوە بێت، یان لە ڕێساو داب و نەریتەوە، یا لە یاساو هەر شتێکی ترەوە بێت.

**ماگی:** هۆی ئەو دژایەتی کردنە چی بوو؟

**ستێون:** هۆی ئەو دژایەتی کردنەی پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە نیچە لە بنەڕەتدا خوازیاری ئەوەیە کە ئادەمیزاد لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ بێت و لە چالاکیی ژیان (*elan vital*) وەربگرێت و لە ناوەوەیدا لێوانلێو بێت لە ژیان. ئەوکات بەزەیی و هاوخەمی، بۆ کەسێکی وەها کە دەبێ پڕبێت لە ژیان، دەبێتە مایەی نەنگی. هاوخەمی کەسێکی لەم جۆرە، لاوازو زەبوون دەکات.

**ماگی:** دژایەتی کردنی نیچە بۆ ئاکاری دونیایی و نادینی -واتە بۆ ڕێبازی پایەداری فەلسەفە ئاکار- چی بوو، کە کەسانێکی وەکو "کانت" لایەنگری بوون، یان لە سەردەمی نیچە خۆیدا پەیڕەویکەرانی "سوودگەری" لایەنگری بوون؟ خۆ ئەمیان مۆرکێکی مەسیحیانەی بەخۆوە نەگرتبوو، کەچی نیچە بە هەمان ڕادە لەگەڵیدا ناکۆک بوو. بۆچی؟

**ستێون:** وای بۆ دەچم هۆیە سەرەکیەکەی ئەوە بێت کە هەر سستمێکی ئاکاری دونیایی و نادینی لەسەر بناغەی بەگشتی کردنی مەسەلە تاکەکەسیەکان دادەڕێژرێ پایەکەی پشت بەستنە بە لایەنی گشتیی مەسەلەکان. بەڕای نیچەش "گشتی" و "ڕەمەکی" (بەمانا ئاشرین و سووکەکەی ئەم وشەیە) یەك شتن. بە بڕوای نیچە بالاترین پلەی گەورەیی و باشی لە مرۆڤدا زۆر دەگمەنە هاوتا لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا، بۆچوونێکی دی هەیە کە دەڵێت خۆبەستنەوە بە چارەنووسی هاوبەشی ئادەمیزادەکانەوە بەناچاری واتە خۆبەستنەوە بە نزمترین فاکتەرەکانەوە تیایاندا، واتە ئەو شتەی کە مایەی کەمترین تایبەتمەندی و دەرکەوتنە. کەواتە بەم مانایە، هەرچی ڕێساو دەستوورەکانە -تەنانەت دەشێ بتوانین بڵێین تەواوی یاساکانیش- بەڕای ئەو شایانی گەلەی عەوامەو بەس. لێرەدا دەگەین بە سێیەمین بەشی ئاکار - واتە ئاکاری گەلەی عەوام- کە ئامانجی هێرشەکەی نیچەیە، نیچە بە هیچ جۆرێك فەیلەسوفی لایەنگریی دیموکراسی و عەوامی خەڵك نیە. ئەو فەیلەسوفی ئادەمیزادە گەورەو بالاکانەو، بەم پێیە، ئایدیۆلۆژیای دیموکراسی یان حکومەتی خەڵك بەلای ئەوەوە بچووکترین بەهای نیە.

**ماگی:** من وای بۆ دەچم ئەو بڕوای وابوو کە ئادەمیزادی گەورەو بالا، واتە قارەمان، یاسای خۆی هەیەو نابێ بەو شتانەوە ببەسترێتەوە کە بەسەر کەسانی ڕەمەکیدا دەسەپێ و، کۆتی دەست ڕێساو دەستووری سووك و نزم بێت.

**ستێون:** ڕێك وایە. باشترین گوزارشت کە دەبوو بەکاری بهێنێت ئەمە بوو کە هەر ئادەمیزادێکی گەورە خاوەنی یاسای خۆیەتی. هەڵبەت نیچە دەقی ئەم ڕستەیەی بەکارهێناوە، بەلام ڕێك مەبەستی ئەمە بووە.

**ماگی:** لەو چوار نەریتەی کە ناومان بردن نەریتێك دەمێنێتەوە کە ئەویش نەریتی یۆنانی کۆنە. لەم بوارەشدا نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە نیچە یەکێك بوو لە زانا درەوشاوەکانی زمان و زانستە لاتینی و یۆنانیەکان و زانیاریی قووڵی دەربارەی یۆنانی کۆن هەبوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا دوژمنێکی سەرسەختی تەواوی ئەو نەریتە بوو کە لە سوکراتەوە سەرچاوە دەگرت.

**ستێون:** بەڵێ، بەلام ئەو کارە ئەمرو گرنگەی کە ناوی "لەدایکبوونی تراجیدیا"یە و، بەڕای من یەکێکە لە درەوشاوەترین کارەکانی کە تا ئێستا

دەربارەی مەسەلەی تراژیدیا نووسراوە، پەیوەستە بە تراژیدیاو یۆنانی بەر لە سەردەمی سوکرات. نیچە قۆناغی پێش سوکرات بە جۆرە سەردەمێکی زێڕین دەزانێو پاشان، کاتێ یۆرپیدزو ئەریستۆفانیزو سوکرات دێنە مەیدانەوە، هەموو شتێك بێ ڕۆح و بێ ڕەنگ دەبێت. ئەوەی (لەگەڵ هاتنی ئەماندا) ڕوودەدات ئەوەیە کە هێزو خواستی چاکەو گەرم وگوڕی و جولی– و هەروەها پەیبردنی تەواو بە بوونی تراژیکی مرۆڤ– جێی خۆیان بۆ ئەقڵ چۆڵ دەکەن، جێی خۆیان دەدەن بە شتێك کە بە ڕای نیچە، هەموو شتەکان لە قاڵبی مەنتیقدا دادەڕێژرێت و مەزنی لە هەموو شتێك دەسەنێتەوەو درێژدادڕییەکانی سوکرات دەخاتە جێی ڕوانینە قووڵەکانی کۆنەوە بۆ تراژیدیای بوون. نیچە هەرگیز لەو تەخسیرییەی ئەفلاتون خۆش نەبوو کە کەسێکی کرد بە قارەمان کە گەورەترین هونەری ئەوەبوو بە قسە پشتی هەموو کەسەکان لە زەوی بدات.

**ماگی:** بایەخدانی نیچە بە سەرچاوەی کەلتوور کە بە تەرزێکی وەها دەوڵەمەندو ناواخندار پیشاندراوە، بەندە بەو وێنایەی ئەوەوە کە ئێمە خۆمان بەهاکانی خۆمان دەخولقێنین. مەبەستم لەمەش ئەوەیە کە ئەگەر بەها مرۆییەکان دروستکراوی خودی خۆمان بن و نە لە خواو نە لە هیچ سەرچاوەیەکی دەرەوەی خۆمانەوە سەرچاوەیان نەگرتبێت، ئەوا مەسەلەیەك کە گرنگیەکی سەرەکی پەیدا دەکات بەم جۆرە دەبێت: کەواتە ئێمە چۆن ئەو بەهایانە بەدەست دەهێنین؟ هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین کە بایەخدان بە بنەچەی شتەکان، یەکێك بوو لە خەسڵەتەکانی سەدەی نۆزدەهەم. وەکو نمونەش ئەوەندە بەسە کە کتێبی "بنەچەی جۆرەکان"ی داروین بخەینە بەرچاومان... ئایا ئێوە لەو بڕوایەدان کە نیچە کەوتبووە ژێر کاریگەریی "داروین"ەوە؟

**ستێرن:** بەڵێ، بەڵام بە ئاراستەی دژی داروین. بڕواناکەم نیچە هەرگیز دەرکێکی ڕوونی سەبارەت بەوە هەبووبێت کە تیۆرەی بنەچەی جۆرەکان بەچی کۆتایی دێت، یان دەشێ وا ڕەواتر بێت بڵێین کە نیچە بە دروستی دەرکی بەو بەڵگانە نەدەکرد کە داروین بۆ سەلماندنی تیۆرەکەی دەیهێنانەوە. ئەو هەمیشە سەبارەت بەم مەسەلەیە تێڕوانینێکی دژانەی هەبوو کە بۆچی داروین بە چاوپۆشین لە ئەنجامە ناکارییەکان بەڵگەکانی خۆی دەسازێنێت. نیچەش وەکو زۆربەی کەسێتیەکانی سەردەمی خۆی لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەردەوام دەیویست فسیۆلۆجیا یا کیمیاو یا فیزیا بخوێنێت، بەڵام ئەوەی هەر بۆ نەڕەخسا. لەبەرئەوە بە بڕوای من پێویست ناکات گرنگیەکی زۆر بدەین بە کارلێکیەوە لەگەل داروین دا. بەڵام خاڵی سەرەکی سەبارەت بە مەسەلەی گشتی سەرچاوەی شتەکان ئەوەبوو کە نیچەش وەکو زۆر لە فەیلەسوفان، لەنێویشیاندا مارکس، لەو بڕوایەدا بوو کە تۆ دەتوانیت چۆنێتی هەر بەرهەمێك و بەتایبەتیش بەرهەمی زەینی مرۆڤ بەپێی ماهیەت و چۆنێتی سەرچاوەی ئەو بەرهەمە دیاری بکەیت.

تا ڕادەیەکی زۆر ئەمە ئەو کارە بوو کە فرۆید کردی و، بەڕای من، ئەو بە ئەنقەست ئەم تەرزەکارە لە نیچەوە فێر ببوو، هەرچەند بە ئاسانی ئامادە نەبوو دان بەو کاریگەرییەی نیچەدا بنێ لەسەری. مەبەستی ڕاستەقینەش لەم چەمکە ئەوەیە کە پێشینەو زەمینەی هەر شتێك –بۆ نموونە جینالۆجیای ئاکار، کە هەروەکو

وتتان یەکێکە لە کتێبەکانی نیچە– لە راستیدا سەبارەت چۆنێتیی ئاکار دەدوێ. هەڵبەتە پێویستە ئەوە بڵێم کە من خۆم بڕوام بەمە نیە. بەلاّم لە سەدەی نۆزدەهەمدا، لە زۆر بواردا، ئەو رایە باوبوو کە تۆ دەتوانیت چۆنێتی هەر بەرهەمێکی زەینی بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی، دیاریی بکەیت.

**ماگی:** ئەو رایە بە جۆرێك لە جۆران هەموو شتەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ بنەچەو سەرچاوەکانیان، هەڵەیەکە کە تەنانەت ناوێکی باوی لێنراوەو پێی دەڵێن "بەهەڵەداچوونی بنەچەیی"

**ستێون:** راستە، بەلاّم نیچە تەنها ناوبەناو لەم بەهەڵەداچوونە بەئاگایەو تەنها ناوبەناو سوودی لیّ دەبینێت.

**ماگی:** ناوهێنانی فرۆید مەسەلەیەکی تر دەخاتە روو. پێداگرتنی نیچە لەسەر ئەوەی کە ئێمە خۆمان بەهاکانی خۆمان دەخولقێنین تا پێداویستیەکانمان دلنیا بکەین، بووە مایەی ئەوەی کە فرۆید بە مەبەستەوە ئەو بەهایانە لە روانگەی دەروونی و بەگێڕانەوەیان بۆ پێداویستیەکان شی بکاتەوە، ئەو پێداویستیانەی کە هەم لایەنی تاکەکەسییان هەیەو هەم لایەنی کۆمەلاّیەتی، بەلاّم زیاتر تاکەکەسین. وانیە؟

**ستێون:** بەڵێ، زۆر تەواوە.

**ماگی:** بەم پێیە، ڕێبازی نیچە بەر لە هەر شتێك ڕێبازێکی دەروونناسیانەیە.

**ستێون:** ڕێیەکە بۆ بەخشینی سیمای دەروونناسییانە بەگەلیّ بیاردە. نیچە لە زۆر رووەوە، دەروونناسێکی هەلکەوتووە، بەلاّم نە لە دەروونناسیداو نە لە هیچ بوارێکی تردا دەزگایەکی فیکریی یەکپارچەی نەدەخولقاند و لەم رووەوە لە فرۆید ناچێت. هەڵبەت لە هەندێ رووی ترەوە زۆر لەو دەچێت و لە راستیدا مژدەدەرو دەسپێکەری رێگاکەی ئەوە، لەبەرئەوەی زۆر پشت بە نەست دەبەستێت. نموونەش بۆ ئەمە رەخنەگرتنی نیچەیە لە ڕێبازی ئایدیالیزمی ئەڵمانی سەبارەت بەوەی پەیڕەویکارانی ئەم ڕێبازە ئەنگێزە نەستیەکان لەبەرچاو ناگرن کە هۆکاری گەلیّ لە کردەوەکانمانن و، بە لاساییکردنەوەیەکی پەتی مەسیحیەت، کاردانەوەیەکی نەگەتڤیانەی تەواویان بەرامبەر ئەم ئەنگێزانەمان هەیەو، دەیانەوێ بینای ژیار لەسەر سەرکوتکردنی ئەم ئەنگێزانە هەڵچنن. سەرنج بدەن ئەم تێڕوانینە چەند دەشوبهێتە سەر کتێبەکەی فرۆید "ژیارو ناخۆشیەکانی". ئەوە قسەیەکی بێ بنچینەیە کە دەڵێن فرۆید نەستی دۆزیەوە. درۆ لەمە گەورەتر نابێت. هەر لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمەوە جێی بایەخپێدان بوو. نیچە یەکێك بوو لەو کەسانەی ئەم زاراوەیەی بەکارهێناو جەختێکی زۆری لەسەر گرنگی کرد. هەڵبەتە بە پێچەوانەی فرۆیدەوە، نیچە تیۆرەی دەربارەی بەش بەش کردنی "خود" دانەنا. ئەو بە هیچ کلۆجێك وەکو فرۆید خۆی بە دەزگایەکی فیکریی یەکپارچەوە نابەستێتەوەو بڕوای بەم جۆرە دەزگایانە نیە. بەڕای ئەو شتێکی قێزەونە کەسێك بیەوێت تاکەکەس یان ڕۆحی مرۆڤ بخاتە قاڵبی بچووکی دەزگایەکی فیکرییەوە.

**ماگی:** یەکێك لە بەرەنجامەکانی ئەم بەریەك کەوتنە، بڕوای نیچەیە بەوەی کە بۆ کەسانی جیا، پێوەری ئاکاریی جیا دروستە. دژایەتیەك نیە لە دژلیەتی نێوان ئەم بۆچوونەو ئەو وێناکردنەدا گەورەتر بێت کە لە نێو فەیلەسووفاندا باوە (و راستەوخۆ لە کانتیشەوە وەرگیراوە) کە دەڵێت پێوەرە ئاکارییەکانی

بەمەرجێك شایانی بەرگرین كە لە توانادا بێ بە گشتی بكرێن.

**ستێون:** ولیە. نیچە بڕوای ولیە كە تاكەكەسە جیاوازەكان مافیان هەیە رەفتاری تایبەت بەخۆیان هەبێ و ئەو بەشانەی زانست هەڵبژێرن كە لە هەر بوارێكدا بە شێوەیەكی تاكەكەسانە دیاری دەكرێن. سەرسوڕهێنەرترین شت دەربارەی نیچە ئەمەیەو، بەرای من ئەمەش شتێكە كە لە زۆر رووەوە نیشانەی جۆرە روانینێكی زۆر پێغەمبەرانەیە. ئەو باوەڕی وابوو كە زانست و زانین و پەیجۆریی مەعریفە نابێ وەكو ئامانجێكی رەها سەیر بكرێ و هەر ژیارەو بەجۆرێكی تایبەت مافی خۆیەتی روو لەو بەشەی زانین بكات كە توانای بەرگەگرتن و بەكارهێنانی سوودبەخشانەی ئەو زانینەی بۆ مەبەستە پۆزەتیڤەكان هەیە. سەرنج بدەن كە لێرەدا جەخت لەسەر "توانای بەرگەگرتن"ە. نیچە ئەگەری باروداۆخی وەهای لەبەرچاو بوو كە زانست ببێتە مایەی لەناوبردنی زانیاو، دەمەوێ لێرەدا جەخت لەوە بكەم كە لەم كایەیەدا ئەو روانینەی هەیبوو بەراستی روانینێكی پێغەمبەرانە بوو، چونكە ئەمڕۆ ئەوەتانێ بەشێوەیەكی كردەیی رووبەڕووی هەندێ بارودۆخ بوینەتەوە كە دەبینین زانست– هەمان ئەو زانستەی كە بۆ بەدەستهێنانی هەوڵدەدەین و چنگمان دەكەوێ– زۆربەی جار زۆر لەوە زیاترە كە توانای تێگەیشتنی یا بەكارهێنانیمان هەبێت و بتوانین لە پێناوی مەبەستە پۆزەتیڤەكاندا، نەك بۆ وێرانكاری، سوودی لێ ببینین.

**ماگی:** وابزانم مەبەستان ئەو زانستەیە كە لە بواری فیزیای ناوكیدا هەیەو شێوەی مەترسییەكی كوشندەی بۆ هەموومان وەرگرتووە. نیچە (ئەگەر بمایە) زۆر بە باشی دەركی بەم راستیە دەكرد.

**ستێون:** بەڵێ، ئەوەی جێی سەرنجیشە ئەوەیە كە ئەو هەر بە راستی ئێمەی لەو مەترسیە ئاگادار كردووەتەوە –هەڵبەت مەبەستم فیزیای ناوكی نیە– بەڵكو زانست بەشێوەیەكی گشتی. مەسەلەكە ئەوەیە كە لە دوو جۆر تیۆرە دەربارەی زانست هیچی ترمان نیە. یەكێكیان تیۆرەكەی خۆمانە كە دەڵێین، بەچاوپۆشین لەهەر تێبینیەك دەبێ بە شوێن هەموو زانستێكدا بچین. ئەوی تریان تیۆرەی ماركسیستیە لەم بوارەدا كە دەزگایەك دروستدەكات، بە گوێرەی ئەو دەزگایە، هەر زانستێك یا لە رووی كۆمەلایەتیەوە سوودمەندەو، بەم پێیە دەبێ بە دوایدا بڕۆین، یان لە رووی كۆمەلایەتیەوە سوودبەخش نیەو لەم حاڵەتەدا دەبێ قەدەغە بكرێ و بەهەند نەگیرێ. روانینی نیچە تارادەیەك دەشوبهێتە سەر ئەم تیۆرەیە. ئەو باوەڕێكی پتەوی بەوە هەیە كە هەر ژیارێك دەتوانێ خۆی فەوت بكات و ئەوەی بەردەوامیش دەدات بەم هێزە فەوتێنەرە، هەمان ئەو حەزە بێ سنوورە سوكراتیەیە بۆ زانست. واتە هێزێكی بێكۆتایی كە بەردەوام ئێمە بەرەو پێشەوە پاڵ دەنێت.

**ماگی:** هەروەها ئەو بڕوای وابوو كە هەر كەسێكیش وەكو هەر ژیارێك، شایانی ئەوەندە زانست و زانینە كە توانای بەرگەگرتنی هەبێت. فرۆید چەند جارێك وتوویەتی كەس نەبووە لە نیچە باشتر خۆی بناسێت و، لە ئایندەشدا هەرگیز كەسێك نیە لەو خۆی باشتر بیناسێت. نیچە تەنانەت بەر لە فرۆید دەستی كردووە بە خوشیكاریی دەروون وەكو ئەوەی ئەو باسی كردووە، یان شێوەیەكی نزیك لەوەی ئەو، وانیە؟

**ستێون:** بەڵێ وا بزانم وایە، هەرچەند بەڕای من نابێ لەم بارەیەوە زێدەڕۆیی بکەین، چونکە ئەو بە پێچەوانەی فرۆیدەوە، بایەخی بەلایەنی وێرانکارانەی خودشیکاریش دەدا. هەرچیەك بێت نابێ ئەوەمان لەیاد بچێت کە نیچە هەمیشە لایەنی کاروکردەوەو هاوڕێیەتی هەڵسەنگێنراوو هەڵبژێردراوی دەگرت و بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبوو لایەنی ئەو تێڕوانینە کۆنەی دەروون بینیی و پەردە لە رووهەڵماڵینە بگرێت کە لە ئەڵمانیادا باو بوو. نیچە زۆر لەژێر کاریگەریی گۆتەدا بوو و ئەوی بە یەکێك لە مرۆڤە گەورەکان دەزانی و، گۆتە هیچ گومانێکی نەبوو کە زێدەڕۆیی لە دەروونبینی و وردبوونەوە لەناو دەروون کەس بە ئەنجامێك ناگەیەنێت.

**هاگی:** ڕێم بدەن با بە کورتی بزانین تا ئێستا لەم گفتوگۆیەماندا گەیشتووینەتە کوێ. تا ئێرە ڕێك دەربارەی چالاکیی رەخنەگرانەی نیچە دواین. دەربارەی ئەو بۆچوونە سەرەکیەی ئەو گفتوگومان کردووە کە ئاکارو بەهاو ئەو نەریتانەی بۆمان ماونەتەوە لە بنەڕەتدا پشت بەستوون بە بنچینەی باوەڕ بە خودا یان خواوەندەکان.

خودا یان خواوەندەکان ئەم پێوەرانەیان بە ئێمە بەخشیوەو سەرەنجامیش هەر لەسەر ئەم بناغەیە دلوەریمان دەکەن کە ئایا تولنیومانە بە گوێرەی ئەم بەهایانە بژین یان نەء. بەڵام نیچە دەڵێت کە ئێمە باوەڕمان بەم خودلیانەو بە ئایین بە شێوەیەکی گشتی لەدەستداوەو، لە ئەنجامیشدا چیدی باوەڕمان بەو بونیادو کۆڵەکەیەی سیستمی بەهایی خۆمان نیە، هەرچەند تا ئێستا رووبەڕووی ئەم راستیە نەبووینەتەوە. لە بەرلمبەر ئەمەشدا، هێشتا هەوڵدەدەین لە ژیانماندا پەیوەندیەك لەگەڵ ئەم سیستمە بەهاییەدا دروست بکەینەوە، کە چیدی باوەڕمان بە بونیادی نەماوە. ئەم کارەش راستگۆیی رەسەنایەتی لە ژیانمان – و لە راستیدا لە خودی خۆشمان– دەسەنێتەوە. ئەگەر بمانەوێ سیستمێکی بەهایی رەسەنمان هەبێت، دەبێ ئازایەتی بنوێنین و بەیەکجاری سەرلەنوێ بەهاکانمان هەڵسەنگێنینەوە. گفتوگۆکەمان تا ئێستا لەم بولرانەدا بووە. لە رەوتی گفتوگۆکەشماندا بەشێوەیەکی گشتی ئاماژەمان بۆ هەندێ لەو رەخنانە کردووە کە نیچە لەم بارەیەوە گرتوونی. بەڵام تا ئێستا دەمانەوێ بچینە قۆناغی پاش ئەوە کە بەشێوەیەکی سروشتی دەبێ باسەکەمان بەرەو ئەوێ راپێچمان بکات. دەمانەوێ بپرسین کە نیچە پاش ئەوەی بە پێی ئەو پێوەرە فراوانەی گسك لە هەموو شتەکان دەدات و تووڕ یا فڕێدەدات، چ شتێك دەخاتە جێیان؟ دوای هەموو ئەم کارانە کام بەها پۆزەتیڤانە دەخاتەڕوو؟

**ستێون:** وەڵامی ئەم پرسیارە هەم زۆر ئاسانەو لە هەمان کاتیشدا زۆر ئاڵۆزە. وەڵامە ئاسانەکان ئەوەیە کە خۆت بە، هەرچییەك هەیت تا ئەوپەڕی خۆبوون خۆت بە، تا دوا زەپڕە، لێوانلێو بە لە ژیان، درێغی مەکە، بژی شتەکانی تری لەم بابەتە کە دواتر (هێندەی پەیوەندیی بە ئادەمیزادەوە هەیە) لە ژێر ناوی "چالاکی ژیان"دا خرایە روو. ئەم دەستوورە کە خۆت بەو ئەوە بە کە هەیت؛ نەك هەر گەوهەری فەلسەفەو پرنسیپی نیچەیە، بەڵکو هەروەها ئامانج و مەبەستێکە کە هەر جۆرە ئاکارێك دەبێ ئەو ئاراستەیە پەیڕەوی بکات. هەڵبەتە لێرەدا دەشێ بپرسن کە ئەگەر هەر کەسێك بەتەنها خۆی بێت، دەرئەنجامەکانی ئەم مەسەلەیە لە بولرێکی

فراوانتردا دەبێ چی بێت؟ ئەم مەسەلەیە چۆن لەگەڵ ڕژێمێکی سیاسیدا وێك دێتەوە؟ وشتی تری لەم جۆرە. بەداخەوە وەڵامی ئەم پرسیارانە ئەوەندەی پەیوەندیی بە نیچەوە هەیە، بەهیچ جۆرێك دڵخۆشکەر نیە. بەریەککەوتنی لەگەڵ مەسەلە کۆمەڵایەتیەکاندا ئەوەندە سوودبەخش نیە. پێشتر وتم کە وەڵامی پرسیارەکەتان چەند ئاسانە هێندە ئاڵۆزیشە. هۆیەکەشی ئەوەیە کە ئەگەر بتەوێ بە گوێرەی ڕاسپاردەکانی ئەو ڕەفتار بکەیت، ئەوا (دابین کردنی) ژیانێکی هاویەش کە جۆرە هاوئاهەنگی و گونجانێکی زۆر باڵی بەسەردا بکێشێت؛ شتێکی دژوار دەبێت. بەتایبەتیش کاتێ ئەو بۆچوونەی ئەویش لەبەرچاو بگریت کە بوونی یاساکان بۆ ئەوەیە نەبادا لاوازەکان هەراسان بکرێن. بەرنامەی نیچە بە ڕواڵەت بەرنامەیەکی سادەیە، بەڵام ئەگەر کەسێك بیەوێت فیکری نیچە بکاتە ڕێنومایەکی ژیان لەنێو کۆمەڵگادا؛ بە بڕوای من ڕووبەڕووی گەلێ دژواریی گەورە دەبێتەوە. تەنانەت بەجۆرێك لە جۆرەکان دەتوانین بڵێین کە هەندێ تیۆرە سیاسیە بێباك و توندڕەوەکانی ئەم چاخانەو هەندێ لە سیاسەتە فاشیستیەکانی سەرەتاکانی ئەم سەدەیە، لانی کەم لە نێوان ڕۆشنبیراندا، تا ڕادەیەك لەو باوەڕەوە سەرچاوەی دەگرت کە هەرکەسێك دەبێ بە بێ گوێدانە ئەنجام و ئاکامەکان، خولقێنەری بەهاکانی خۆی بێت و بەگوێرەی ئەو بەهایانە بژی، دەشبینیت کە ئەم جۆرە باوەڕانە ئێمەیان نەگەیاندۆتە جێیەك.

**ماگی:** بەڵام نیچە تەواو لەوە بەئاگابوو کە شێوەیەکی وەها دەبێتە مایەی ئاکۆکی. بە کورتی ئەو بایەخی بەمە نەدەداو بگرە پێشوازیشی لە ئاکۆکی دەکرد. هەڵبەتە من لەوەدا لەگەڵ ئێوەدام کە نیچە بە هیچ جۆرێك سەبارەت بە ئاکامە کۆمەڵایەتیەکانی ئەم مەسەلەیە واقیعبین نەبوو. نیچە عەوامی خەڵکی بە مشتێ لە پاتاڵ و هەرچی و پەرچی لە قەڵەمدەدا کە دەستەیەك لە کەسانی هەڵبژاردە ڕابەرایەتی و سەرکردایەتییان دەکەن. بەڕای من، ئەم دەستە بژاردەیە تەواو هەقی خۆیانە کە خۆیان لاپەسەند دەبێت و لاوازەکان لەسەر ڕێی خۆیان دوور بخەنەوەو هەرچیەکیان بۆ خۆیان دەوێت بیکەن. ئەوەش کە ئایا ئەو دەستە هەڵبژاردەیە چۆن دەتوانن پێکەوە هەڵکەن، شتێکە کە هەروەکو ئێوە وتتان، نیچە لێی نەکۆڵیوەتەوە. بەڵام بە دڵنیاییەوە لە خاڵێکدا ئەو لەسەر هەقە، ئەویش ئەوەیە کە هەموو ئەم شتانە لەگەڵ هەر وێنایەکی باودا بۆ ئاکار تەواو دژو ئاکۆکن.

**ستێون:** بەڵێ وایە. بەڵام تۆ بەتەنها نیوەی مەسەلەکەت باسکرد. نیوەکەی تری -کە فاشیستەکان و ناسیونال سۆسیالیستەکان گرنگییان پێ نەداوە- ئەوەبوو کە جگە لەوانە تۆ دەبێ لەناو ناخی خۆتدا بەسەر مەیلی حەز بەدڵنیایی و ترسنۆکی و بەخشندەییدا زاڵ بیت. کاتێ ئەمەت کرد -ئەمەش هەمان ئەو بۆچوونەیە کە نیچە لە بەشێکی (زەردەشت وای وت)دا خستوویەتیە ڕوو- چیدی خۆتان ناتانەوێ دژایەتی ئەوانی تر بکەن و هێرش بکەنە سەریان و، زیاتر دەرك بە لاوازی و بێدەسەڵاتییان دەکەن. هەڵبەتە منیش بڕوام وایە کە ئەم دەرکە بۆزەتیڤی و بەرگەگرانەیەی لاوازییەکانی ئەوانی تر بەهێزترین خاڵ نیە لە فیکری نیچەدا.

**ماگی:** گرنترین هۆی ناوبانگیش نیە.

**ستێون:** نەخێر.

**ماگی:** خەڵك هەمیشەو لە نیچە تووڕە دەبن و وای بۆ دەچن -و لە ڕاستیشدا بۆچوونەکەیان

دروسته – كه ئەوەی ئەو بڕوای پێیەتی لەگەڵ تەواوی پێوەرە باوەكانی ئاكاردا ناكۆكە. راستیەكەی ئەوەیە نیچە خۆیشی لەگەڵ ئەواندا هاوڕایە. ئەو خۆشحاڵە بەوەی كە خەڵكی دوچاری سەرسامی و تووڕەیی دەبن. هەروەكو وتتان، ئەو دەیەوێ ئادەمیزادەكان پڕبن لە ژیان، بۆشایی لە ژیانیاندا نەبێت، سنوورێك بۆ زیندوویێتی دانەنێن، ئەو نایەوێ هیچ شتێك –هیچ وێنایەك بۆ ئەقڵ یان حەقیقەت یان ویژدان و هەر شتێكی دی– ببێتە لەمپەر لەم ڕێیەدا. بە پێچەوانەوە، ئەو بڕوای وایە كە هەر پێوەرێكی دی دەبێ بەجۆرێك هەڵبژێررێ كە وەڵام بێت بۆ هەقی بوون. هەروەها بڕوای وابووە كە تەواوی ئەو ئاكارانەی تا ئێستا هەبوون بە پێچەوانەی ئەم ئاراستەیەوە بوون و، بەم پێیە، بەشێوەیەكی كردەیی دژ بە ئەسڵی ژیان كاریان كردووە. تەوەری ئەو شتەی ئەو دەیڵێت ئەوەیە كە ژیان تاقە بەهاو تاقە سەرچاوەی بەهاكانەو، بە گوێرەی ئەمە، دەبێ هەموو بەهاكان لە ئەسڵی ژیانەوە هەڵبهێنجرێن. ئێمە دەبێ لەگەڵ زیندوویێتیدا بین و، بە پڕاوپڕی ئەم مانایە، بەدەم بانگەوازی ژیانەوە بچین، بەو مانایەی كە نەك هەر جڵەوی تەواوی غەریزەكان (ی ژیان)مان رەها بكەین، بەڵكو تەواوی پێودانگەكانییش –تەنانەت پێودانگی ئەقڵ و حەقیقەتیش– لە هەمان سەرچاوەوە وەربگرین.

**ستیڤن:** یان لە مرۆڤە باڵاكانەوە وەری بگرین. هەروەكو وتیشم یەكێك لەو مرۆڤە باڵایانەی كە ئەو لەبەرچاوی بوو، گۆتە بوو، یەكێكی تریان ناپلیۆن بوو، هەندێ جار مارتن لۆتەر، هەندێ جاری تریش پاپا گەورەكانی سەر بە بنەماڵەی بۆرجیا (*Borgia*)، تەنانەت هەندێ جار سوكراتیش بە مرۆڤێكی باڵا دەژمێررێ، لەبەرئەوەی خاوەن هێزێكی رۆحی وەها بووە كە توانیویەتی ئەو بەرنامەیەی كە هەیەتی پراكتیزەی بیكات.

**ماگی:** تەنانەت حەقیقەتیش دەبێ لەم پێناوەدا ملكەچ بێت.

**ستیڤن:** بە تەواوی.

**ماگی:** بەو مانایەی كە ئەگەر حەقیقەتێكی وەها هەبێت كە ئازارمان پێبگەیەنێت، یان گوڕز لە ژیانمان بدات، بەبێ هیچ گومانێك دەبێ خوازیاری زانینی نەبن. لەوەش زیاتر تەنانەت پێودانگی هەڵسەنگاندنی حەقیقەت و ئەوەش كە چ شتێك بە حەقیقەتەوە بەندە، دەبێ شتێك بێت كە خزمەتی بەرەو پێشبردنی ژیان و بوون بكات. هەرچیەك خزمەتی ئەم ئامانجە نەكات ئەوا بەتاڵەو پێویستە رەت بكرێتەوە.

**ستیڤن:** بەڵێ، بەم جۆرەش دوویارە دەگەڕێینەوە سەر مەسەلەی شایستەیی زانینی حەقیقەت، یان وەكو نیچە خۆی دەڵێت، "چاودێری تەندروستی لە زانین دا" بە بڕوای ئەو، لەم بوارەشدا پێویستە جۆرە پێودانگێكی تەندروستیانە هەبێت كە پێمان بڵێت چ بەشێكی زانین شایانی ئەوەیە ڕوویەڕووی ببینەوە چ بەشێكی تری پێویستە ئەفەرۆزی بكەین. قسەكەی ئێوە زۆر راستە كە هەندێ جار تەنانەت حەقیقەتیش بەجۆرێك لە جۆران قەدەغەو تابوو دەكرێ.

**ماگی:** وای بۆ دەچم ئەگەر نیچە بیویستایە بەرامبەر ئەو هەموو هاواری نارەزاییە دژ بە فەلسەفەكەی، بەرگری لەخۆی بكات، لەوانەبوو شتێكی وەهای بگوتایە كە سەرتاسەری رەوتی پەرەسەندن بریتی بووە لەوەی كە بەردەوام بەهێز لاوازی لە مەیدانەكە وەدەرناوەو، بەتوانا بێ تواناو، هۆشمەند گێل و، داهێنەرو چالاك

بوودەڵەو سست و، بەم جۆرە هەتا کۆتایی. ئادەمیزاد تەنها لەم ڕێیەوە توانیویەتی ڕێی پەرەسەندن بگرێتە بەرو بەهۆیەوە ژیار پەیدا ببێت کە ئەم بزاڤە بێ ناوبڕ ملیۆنان ساڵ بەردەوام بووە. هەموو ئەو شتە بەهادارانەی ئێستا لە دەستی ئێمەیەدا، لە ڕاستیدا بەرهەمی ئەو بزاڤەیە. بەڵام بەهاتنی یۆنانییەکان و جوولەکەکان، دەستەیەک مامۆستای ناکار پەیدابوون کە وتیان ئەم بزاڤە دژی ئاکارەو بگرە ناپاکیشە. گوتیان دەبێ بەهێزەکان خۆیان بچووک بکەنەوەو لاوازو پەککەوتووەکان داڵدە بدەن و ملکەچی حکومەتی قانوون بن. هۆشمەند دەبێ یارمەتیی دەبەنگ بدات، بەتوانا دەبێ بەرگری لە مافی بێتوانا بکات، و تادوایی. نیچە دەڵێت ئەگەر ئێمە بەردەوام ئەم کارەمان بکردایە؛ مەحاڵ بوو بتوانین لە حاڵەتی بەر لە ئادەمی بێینە دەرێ. کەواتە ئەوەی پێویستە بیکەین ئەوەیە کە بەردەوامی ببەخشین بەو بەهاو پێوەرانەی خولقێنەری مرۆڤایەتی و شارستانێتی بوون و بگەڕێینەوە بۆ ئەو بەهاو پێوەرانە، نەک بە پێچەوانەوە.

**ستێرن:** بەڵێ، بەڕای من، ئەو شتانەی ئەو لە بۆنە جیاوازەکان و لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا گوتوونی ڕێک ئەمەیەو نیگەرانیەکایشی سەبارەت ئاینده هەروا لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە نەبادا ئەم جۆرە بەرجەستە بوونەی بوون سەرنەگرێ و بەردەوام نەبێو، ئەوکات، ڕۆحی دیموکراسی، ڕۆحی عەوام و پاتاڵ و هەرچی‌و پەرچی زاڵبێت و، هەموو ئەم بەهایانە لەناویەرێت.

**ماگی:** ببێتە هۆی ئەوەش کە تەواوی ئەو بزاڤەی کە هۆڤێتی (توحش)ی گۆڕیوە بۆ ژیار، پێچەوانە بێتەوە.

**ستێرن:** بەڵێ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نابێ ئەوەمان بیر بچێت کە بۆچوونی نیچە دەربارەی ڕەوتی مێژوو تاڕادەیەک جیاوازە لەو بۆچوونەی کە تۆ کردووتە بە بناغەی بەرگری کردن لەو. بەبۆچوونی نیچە مێژوو دووبارە دەبێتەوە. دەربارەی مانای ئەم باوەڕەش پاشتر قسە دەکەین. بەڵام لە ڕوانگەی ئێمەوە ماناکەی بە کورتی ئەوەیە کە هەر ئۆخێکی مێژوویی لە توانایدایە بەرزترین شتێک کە مرۆڤ دەتوانێ بیخولقێنێت؛ لەخۆی بگرێت. ئۆخی ناوارتە یان چاخی ناوارتە نیە. هەر چاخێک کە توانای دەرکی تەواو خولقاندنی تەواوی ئەم جۆرە بەهایانەی هەبێت، دەبێ ئیمکانی ئەم جۆرە کارەی تێدا هەبێت. بە کورتی، بەڕای نیچە، نەهامەتی لەوەدایە کە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم زۆر پێدەچێت چاخی داڕمان بن، چاخێکە کە ئەم هێزە ناتوانێ بەتەواوی تیایدا بەدیبێت. نیچە لە زۆر ڕووەوە پێشبینیەکی پێغەمبەرانەی سەیری هەبوو، بەڵام دواتر دەرکەوت کە بە ڕادەی پێویست لەوەحشیگەریی نوێ و لە ئاینده نەترساوە.

**ماگی:** ڕێم بدەن تا سەبارەت بەو ئاماژەیەی ئێوە لە بارەی تیۆرەکەی نیچەوە "دووبارە بوونەوەی بێکۆتایی"؛ پێشنیازێک بکەم. کاتێ بمانەوێ لە بارەی کارەکانی دواتریەوە بدوێین - کە بە ڕای من ئێستا کاتێتی- ڕووبەڕووی چوار بابەتی سەرەکی دەبینەوە تیایاندا، یەکەمیان دەکرێ لەو عیبارەتەدا کورتی بکەینەوە کە ئەو خۆی خستیە سەر زمانی کەسانی دی، واتە (ئیرادەی هێز). دووەمیان تیۆرەی (*Ubermensch*)ە واتا "مرۆی بالا- سوپەرمان". ئەم زاراوەیەش هەر داهێنراوی

نیچەیە کە ئێستا بووە بە بەشێك لە زمانی قسەکردنی ئێمە. سێیەمیان تیۆرەی دووبارە بوونەوەی هەتاهەتایی (یان گەڕانەوەی هەتاهەتایی)ی زەمانە کە خۆشتان ئاماژەتان پێدا. چوارەمیشیان تیۆرەکەیەتی سەبارەت بە پەیبردن بە ژیان لە روانگەی ئێستاتیکی یان هونەرییەوە. پێشنیازی من ئەوەیە بۆ ئەوەی باسەکەمان روونتر بێت، یەکەیەکە لەم بابەتانە بدوێین و لە ئیرادەی هێزەوە دەست پێبکەین. نیچە کاتێ ویستی ئەم عیبارەتە بکات بە ناونیشانی کتێبێك کە کۆبەستێکی بەرهەمی تەمەنی بوو؛ بە وردی مەبەستی لە ئیرادەی هێز چی بوو؟

**ستێرن:** نیچە چەمکی ئیرادەی لە فەیلەسوفێکەوە وەرگرتووە کە ئێوە خۆتان تیایدا پسپۆڕن، واتە شۆپنهاوەر، بەڵام حوکمی نیچە بۆ ئەو چەمکە بە پێچەوانەی شۆپنهاوەرەوەیە. شۆپنهاوەر ئیرادەی بەسەرچاوەی هەموو خراپەکان و بەدبەختی مرۆڤ دەزانی. لە کاتێکا لای نیچە ئیرادەی هێز، ئەسڵ و سەرچاوەی هێزی ئادەمیزادەو، بەشێك لە بەشەکانی هەر کەلتوورێکی دروست ئەوەیە کە ئازادیی پێویست بڕەخسێنێ تا ئەوەی لە توانای ئیرادەدا هەیە بۆ پراکتیزە؛ پراکتیز ە بکات. بە کورتی کێشەکە لەوەدایە کە ئەمە وا دەکات بتخاتە ناکۆکییەوە لەگەڵ ئەوانی تردا، بەم پێیە لەم قۆناغەدا، ئیرادەیهێز دەگۆڕێ بۆ ئیرادەی خۆخستنە روو و زەوتی (مافی) ئەوانی دی. بەڵام چیرۆکی ئیرادەی هێز لێرەدا کۆتایی نایەت. بەرای من دەبێ جەخت لەوە بکرێتەوە -بەتەنها جەخت، نەك زێدەڕۆیی لە جەخت کردندا، وەکو هەندێ لە رەخنەگران ئەو کارە دەکەن- کە ئیرادەی هێز لە سەرێکەوە دژ بە خۆشی دەوەستێتەوە، بەدەبڕینێکی دی، لاوازی و حەز بە ئاسوودەیی و بێ بەندوباری لە دەروونـدا ریشەکێش دەکات.

**ماگی:** واتە هەر کەسێك پشتملی خۆی دەگرێ و خۆی تا سنووری پێویست راپێچ دەکات.

**ستێرن:** بەڵێ، بەڵام ئەو سنووورە پێویستەی کە مرۆڤ خۆی دەیخولقێنێت. گرفتەکە رێك لەوەدایە کە ئێمە خۆمان ئەم سنووورە دەخولقێنین. لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ سووربوونی نیچە لەسەر ئەوەی نەك هەر ئەم بەهایە؛ بەڵکو هەموو بەهاکان خولقاوی خودی ئەو کەسە خۆین.

**ماگی:** کاتێ شۆپنهاوەر دەربارەی ئیرادەی میتافیزیکی دەدوێت، مەبەستی شتێکە کە لە جیهانی دیاردەکاندا، نەك بەتەنها لە ئادەمیزاددا یان بوونەوەرە زیندووەکاندا، بەڵکو لە هەموو شتێکدا، لە شێوەی جۆرە هێزێکی بزوێنەردا دەردەکەوێ. بە بڕوای ئەو، ئەو هێزەی کە مانگ بە دەوری زەوی و زەوی بە دەوری خۆردا دەسووڕێنێتەوە، جیلوە یا دەرکەوتەی ئەو شتەیە کە ئەو ناویی دەنێت "ئیرادە". سەرتاسەری گەردوون لە ماتەرێك پێکهاتووە کە لە دۆخی جووڵەدایەو هەموو ئەمانەش جیلوەی "ئیرادە"ن بەو مانایەی ئەو بۆی هەیە کە هیچ پەیوەندییەکی بەماناو باوی "ئیرادە"وە نیە. بەڵام نیچە چەمکی ئیرادە بەو مانایەش بەکاردەهێنێت کە شۆپنهاوەر مەبەستی بوو، وانیە؟

**ستێرن:** ئەفسوس کە وایە. دەڵێم ئەفسوس، چونکە بەرای من لاوازترین بەشی فەلسەفەکەی نیچە ئەو بەشەیە کە ئەو تیایدا هەوڵدەدات دوای جۆرە سیستمێکی فیکری بکەوێت و دەربارەی

ئیرادەی هێز لە سروشتدا و ئیرادەی هێز لە گەردووندا دەدوێت. لە راستیدا ئەم بەشە هەرگیز سوودی بە من نەگەیاندووەو لەو بڕوایەشدا نیم کە سەرنج راکێش بێت. هەمان ئەو رێسا سەرەکیەی ئەو کردبووی بە بناغەو کاری لەسەر دەکرد –واتە ئەوەی کە دەڵێت بیروڕا مەزنەکان ناخرێتە ناو قالبی سیستمێکی رێك و گونجاوی فیکریەوە– کەلێزیاترو بەشێوەیەکی کاریگەرتر مەبەستەکانی دەپێکاو لەگەل بیروبۆچوونەکانیدا دەگونجا.

**ماگی:** باشە، ئێستا با بچینە سەر دووەمین بابەت لە چوار بابەتەکەی کارەکانی دوایی نیچە، واتە "بالامرۆ– یا مرۆڤی بالا". هەموو کەسێ ئەم وشەیە دەزانێ کە بەرامبەر زاراوەی *Ubermensch*ی نیچە دانراوە. چەمکی "بالامرۆ" بە توندی کەوتۆتە بەر لێکدانەوەی خراپ و خەلکی وای بۆچوون بالامرۆ هەمان ئەو ئاریاییە گەورەرپاکەی ئەفسانە هیتلەرییەکان و ئەو درندە قژ ئالتوونیەیە کە لە کاریکاتۆرە دژە نازیەکاندا هەیە. بەلام بێگومان ئەمە بە هیچ کلۆجێك لەو شتە ناچێت کە مەبەستی نیچە بووە.

**ستێرن:** نەخێر، بە هیچ کلۆجێك لەو ناچێت. بەرای من، بالامرۆ دەکرێ بەرهەمی هەر ژیارێك بێت. ئەگەر لەیادتان بێت، وتم کە هەر سەردەمێك لە توانایدایە بەرزترین بەها بهێنێتە ئاراوە کە لەگەڵ توانای مرۆییدا دەگونجێت. بالامرۆ ئادەمیزادێکە کە لە ئاستی دەسکەوتەکانی ئیرادەی هێزدا دەژی، بە کامڵی و پڕاوپڕ لە ژیان دەژی و، دەتوانێ بۆ هەتاهەتایە خواست و ئیرادەی دووبارە بکاتەوە. لێرەدا دەگەین بە مشتومڕ لەسەر ورووژێنەرترین بەشی نووسینەکانی نیچەو سەیرترین بۆچوونی ئەو، واتە تیۆرەی دووبارەبوونەوەی هەتاهەتایی.

**ماگی:** تکا دەکەم با جارێ لەسەر ئەمە نەدوێین، چونکە من حەزدەکەم زیاتر لەسەر چەمکی بالامرۆ بدوێین کە رۆڵێکی گرنگی لە فیکری ئەم سەد ساڵەی دواییدا بینیوەو کەمێك زیاتر لێی بکۆڵینەوە. (سوود وەرگرتنی هەڵەو بەخراپ بەکارهێنانی ئەم چەمکە لەلایەن نازیەکانەوە؛ مشتێکی نموونە لە خەروارێك. نووسەران و شانۆنامە نووسانیش بە شێوەیەکی فراوان کەوتوونەتە کاریگەریی ئەم چەمکەوە، لەوانە برناردشۆ کە ناوی یەکێك لە باشترین شانۆنامەکانی "مرۆو بالامرۆ"یە). ئایا وای بۆ ناچیت راستیی مەسەلەکە ئەوە بێت کە ئامانجی نیچە گەیشتن بووە بە چەمکی ئادەمیزادی سەرکوت نەکراو (یا نەچەپێنراو)؟ هەڵبەتە سەرکوت کردن بە مانای ئەمڕۆی ئێمەو بەوجۆرەی کە فرۆید مەبەستی بوو؟ بالامرۆ ئادەمیزادێکە کە غەریزە سروشتیەکانی سەرکوت نەکراون و، هەروەکو نیچە خۆیشی دەڵێت "بێخود *un sefed*" نەبووەو، بەم پێیە، تا دوا سنووری مەیل و تواناکانی، بەشێوەیەکی ئازادانەو سەربەستانەو بێباکانە بەهرە لە بوون و ژیان دەبات. بەهاکانی خۆی دووبارە هەڵسەنگاندۆتەوەو بە گوێرەی بەها درۆکان ناژی. بالامرۆ هەر یەکێکە لە ئێمە بەو مەرجەی بتوانین کامڵ بین و خۆمان لە کۆت و پێوەندی ئەو وێنا درۆیانە رزگار بکەین کە دەربارەی خۆمان و ژیان هەمانە. لەو بڕوایەدا نین ئەمە مانای راستەقینەی بالامرۆ بێت؟

**ستێرن:** بۆ نا، لەو بڕوایەدام هەر ئەمەیە. بە کورتی بالامرۆ کەسێکە کە بەبێ ئەوەی

چوارچێوەیەك بۆخۆی دابنێو تەنگژە بۆخۆی دروست بکات، بە شێوەیەکی سروشتی و غەریزی و نەستانە، خۆی لەو شتانە دەپارێزێت کە لە روانگەی نیچەوە ناشرین و خراپن. بۆ نموونە یەکێك لەو شتانەی کە نیچە بە راشکاوی دژێتی، چاوچنۆکی و کینەیە، یان بە دەربڕینی خۆی ***ressentiment***؛ واتە بە زۆر ملپێکەچکردنی گەورەیی یا سەرکەوتوویی کەسێك و شتی لەم جۆرە. بالامرۆ کەسێکە کە هەر بەشێوەیەکی خۆڕسکی ئەم هەستانەی تیا نیە.

**ماگی:** واتە کەسێك، کە جگە لە سیفەتەکانی دیکەی، بەرز دەڕوانێ و بەخشندەیە.

**ستێرن:** وایە، دەشبینێت کە وێنای مەسیحی بۆ گەورەیی بەخشندەیی زۆر لە روانینەکەی نیچەوە دوور نیە.

**ماگی:** ئێستاش با بچینە سەر سێیەمین بابەت لە چوار بابەتە سەرەکیەکە، واتە چەمکی دووبارەبوونەوەی هەتاهەتایی. هیچ تیۆرەیەك لە تیۆرەکانی نیچە بەلای خەڵکەوە هێندەی ئەمە قورس نیە، نەك هەر بۆ تێگەیشتن؛ بەڵکو بۆ جیددی وەرگرتنیشی. بە رواڵەت ئەوەی نیچە دەیڵێت ئەوەیە کە هەموو مێژوو دەسووڕێتەوەو لەسەر چەرخی گەورە دەجووڵێتەوە، بە جۆرێك کە هەموو شتەکان بۆ هەتاهەتایە دەسووڕێنەوەو بەردەوام دەگەڕێنەوەو دووپات دەبنەوە. واتە بۆ نموونە من و تۆ زۆرجاری دی لە رابردوودا هەر لەم ستۆدیۆیەدا دانیشتووین و زۆرجار هەمان گفتوگمان ئەنجام داوەو دیسانەوە لە ئایندەشدا ئەنجامی دەدەینەوە. خەڵکی قورسە بڕوا بکەن نیچە شتی وای وتبێت.

**ستێرن:** بەڵێ، بەلام بە راستیش وتویەتی و ویستویەتی ئەوە تاقی بکاتەوە کە ئەگەر کەسێك تیۆرەکەی خۆی بە جیددی وەربگرێت؛ دەشێ چی رووبدات. لەو بڕوایەدتام دەبێ بوترێ کە زۆربەی بیروڕاکانی نیچە بەم شێوەیە لایەنێکی تاقیکاریانەیان هەیەو، ئەمەش شتێکە کە پەیوەندیی بەهەموو باسەکەمانەوە هەیە، مەبەستم ئەوە نیە کە بیروباوەڕەکانی جیددی نین یان بەهەستی بەرپرسیاری تێکەڵ نین، یان هیچ و بێ بناغەن. مەبەستم ئەوەیە کە لێرەدا بەرامبەر کەسێك کە رووبەڕووی تەواوی فیکری مرۆیی بووەتەوەو بە شێوەیەکی دووبارە تیۆرە جیاوازەکان تاقی دەکاتەوە. خۆی لە یەکێك لە نامەکانیدا دەڵێت -بەڕای من ئەم قسەیەشی زۆر خەمهێنە-: "هەست دەکەم قەڵەمێکم، قەڵەمێکی تازە" (مەبەستی لە قەڵەمی پەڕە کە تازە تاشرابێ) "لە دەستی هێزێکی بالاتردا کە لەسەر پارچە کاغەزێك تاقیم دەکاتەوە". ئەمە هەستێکی سەیرە بۆ کەسێك کە بەرگری لە ئیرادەی هێزو بالامرۆ دەکات. بەلام لەو بڕوایەدام کە ئەو بە راستی دووچاری هەستێکی وابووەو ئەو بیرۆکەیەی سەبارەت بە دووبارەبوونەوەی هەتاهەتاییش هەیبووە؛ بەم شێوەیە تاقی کردۆتەوە. بە بڕوای من ئەم بیرۆکەیە تیۆرەیەکی ئاکارییە زیاتر لەوەی تیۆرەیەك بێت دەربارەی بوون و بوونەوەرەکان و گەردوون. بەو مانایەی کە کردەوەو ئیرادەو نیازو بیروباوەڕمان؛ دەبێ بە جۆرێك بە بەخشندەیی و گەورەیی و سالاری بێت کە بمانەوێ و بتوانین بۆ هەتاهەتایەو جارەهای جار دووپاتیان بکەینەوە.

**ماگی:** هەموو ئەو شتانەی وتمانن، ئەم تێگەیشتە بە ناچاری وا لە مرۆڤ دەکات ئەو مەرجە سەرەکیەی "کانت"ی بیر بکەوێتەوە کە هەر کردەوەیەك بۆ ئەوەی ببێتە کردەوەیەکی ئاکاری دەبێ قابیلی ئەوە بێت بە گشتی بکرێ.

بەڵام وای بۆ دەچم سەبارەت نیچە، زیاتر لەو تیۆرەیەوە نزیك بێت کە دەڵێت بێ هیچ قەیدو شەرتێك دەبێ ژیان لە ئامێز بگرین. ئەگەر تۆ لە هەر ساتێکداو بێ دوودڵی و گومان کاردانەوەت بۆ ژیان پۆزەتیڤانە بێت، ئامادە دەبیت کە جارەهای جار ئەو کارە دووپات بکەیتەوە کە لەو ساتەدا کردووتەوە و بۆهەتاهەتایەش.

**ستێرن:** بەچاوپۆشین لەهەر ئەنجامێك کە دەشێ تووشی ببن. بەڵێ، راستە. بەرای من شتێکی ژیرانە نیە کەسێك ئەم سنوورە تێپەڕێنێت و وەکو خەڵکانێك بیەوێ بۆ سەلماندنی شیاوی یان نەشیاویی وێناکردنی دووبارەبوونەوەی هەتاهەتایی کە تاقی کراوەتەوە: هاوڕێژەی ئەندازەیی یان ماتماتیکی دروست بکات.

**ماگی:** لە بنەڕەتدا تەواوی مەسەلەکە دەچێتە خانەی شتە مەجازییەکانەوە، وانیە؟

**ستێرن:** مەجازێکی گەورەیەو هەڵبەتە زۆر شت هەن سەبارەت بە کارهێنانی مەجاز لەلایەن نیچەوە بوترێن.

**ماگی:** تکام وایە لەم بارەیەوە هەندێ قسەمان بۆ بکەن.

**ستێرن:** بەرای من، بەو جۆرەی ئێمە خوومان پێوەگرتووە کە زۆر شت بێمانا دەبن. ئێوە پێشتر ئاماژەتان بە شێوازی نووسین دا لای ئەو، کە بەلای منەوە، شێوازێکی گەلێ بەهێزو کاریگەرە. من ئەگەر لەخۆم بپرسم کە پەخشانێکی لەو جۆرە لە کوێوە هاتووە، وای بۆ دەچم کە وەڵامەکەم وەها بێت کە لەو داهێنانەوەی نیچەوە سەرچاوە دەگرێ کە ئەو زانیویەتی چۆن شێوازی گوتنی لە نێوان مانای راستەقینەو مانای مەجازیی وشەکاندا بگونجێنێت. ئەمە شتێکە کەم کەس توانیویەتی بیکات، بەتایبەتیش نووسەرانی ئەڵمانی بەر لەو. نیچە لە دونیای فیکردا رێگای تایبەتی خۆی هەیە. هەروەکو ئاماژەشمان پێداو بینیمان، هێرش دەکاتە سەر تەواوی نەریتەکانی خۆرئاوا. لە بواری پەخشان نوسیدا کەسانێکیش هەبوون بەر لەو کە رێگاخۆشکەربوون بۆی، وەکو مۆنتانی و پاسکال لارۆشفۆکۆ کە ئەم حەزی بەکارەکانیان دەکردو نووسینەکانیشی لە رووی پەندئامێزی و بەیانکردن لە قاڵبی دەستەواژەی کورتدا، لەوانەوە بۆی ماوەتەوە. ئەمەش قسەیەك نیە بە تەنها من بیکەم، خۆیشی هەر وا دەڵێت. ئەو شێوازەی کە ئەو لە میانی حەقیقەت و مەجازدا هێناویەتیە ئاراوە، سەرسامکەرو دانسقەیەو، بە بڕوای من، تاقە رێی خۆپاراستن لە بەهەڵە تێگەیشتنی نووسینەکانی نیچە، ئەوەیە کە پەی بە ماهیەتی ئەو شێولز ەی بەرین. رستەیەکی ئەوم دێتەوە یاد کە شایەتی ئەم قسەیەی منە. رستەکەش لەو بارەیەوەیە کە (بەدەربرینە سامناکەکەی ئەو) لە ئەنجامی "مەرگی خوا"وە، خەڵکی سەدەی نۆزدەهەم دوچاری بێدەرەتانیەکی ترسناك بوون. پاشان دەنووسێت: "ئادەمیزادەکان لەبری ئەوەی خۆڕاگربن، لە بەردەم ئەم حاڵەتە سەختەی بێکەسی و تەنیاییەدا، کەچی هەر لە گەڕاندان بەدوای خوا تێکشکاوەکای خۆیاندا، لە پێناوی ئەودا خۆشەویستی خۆیان دەدەن بەو مارانەی کە لە وێرانەیەکدا لانەیان کردووە کە لە ئاکامی هەرەسی ئەوەوە پەیدابووە". بڕواننە ئەم ئاوێتە کردنە: لە سەرێکەوە هەندێ مانای ئەبستراکتی وەکو "حاڵەت" و "بێکەسی و تەنیایی" کە بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی ئەبستراکتن و بەخودی باسەکەوە پەیوەستن کە بەشێکە لە تیۆرەیەکی گشتی دەربارەی مێژوو. لە سەرێکی تریشەوە

ئەو مارانەی کە لە ویرانەیەکدا سەر بەم قوژبن و بەو قوژبندا دەکەن؛ کە لە ئاکامی هەرەسی خواوە پەیدا بووە. تەوەری کاری ئەو ئەمەیەو هەروەها خۆپاراستن لە زیاتر بەرەو پێشچوون لەم سنوورەو زێدەنەڕۆیشتن دەربارەی تیۆرەیەك کە پایەی ئەم دەربڕینە مەجازیەیە.

**ماگی:** بەڵام ئەو بەم کارە، خوێنەرەکانی خۆی دوچاری گرفتێکی جیددی دەکات. ئاوێتەکردنی شیعرو مەجاز لەگەڵ چەمك و مانا ئەقڵیەکاندا واتە هیچ کاتێك نازانێت چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت. لە سەرێکەوە ناتوانێت نووسینەکانی وەکو باسی وردی ئەقڵانی تەماشا بکەیت؛ چونکە لەم حاڵەتەدا ڕێك لەو شوێنانەدا کە ئەو خوازەیە (ئیستیعارە) بەکاردێنێت، هەموو شتەکان هەڵدەوەشێنەوە. لە سەرێکی تریشەوە ئەگەر هەموو نووسینەکانی ئەو بەکارێکی شاعیرانە لێك بدەیتەوە، ئەوا زۆربەی ناڕوون مایەی گفتوگۆیە کە مەبەستی لە چیە. بەڵام پێدەچێت هەر ئەم مەسەلەیە خۆی بمانباتە سەر چوارەمین بابەت لەو چوار بابەتەی لێی دەدوێین.

تا ئێرە بە کورتی دەربارەی ئیرادەی هێزو ئالامرۆ و تیۆرەی دووبارەبوونەوەی هەتاهەتایی قسەمان کرد. ئەمێنێتەوە ئەو بیرۆکەیەی نیچە کە دەڵێت دەبێ دەرکێکی ئیستاتیکیانە یا هونەریمان بۆ ژیان هەبێت (واتە دەبێ وا بڕوانینە ژیان کە کارێکی هونەریە -و. ك-). وای بۆ دەچم مەبەست لەوە بێت کە ئەگەر لە دەرەوەی ئەم دونیایە هیچ شتێك نەبێت -وەکو خودا یان هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی ئاسمانی-؛ ژیانیش هیچ مەبەست و ئامانجێکی لە دەرەوە یان لە سەرووی خۆیەوە نابێت و، هەر ماناو بیانوویەك کە هەیبێت دەبێ لە ناوەوەی خۆیەوە هەڵبهێنجرێ. ژیان تەنها لە پێناوی خۆیدا هەیەو گرنگی و مانای بەتەنها لەناو خۆیدایەو، لەبەر هەموو ئەم هۆیانەش، لە کارێکی هونەریی گەورە دەچێت.

**ستێون:** بەڵێ، بە بێگومان ئەگەر بمانەوێ ڕەوابین بین ئەمە تارادەیەکی زۆر ئەو شتەیە کە نیچە لە بەرچاوی گرتووە. نیچە لە یەکەم کتێبیدا "لە دایکبوونی تراجیدیا" سێ جار ئەم دێڕە دووپات دەکاتەوە کە: (بوونی مرۆڤ و جیهان تەنها وەکو دیاردەیەکی هونەری تا ئەبەد پاساوی هەیە). ئەم دێڕە دێڕێکی ئاڵۆزەو ئامەوێ بچمە ناو وردو درشتیەوە. بەڵام ئەوەی نیچە بەراستی دەیەوێ بیڵێت ئەوەیە کە مەزنی یۆنانیە کۆنەکانی بەر لە سوکرات؛ لە تراجیدیاکانیاندا بوو. لە ڕێی ئەم تراجیدیانەوە بوو کە ڕووبەڕووی خراپترین لایەنەکانی ژیان دەبوونەوە -وەکو زوو ڕۆیشتن لەم دونیایە و بەردەوام نەبوون و پەڕپووتیی ژیانی مرۆڤ و بەندبوونی بە کۆمەڵێك هێزی گەورەتر لە مرۆڤەوە- و بەرزترین سەرکەوتنیشیان ئەوەبوو کە دەیانتوانی لە تان و پۆی ئەم شتانە، ئەفسانەو چیرۆك و تراجیدیای وا سەرسوڕهێن بخولقێنن. نیچە فراوانترین و گەردوونیترین بەڵگەکان بەم مانایە دەدات و وەکو شەکسپیر کە هەندێ جار لەم جۆرە پرسیارانەی دەکرد؛ دەپرسێ: ئایا ئەم جیهانە دەبێ بە جیددی وەربیگرێ؛ یان گشتی هیچ نیە جگە لە یاریەکی گەورە، لە نمایشێکی مەزن، شانۆنامەیەك کە ئێمە نە ئەکتەرەکانی دەناسین و نە دەشزانین بۆ کێ پێشکەش دەکرێ؟ ئەگەر پاساوێك هەبێت -سەرنج بدەن ئەو ڕێك دەڵێن "پاساو" کە زاراوەیەکی حقوقیەو لەم دەقەیدا وشەیەکی لەخشتەبەرە- بۆ ئەوەی مرۆڤ بۆچی لەم دونیایەدا هەیەو بۆچی وەهایە کە هەیە، دەشێ ئەمەش هەر بەتەنها بەشێك بێت لە هەمان ئەو شانۆنامە گەردوونیە گەورەیە. بەشێکی زۆری

بیروڕاکانی نیچەو هەندێ لەسەرنج ڕاکێشترین و بەرزترین بیرۆکەکانی تەرخانە بۆ ئەوەی کە بزانێ پاساوی هونەریی بوونی مرۆڤ چیە.

**ماگی:** کەواتە ڕوانینی هونەری ئیستاتیکی لە چەند ئاستێکدا لەگەڵ گەوهەری بیری نیچەدا ئاوێتە دەبێت. بەڕای من گومان لەوەدا نیە کە هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ئەو توانیویەتی کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر هونەرمەندە داهێنەرەکان هەبێت. لەبەر ئەوەی ئێوەش خۆتان لە بواری ئەم باسەماندا، چەند وشەیەکمان سەبارەت بە چۆنێتی کاریگەریی نیچە لەسەر شاعیران و نووسەرە داهێنەرەکان پێ بڵێن.

**ستێرن:** هەمان ئەو سێ کەسە دەگرین کە خۆتان ناوتان هێنان: ییتس و شۆو لۆرەنس. یەکەمین جار کە ییتس نیچەی خوێندەوە؛ کتێبێکی بچکۆلە بوو کە هەڵبژاردەیەك بوو لە کارەکانی نیچە، وەرگێڕێك تەرجەمەی کردبوون کە ناوی (جۆن کۆمۆن)ە کە ناوەکەی لەگەڵ نیچەدا زۆر ناتەبایە[4]. لە ساڵی *1902* بەدواوە کە ییتس بە نووسینەکانی نیچە ئاشنا دەبێت، لە ڕیتمی گشتی کارەکانی و شیعرەکانیدا گۆڕانێکی ئاشکرا ڕوودەدات.

شیعری ئەو کە کەمێك هەڵچوون لەخۆدەگرێ و کەمێك لە زەتبزوێنەو مەیلی بەری بەدیدا هەیە کە خەسڵەتێکی کارەکانی "کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمن" (دوای ناسینی نیچە) دەگۆڕێت. قۆناغی گەورەی شاعیرێتی ییتس -یان وەکو خۆی دەڵێت؛ شیعری خاك و خوێنی- لە ژێر کارگەریی نەدی نیچەو لە ژێر کاریگەریی تەقەللاکانی بۆ پەی بردن بەهەندێ لەو مەسەلانەی ئێمە لەم گفتوگۆیەدا لێیان دواین، دوای ئەوە دێتە ئاراوە.

هەروەها کاریگەریی نیچە لەسەر برناردشۆ جۆرێکی ترەو زیاتر پەیوەستە بە بواری ژیان و بواری "چالاکیی ژینی"یەوە کە پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، واتە بواری ڕەوتی بێئەمان و بێ بەزەیی ژیان کە پاساوی لەناو خۆیدایە. سەبارەت بە لۆرەنسیش کاریگەریی نیچە لە شێوەی مەسەلەی ڕاستگۆیی و "ڕەسەنایەتی"دا دەردەکەوێ. هەڵبەتە ڕەسەنایەتی (یان "خۆبوون") بەو جۆرەی لۆرەنس وێنایدەکات، زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەوەی نیچەدا، لای لۆرەنس چۆنێتییەکی کۆمەلایەتی و سێکسی بەخۆوە دەگرێ، لە کاتێکا کە نیچە بایەخێکی ئەوتۆ بەم دوو لایەنە نادات. لۆرەنس لە ڕێی هاوسەرەکەیەوە -فریدا- نیچەی ناسی و، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە قووڵی کەوتە ژێر کارگەرییەوە. لۆرەنس ڕۆمانێکی هەیە ناوی (ئەو پیاوەی کە مرد)ەو لە کۆتاییەکانی ژیانیدا نوسیویەتی و بەسەرهاتی مەسیحەو، بەڕای من چیرۆکێکی هەڵبەستراوە. ئەم چیرۆکە ڕاستەوخۆ لەو هەوڵانەی نیچەوە سەرچاوە دەگرێ کە دەیویست لە ڕوانگەی دەروونناسێکەوە بڕوانێتە کەسێتیی مەسیح. پاشان کاتێ لە بەریتانیاوە بەرەو وڵاتەکانی تری ئەورووپا دەچین دەبینین پیرانندێللۆو تۆماس مان و ئەندرێ مالرۆو گەلێ نووسەری دی بە توندی کەوتوونەتە ژێر کارگەریی نیچەو تاڕادەی سەرسام بوون.

ستریندبێرگ لە ڕێی هاوڕێیەکی هەردووکیانەوە لەگەڵ نیچەدا نامەیان ئاڵوگۆڕ دەکرد. نیچە لە ساڵی *1900*دا مرد، بەڵام دوای مردنیشی هێشتا ئەفسانەی نیچە سەرچاوەی گەلێ کاریگەریی گەورە بووە. هەڵبەتە پێویستە باسی هەندێ هۆکاری وەکو کورتە نووسین و

دەربڕینی چڕو جوانی و سیحری دانسقەی خوازەکان و چڕوپڕیی نووسینەکانی ڕۆڵێکی گەورەیان لەو کاریگەرییەدا هەبووە. ئەدەب دۆستان حەزیان بە خوێندنەوەی کتێبی ئەستوور نیەو زیاتر کورتی و چڕو پڕییان پێپەسەندە. هەموو ئەم هۆکارانە لە بەرزەوەندیی نیچەدا بوون.

**ماگی:** مەسەلەیەکی ترمان کە ناکرێ باسەکەمان بەبێ ورووژاندنی ئەو مەسەلەیە کۆتایی پێ بهێنین، ئەویش مەسەلەی بەستنەوەی نیچەیە بە پەیدابوونی نازیزمەوە لە زەینی خەڵکدا. نازیەکان هەرچۆن ڤاگنەریان وەکو مۆسیقاری حیزب بۆ خۆیان زەوت کرد، نیچەشیان کردبوو بە فەیلەسووفی حیزب و، یان باشتر بڵێین بۆ خۆیانیان دزی بوو. ئەم کارە دواتر ناوی ئەم دوو بلیمەتەی لای خەڵکانێك لەکەدار کرد. ئایا بەڕای ئێوە، بەستنەوەی نیچە بە فاشیزمەوە کارێکی ڕاست بووە یان ناڕەوا؟

**ستێرن:** من وای بۆ دەچم ئەم بەستنەوەیە تا ڕادەیەك ناچاریە، هەڵبەت زیاتر بە فاشیزمەوە نەك ناسیونال سوسیالیزم. مۆسۆلینی بە فراوانی نیچەی خوێندبۆوەو کاتێ لە ساڵی *1938*دا لە ملەی برێنیر لەگەڵ هیتلەردا یەکیان بینی، هیتلەر دانەیەك لەکۆی کارەکانی نیچەی پێشکەش بە مۆسۆلینی کرد. هیتلەر هەرچەند وشەیەکی نیچەی بەرگوێ کەوتبوو (بەتایبەتیش عیبارەتی "ئیرادەی هێز"ی دەزانی بەلام لەوە ناچێت هیچ شتێکی نیچەی خوێندبێتەوە. وای بۆ دەچم بەستنەوەی بەنازیزمەوە لە هەندێ ڕووەوە پاساوی هەیە. با بڵێین: ئەم حیزبانە پشتیان بە ڕۆشنبیرەکانیان بەستبوو و، ڕۆشنبیرەکانیش خۆیان بەجۆرە ئایدیۆلۆژیایەکی تێکەڵ و پێکەڵەوە بەستبۆوە، نیچەش لەم ڕووەوە ڕۆڵی هەبوو. بەلام لە هەمان کاتدا دەبێ زۆر جەخت لەوە بکەین کە زۆر شت -شتی زۆر گرنگتر- لە نیچەدا هەیە کە لە ڕوانگەی ئەو داڕو دەستەیەوە کوفرێکی پەتیە. خۆبوون و ململانێ لەگەڵ دەروونداو هەوڵدان لە پێناوی هەندێ بەهای بەرزی وەکو بەخشندەیی و بەرز ڕوانین و گەورەیی بەو مانایانەی کە پێشتر باسمان کردن، شتێك نین لەگەڵ ئایدیۆلۆجیا کوشتارگەرەکانی زادەی ڕایشی سێیەم، یان پێش ئەو لەنێو ئیتالیەکاندا، بچووکترین خاڵ کۆیان بکاتەوە.

**ماگی:** بە گوێرەی ئەو ڕاستیەی کە ئێوە بەشێکی زۆری تەمەنی خۆتان بۆ توێژینەوەو نووسین لەسەر نیچە تەرخان کردووە، ئاشکرایە کە بڕواتان بەوە هەیە سەرباری هەر کەم و کورتیەك کە دەشێ لە نیچەدا هەبێ: ئەم کارە کارێکە کە بەهای مەزنی خۆی هەیە.

**ستێرن:** بەڵێ، بە بڕوای من گومانی تیا نیە کە ئەم کارە زۆر پڕ بەهایە، هەڵبەتە بەو مەرجەی کەس وەکو دەرمانی هەموو دەردەکان سەیری نەکات، بەڵکو بیەوێ پەی بەوە بەرێت کە ئادەمیزادەکان چییان لە دەست دێ و سنووری تواناکانی ئادەمیزاد تا کوێیەو مرۆڤ دەتوانێ دەرك بەچی بکات و ئەو شتانەش چین کە دەتوانێ لەناو ناخی خۆیدا بیانخولقێنێت*.

## پەراوێزەکان:

1-فاوست، *Faust*: کەسێتیەکی نیوە ئەفسانەییە لە ریوایەتە ئەڵمانیەکاندا، دەگوترێ کە ئەستێرەناس بووەو لەگەڵ شەیتاندا پەیمان دەبەستێ تا پشت لە خوا بکاو بەرامبەر بە لاوێتی ئەبەدی و زانینی فراوان و دەسەلاتی سیحری؛ رۆحی خۆی پێ بفرۆشێت. چیرۆکی فاوست سەرچاوەی ئیلهامی شاعیرانێکی وەکو کریستۆفەر مارلۆو گۆتەو نووسەرانێکی وەکو تۆماس مان و مۆسیقازانانی وەکو برلیوزو گۆنۆو لیست بووە. فاوست سیمبوڵی تینوێتی بێ سنووری ئادەمیزادە بۆ زانین بە پشت بەستنی تەواو بە هێزو توانای خۆ (و.ف).

2-پیرگینت *Peer Gynt*: پاڵەوانی شانۆنامەیەکی ئیبسنە بەهەمان ناوەوە. ئیبسن کە شانۆنامەنووسێکی گەورەی نەرویجیە لەم کارەیدا هەوڵی داوە لایەنە ناپەسەندەکانی خووی هاوولاتیانی -وەکو ئێرەیی و خۆپەرستی و بێباوەڕی- لە قالبی کەسێتیی پیرگینتدا بخاتە روو. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە هەم پیرگینت و هەم فاوست (لانی کەم لای گۆتە) سەرەنجام بەخۆشەویستی پاکی ئافرەتێك رزگاریان دەبێت. (و.ف).

3-بۆرجیا *Borgia*: بنەماڵەیەکی ئیتالیایی بەناوبانگی بە ئەسڵ ئیسپانین کە لە سەدەکانی پانزدەو شانزەدا توانیویوویان سامان و دەسەلاتێکی زۆر بەدەست بهێنن. لە ناسراوترینیان ئەلفۆنسۆو رۆدریگۆ، کە هەردووکیان بوون بە پاپا، هەروەها چزارە (سیزەر) و لۆکریتسیای خوشکی کە لە مەیدانی سیاسی ئەودەمەی ئیتالیادا کاری گەورەیان کردو ناویان بە دەسەلات پەرست و بێ بەزەیی و هەلپەرستی دەرکرد (هەرچەند ماکیافیللی لە کتێبی "میر"دا بە باشی باسی سیزەر دەکات).

4-*John Common*: یەکێك لە ماناکانی "کۆمۆن" لە ئینگلیزیدا گشتی یان "عەوام"ە. "جۆن"یش لە ولاتە ئینگلیزییەکاندا ناوێکی زۆر باوە. بەم جۆرە گرێدانی ئەم دوو ناوە بەیەکەوە شتێکی باو و گشتی لێ دەردەچێت، ئەو شتەی کە بەردەوام ئیچە دژایەتی کردووە.

*ئەو سەرچاوەیەی ئەم کتێبەی لێوە تەرجەمە کراوە:

فلاسفەء بزرگ. آشنایی با فلسفەء غرب، نوشتەء/ براین مگی، ترجمەء: عزت الله فولادوند، انتشارات خوارزمی، چاپ دوم *1377* (*1998*) تهران.

ناوی کتێبەکە بە ئینگلیزی:

***The Great Philosophers***

***-An Introduction to Western Philosophy-***

***Bryan Magee***

# نیچە.. فەیلەسوفی ژیان

## دیدارێك لەگەڵ "ئەلێکسیس فیلۆنینکۆ"

*-بەبۆنەی تێپەربوونی سەدەیەکەوە بەسەر مەرگیدا-*


■ سازدانی: دیرێ ریمۆند

● و. لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید


لە جیهانی نیچەدا بیرۆکەیەك هەیە کە گوایا شتێك ون بووە، تا هەتایە نادۆزرێتەوە. هونەر تەنها شتێکە بەرگەی ئەو بۆشاییە دەگرێ. (ئیدی) نیچە زانستی ئیستاتیکای سۆز دادەمەزرێنێ. ئەمە دیدارێکە لەگەڵ "ئەلێکسیس فیلۆلینکۆ"* دانەری کتێبی: (نیچە، پێکەنین و تراژیدیا).

* * *

-ئەلێکسیس فیلۆلینکۆ لە سەر کورسیە گەورەکەی لەنێو هەزاران پەڕاوی کتێبخانەکەیدا دانیشتوە، بەچاوە نیمچە نوقاوەکانی تەماشام دەکا، گوێ ڕاتەدێرێ لە کاتێکدا لە نێو دوکەڵی جگەرەکەیدا ون بووە. ئەو لە (بۆرفیر) بشکەنەری (خاوەن کەسایەتی) ئاڵۆزی ڕۆمانی (تاوان و سزا)ی دیستۆفسکی دەچێ. پێم گوت لەو دەچێ، ڕازی بوو (ئەویشی وت کە دەکرێ منیش لای خۆمەوە ڕۆڵی ڕاسکۆلینکوف بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە بینم).

دەمزانی کە لە توانامدایە دەربارەی چەندین بابەتی جۆراوجۆر پرسیاری ئاراستە بکەم، لە میتافیزیکەوە بۆ زانستی تاوانناسی. هەروەها کەسایەتی ئەو (شۆبنهاوەر)ی دەهێنامەوە یاد، چونکە فیلۆلینکۆ میتافیزیکستێکی گەورەیە و ژمارەیەك لێکۆڵینەوەی سەیرو سەمەرەی دەربارەی کانت و نیچە نوسیوە، دەکرێ ئەویش وەکو نیچە بڵێ "هەر شتێك مرۆیی بێت بەلای منەوە گرنگە". پێش ماوەیەك هەروەکو شوبنهاوەر کتێبێکی لەژێر ناونیشانی *Parerga et Parallpomena* (کە ناونیشانی کتێبێکی شۆبنهاوەرەو مانای "پاشکۆو پاشماوە" دەگەیەنێ) نوسی. دواتر کتێبێکی دەربارەی مێژووی شەڕی بۆکسێن -تاریخ الملاکمە- و کتێبێکی دیکەی دەربارەی تاوان نوسی. هەروەها دوای ئەوەی وەك نوسەرێکی میتافیزیکی چەند کارێکی ئەنجام دا، بڕیارە لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی لویسی شازدەهەم ئامادە بکا. بۆ جاری دووەم کتێبێکی ئەوم بە ناونیشانی (شۆبنهاوەر، فەیلەسوفی تراژیدیا) -کە بڵاوکراوەکانی ساڵی *1980*ی (فران)ە- خوێندەوە، پاشان کتێبێکی تری ئەوم بەناونیشانی (نیچە، پێکەنین و تراژیدیا) -کە بڵاوکراوەی *1995*ی زنجیرە گیرفانە- خوێندەوە.. بڕیارمدا ئەم دیدارەی لەگەڵدا سازبدەم دەربارەی _نیچە فەیلەسوفی پێکەنین و تراژیدیا).

**دیدیّ ریمۆند: هەندیّ جار ڕەخنە لە تازەیی نیچە گیراوە، چونکە گومان لەوەدا نیە کە ئەو لە زۆربەی لێکدانەوە فەلسەفیەکانیدا قەرزاری شۆپنهاوەرە. چۆن بڕوانینە مامۆستاو شاگرد لە پەیوەندیاندا بە یەکترەوە؟**

**ئەلیکسیس فیلۆلینکۆ:** کاتیّ نیچە هۆگری فەلسەفە بوو تەمەنی بیست ساڵان بوو، ئەدەکرا خۆی لە شوبنهاوەر لابدا کە کتێبە بنەڕەتیەکەی خوێندبۆوە. بەڵام قوتابیەکی بێکەڵك بوو، گەر بتوانین ئەو قسەیە بکەین. چونکە لە کاتێکدا شۆپنهاوەر دەڵیّ مێژو هەمیشە وەك خۆیەتی بەلام لە فۆرمی جیاوازدا (هیچ شتێك ناگۆڕیّ.. تریەی دڵی مرۆڤ هەمیشە وەك خۆیەتی، ئەوەی دەگۆڕیّ تەنها جل و بەرگە).. نیچە لە کتێبی (چەند ئیعتبارێکی نا هەنوکەیی– إعتبارات غير راهنە)دا جیاوازی لە نێوان سیّ وێنەی مێژودا دەکا، یەکەمیان: مێژوی یادئامێز، وێنەیەکە لە مێژو کە شوێن دەست جێدێڵیّ و لەلایەن مێژوی پشکنەرەوە بەسەر دەکرێتەوە. ئەمەش یەکەمین جیاوازیە لەگەڵ شۆپنهاوەردا: مێژوی نکوڵیکەر– شۆپنهاوەر لەسەر بنەمای ئەو ئیستاتیکا باڵاخوازەی کە بەدحاڵیبوونێك دەربارەی لە ئارادایە دیارو دیاردە تێکەڵ دەکا– زەمینەش بۆ مێژوی ئەفرینەر خۆش دەکا. کتێبی (زەردەشت ئاواتی وت) ستراکتۆرێکی باڵای مێژووە. مرۆڤ واقعێك نیە لە ئارادا بێت بەڵکو واقعێکە دەبیّ بەهەموو مانایەك ئەنجام بدریّ. ئەمەش جیاوازیەکی جوانی دیکەی نێوانیانە –جیاوازیەکی تریش لە نێوانیاندا هەیە– شۆپنهاوەر فەیلەسوفی مەرگە، بەڵام نیچە فەیلەسوفی ژیانە. کاتیّ شۆپنهاوەر بەنێو دارستانێکدا لە پایزدا پیاسە دەکا چی دەبینیّ؟ گەڵای مردوو، لقی ڕەشداگەڕاو، شەهیدەکان و شایەتەکان، (هەمان شت) دەربارەی ململانێی نێوان براکان، کە درەختە گەورەکان لە پێناو هەڵچوون بەرەو چنگ کەوتنی تیشکی زیاتر ئەنجامی دەدەن. پاشان بۆنێکی ترسناك، بۆنی لاشە مردووەکان، کە لە هەموو شوێنێکەوە دەردەچیّ. هەموو دارستانێك سرودێکی تەرم بەڕیّ کردنە، ئەمە ئەو شتەیە کە شۆپنهاوەر دەیبینیّ و دەیبیستیّ. بەڵام نیچە لە بەرامبەردا لە کاروانی سەرەتایی بەفرو ئاگری گەڵا ئاڵتونیەکاندا نوستنی سروشتێکی جوان دەبینیّ کە دەژێتەوە. بێگومان ناکریّ جگە لە چەند جیاوازییەك (لە نێوان ئەو دوو فەیلەسوفەدا) جیاوازییەکی ئەوتۆ بزانین، بەڵام من ئاماژە بۆ ئاشکراترینیان دەکەم.. واتە ئەو جیاوازییەی کە ئیجا بۆ ڕەوتی (زەردەشت ئاوای وت) دەکا: کە فەلسەفەیەکی خۆرئامێزە دەچێتە سەر شەو و ڕۆژ، یان فەلسەفەیەکی گەردوونیە.

**ئەی مۆسیقا؟**

کاتی ئەوە هاتوە باسی مۆسیقا بکەین، مۆسیقا لەیەك کاتدا پردو بۆشاییە. لە دیدی نیچەو لە دیدی شۆپنهاوەریشەوە: مۆسیقایەکی مۆدێرنی خراپ و موسیقایەکی کلاسیکی چاك لە ئارادا نیە. دەبیّ وریابین لە دەرکردنی حوکمی خێرا.؟ شۆپنهاوەر حەزی بە ڕۆسینی و مۆزار دەکرد. دەڵێن ئەوە هەڵبژاردنێکی دەگمەن و سەیر بوو، بەڵام ئەگەر بلوایەو لە هۆڵی مۆسیقای مەزن لە ڤیەننا گویّ بیستی ***Massa di Gloria*** ی ڕۆسینی بووبنایە دەبوو چاو بەو حوکمەدا بخشێنینەوە. ئەو قودلسە بەلای شۆپنهاوەرەوە تازەو جوان بوو. نیچە لەو لایەنەوە بەشداری

شۆبنهاوەری دەکرد: بەو پێیەی دەشێ مۆسیقا جێی میتافیزیک بگرێتەوە، چونکە وەک ترپەی ئەسپایی دڵی جیهان وایە. ئەمەش لەیەک کاتدا هاوبەندیی بەهێزو کەلێنی نێوان نیچەو شۆبنهاوەرە. لە راستیدا نیچە مۆسیقاژەنێکی سەرکەوتو بوو.. لە کاتێکدا شارەزایی لە ژەنینی پیانۆدا هەبوو، بەهرەیشی لە ژەنینی خۆکردەییدا هەبوو -چەندین بەڵگەی ئاشکراش لەم بارەیەوە هەن.. سەرەرای ئەوەی ئەو پارچە مۆسیقا کەمانەی کە لە دوای خۆی بۆی بەجێ هێشتووین تەعبیر لە کەسایەتێکی زۆر شیرین و دوور لە دەنگی مۆسیقاکانی ڤاگنەر دەکەن. بەڵام شۆبنهاوەر نە مۆسیقاژەنێکی (زانستی) و نە مۆسیقاژەنێکی خۆکردە بوو. ئەمەش رێگە نادا وەک مۆسیقاژەنێکی باش ببینین: من ناتوانم وێنای مۆسیقارێک بکەم کە بێ بەشە لە پەیوەندییەکی گیانی بەگیانی لەگەڵ ئامێری مۆسیقادا، واتە ئامێرەکەی، جگە لەوە دەڵێن پێویستە مرۆڤ ئامێرێکی تایبەت بەخۆی فێر ببێ.

بەڵام گریمان ئەگەر ئەم مەسەلەیە براوەتەوە، دەکرێ قسە لە تێرامانە فەلسەفیەکانی شۆبنهاوەرو نیچە بکەین. شۆبنهاوەر بیرۆکەیەکی بۆ هاتبوو کە بیرۆکەی کریستاڵ بوو، ئەو بیرۆکەیە تەنها کەرەتێک لە زەیندا دەخەملێ و ئیدی گەشە ناکا. لە راستیدا نوسینە جۆراوجۆرەکانی ئەو شتێک نیە جگە لە گۆرانکاری لە بابەتێکدا کە نەگۆرە: دیاردەکان هەمیشە ئاشکران. هەر ئەم خاڵەشە لە (برگسۆن)ی جیادەکاتەوە کە بابەتەکەی لە چەند ئاستێکی ئەنتۆلۆجی جیاوازەوە سەرچاوە دەکرێ. بەڵام (لەهەمان کاتدا) بەشێوەیەکی زیرەکانە لە (نیچە)ی نزیک دەکاتەوە کە خاوەنی تێگەیشتنێکی یەکلاکەرەوە بوو سەبارەت بە خەملێنی میتافیزیک لەنێو خودی خۆیدا. ئەو خەملێنەی کە دوو جەمسەری بزۆک دەستنیشانی دەکەن: یەکێکیان مرۆڤی باڵا، ئەوی تریشیان Unter- Mensch (مرۆڤی نزم)، کە (پرۆسەیەکە) خاوەنی یەک گەوهەرو دوو ئاراستەیە.

لە دۆخێکی لەو جۆرەدا وێنەیەک هەیە کە رێک ناخرێ، ئەویش ئەو وێنەیە کە ئەدگاری Gaya Scientia دەڕلزێنێتەوە، دەمەوێ بڵێم: وێنەی مەنزڵ، (چونکە) بیرۆکەی نیشتەجێ بوون زۆر روون و ئاشکرایە لای شۆبنهاوەر: نیشتەجێ بوونی تا هەتایی کە گۆڕە.. بەڵام بە مانایەک لە ماناکان لای نیچە شتێک نیە بە مانای گۆڕ. شتێک هەیە لای ئەو لەوەی تێپەڕاندوە، کە لە یەکێک لەو شیعرانەدا هاتووە کە لە قۆناغی لاوێتیدا نوسیویەتی تیایدا دەڵێ: رەنگە مردن بە ئاستەم وێنابکرێ، چونکە لە ناخی قوڵاییەکانی زەویدا درەختی زیندو خۆراک وەردەگرێ.

دەمەوێ ئەم پرسیارە بە ئاماژەیەکی زمانەوانی کورت دەربارەی سێ چەمک کۆتایی پێ بێنم: (یەکەم) ***Wille zur Macht*** کە تەرجەمەی دەکەم بۆ "ئیرادەی هێز"؛ ئەگەر وشەی ***zur*** بە واتای بیرۆکەی پەشێوییەکی ئاراستەکراو بێت دەکرێ (دەرخەر)ێکی بەدوادا بێت، واتە دەبێ تەرجەمەی بکەین بۆ: "ئیرادە بەرەو هێز"؛ (دوەم) ***Tanzlied*** تەرجەمە دەکەین بۆ: "مۆسیقای سەما"، بەڵام رێگەنادەین هەردوو بیرۆکەی ئەسپایی و ئازادی میتافیزیکی تەعبیر

لە خۆیان بکەن؛ (سێهەم *Widerkehr des Gleichen* "گەڕانەوەی خودی شتەکان" دەبێ بوترێ شتێك کە سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بوار نەدرێ بەگریمانەی بوونی ئاوێتەیەك لە خودی شتێك و شتێکی تریش.

**دوای ئەوەی نیچە هاندەرێك و هاوڕێیەکی (نزیکی) ریچارد ڤاگنەر بوو، ساڵی 1876 بۆ دواجار پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەودا کۆتایی پێهێنا. داخۆ هۆکارە قوڵەکانی ئەو دابڕانە چی بوون؟**

دەکرێ بەچەند شێوەیەك وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە. بابەتی **Niebelungen** دواجار بەلای نیچەوە بابەتێکی منداڵانە دەرچوو. لە راستیشدا بابەتێك بوو تام و چێژ و ناوەرۆکی حیکایەتی هۆمیرۆسی نەبوو. چونکە (سیگفرید) لەگەڵ گەلای داریدا (ناخیل)ێکی ساختەیە، ئەوکاتەی گەلای داری بە چالاییی سەرپشتەوە چەسپ دەبێ چاوی سێهەممان دینێتەوە یاد کە لە چالاییی تەوێڵی زەبەلاحە (ئەفسونیە)کاندا هەبوو کە لە رێگایەوە داهاتوویان دەبینی. توانایەکی لەو جۆرە کە لەلایەن (ناخیل)ەوە لە کار کەتبوو دەچێتە پاڵ ئەو بیرۆکەیەی هۆمیرۆس کە دەڵی هەموو مرۆڤێك کائینێکی لەکار کەوتووە. شارەزایی نیچە لە گریکۆلۆجی (الیونانیات) فراوانترە لەوەی رازی بکا ئەو جۆرە چاکسازییە ئەنجام بدرێ. بە بڕوای ئەو نەدەکرا بگەینەوە بە ئازادی گریکەکان. لە راستیشدا ئەوە ریچارد ڤاگنەر نەبوو کە گۆڕا، بەڵکو ئەوە نیچە بوو زۆر بە قووڵی گەشەی کردبوو کاتێك لە رۆحیەتی گریکی رادەما. هەروەها پەیوەندیی نێوان ئەوان (نیچەو ڤاگنەر) لەگەڵ مۆسیقاشدا گەشەی کردبوو: رەشەبایەك لای ڤاگنەرو هێمنییەکی بێگەرد لای نیچە؛ دەکرێ فەلسەفە بەهۆی دەنگی چەکوشەوە دروست بکەین. بەڵام ناکرێ پشت بە نیچە ببەستین بۆ نوسینی (کلاشڤان)ی تەنککراو لە رێگای دەنگی وەشاندنی چەکوشەوە. دواتر، پاش ماوەیەکی دوورو درێژ نیچە عەشقی (بیزێ) بوو: من لەو بڕوایەدام ئەوە رقێك نەبوو لە ریچارد ڤاگنەر کە لە ماوەیەکی درێژدا کەڵەکە بووبێ. بەڵکو راستتر ئەوە هەڵبژاردنی باشوور بوو دژی باکور. هەڵبژاردنێکی پێشوەخت بوو لەسەر هەمان دیدار لەگەڵ ڤاگنەردا. یۆنان و تیشکی بارسینۆن دژی باکوری بروسیاو تەم و مژە ئاڵۆزەکەی.

**ئایا دەکرێ مۆسیقا دڵنەوایکەر بێت؟**

مۆسیقا وەك هونەرێکی دڵنەوایکەر بیرۆکەیەکە هەمیشە لە ئارادایە. بەڵام بەهەر حاڵ شۆبنهاوەر و نیچە بەشێوازێکی زۆر تازە باس لەو بیرۆکەیە دەکەن. مۆسیقا ناتوانێ دڵنەوایمان بکا ئەگەر بەشێوازێکی دابڕاو نەبێت. بەو پێیەی (ئەو مەسەلەیە) ئامادەیی لە خواست و نیەتی "*Geist*"دا هەیە؛ ئەوا دەبێتە هۆی خۆشبینییەکی راستەقینەو رازی بوون بەرامبەر بوون. ڤاگنەر حەماسەتمان پێدەبەخشێ، بەڵام نیچە لەیلایەمان بۆ دەکا -ئەمە ئەو ئەنجامەیە کە لە ڤاگنەرو پارچە مۆسیقاکانی نیچە هەڵم هێنجاوە، ئەو پارچە مۆسیقایانەی کە بە شێوەیەکی کارەساتبار پڕن لە کەلێن. داخۆ بۆچی نیچە هەوڵی نەدا پیشەی مۆسیقاژەنی ئەزموون بکا؟ لە راستیدا من شتێك لەم بارەیەوە نازانم، بەڵام هەست بە شتێك دەکەم.. هەست دەکەم نیچە بە شێوەیەك شەرمن بوو کە رەنگە

باوەڕ نەکەین. هونەرمەندی راستەقینە مرۆڤێکە خۆی نمایش دەکا بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانەو شەرم ناناسێ. ئەمە دژبوونێکی گەورەیە. نیچە وەك مۆزار بەرگەی نەگرت. بەلام مادام هەموو شتێك لە دەستی مرۆڤ یان لە دەستی سروشتی ئازاد دەربازی دەبێ دەکرێ دڵنەوایکەر بێت. ئەوەی کە بوار بە خۆدزینەوە نادا ئەوەیە ئەو شێوازە لە هونەرە جوانەکان هاودەربیی لەگەڵ ئەم جۆرە لاواندنەوەیەدا هەبێت، ئەمەش بەرەنجامی ئەوەیە کە بەدەست هاتووە. ناکرێ ساتەوەختێك لە مۆسیقا تەسلیمی دابڕان لە کەشێکی کولتوری ببێ؛ زیاتر لەوە دەکرێ مۆسیقای نیچە تەعبیر لەو ساتەوەختە بکا، بەهەمان ئەو ئەندازەیەی کە دەکرێ لە رێگای شیعرەکانیەوە قسەی لێبکەین، کە مۆرێکی قەرەجیانەی پێوەیە. بەلام ئەمە تەنها هەستێکی شەخسیی پەتیە.

**لەم رووەوە ئایا دەکرێ نیچە وەك خوێنەرێکی کانت بناسین؟ یان وەك فەیلەسوفێك کەلە هەموو فەیلەسوفەکانی تری ئەلمانیا کەمتر ئەلمانیە؟**

خوێندنەوەی کانت لە رێگای (کاسیر)ەوە فەلسەفەی ئەلمانی فێرکردم. دواتر شێوازێك دیاری کرا کە هەمیشە لەلایەن بیرۆکەی دامەزراندنەوە ئاراستە دەکرا. ئێمەش وەك خەلکی فەرەنسا بیرۆکەی دامەزراندن بەسەرماندا زاڵە، بەلام بەشێوەیەکی جیاواز لە ئەلمانیەکان. ئەوەی هاوبەشە لە نێوانماندا ئەو بیرۆکەیەیە کە دەڵێ مەعریفەیەك هاتۆتە گۆڕێ و دەبێ دابمەزرێ. (بەلام) ئێمە هەست ناکەین پێویستمان بە دامەزراندنی هیچ شتێك هەیە. کانت بڕوای وایە دامەزراندن گرنگە، سەرەتا دامەزراندنی شوێن (ئەندازە) پاشان کات (زانستی ژماردن=الحساب). هەروەها ئەو میتۆدەی کە ناونراوە (ترسندنتالیزم) بەشێوەیەك کشاوە تەواوی ئەو شتانە دەگرێتە خۆی کە تایبەتە بە ئەقڵ.. بوارێك نامێنێتەوە بۆ هەستەکان بەو مانایەی کە راسین پێمان دەبەخشێ. پێناسەی لێکۆڵینەوەکە پێناسەیەکی فیکری ئەبستراکتە. تەنها گەوهەرە کە واقع دەکا بەکارێکی مومکین.. بۆ نمونە لە بواری فیزیادا گەوهەر وتەزایەکی سەببیە وەك کشتێکی پێکهێنەر. رەنگە بوترێ کەم و کورتیەکی زۆر لەم ئاستەدا هەیە: فراوانکردنی میتۆدی پێکهێنەرانە کە بەسەر کات و شوێندا جێبەجێ ببێ بەشێوەیەك رێگە بۆ لە دایکبوونی زانستە راستکەرەوەو زانستە رێکخەرەوەکان خۆش بکا. بەلام ئەم شێوە خوێندنەوەیە بلیمەتییەکی کانتیە، لەم خاڵەدا ڤانهینگەر *Vainhinger* کە سووك تەماشا کراوەو لە یادچۆتەوە بەهەڵەدا نەچووبوو. لەنێو وتەزاکاندا "من بیردەکەمەوە" ئامادەیی هەیە "هەروەها خێر لای ئەفلاتون ئەو ئامادەییەیە کەوا لە هەموو جۆرەکانی تری ئامادەیی دەکا مومکین بێت"، ئەو وتەزایە وتەزایەکی گەوهەریی خودی گەوهەرە، لەم بارەیەشەوە فەیلەسوفەکان توشی دەمەقاڵێ بوون، لە کاتێکدا لەسەر ئەوە کۆکن کە دەبێ ئیش بکەن لە پێناو تێپەڕبوونی گەوهەریەتی گەوهەر بەنێو ئەو ئازادییەی کە لەلای کانت دروست بوو، بەو پێیەی ئەولەویەتی هەیەو، واقعێکی ناوازەی ئەقڵە.

پێش هەموو شتێك من حەزدەکەم تیشك بخەمە سەر ئەو کودەتا گەورەیەی کە لەگەڵ (کانت)دا هاتە گۆڕێ، ئیدی بوونەوەر، لـ

بنەڕەتدا ئەو کەسە نیە کە لە ریشەی شتەکانی بووندا ئامادەیی هەیە، بەڵکو ئەوە ئیرادەیە، بەو مانایەی ئەوەیشی کە بوونی نیە تامەزرۆی هاتنەبوونە. بوونەوەر لەسەر زەمینەی خواست و ئارەزووەکان لە دایك دەبێ. روناکی لە بنەڕەتدا بنەمایەك نیە بەڵکو ئەنجامێك، ئەوەیشی رەسەنە کات نیە بەڵکو شەوگارە.

پرسیارت لێکردم دەربارەی ئەوەی نیچە لەهەموو فەیلەسوفەکانی تری ئەڵمانیا کەمتر ئەڵمانیە، هەموو ئەو ئیعتبارانەی کە بە وردی باسمان کردن ئاماژە بۆ سەلماندنی ئەو قسەیە دەکەن.. بۆنمونە نیچە لە رادەبەدەر حەزی لە مۆسیقای باشور کردووەو، بەردەوام لە سەرچاوە گریکیەکانەوە ئیلهامی وەرگرتووە، پێکەنینی هۆمیرۆسی و، چەمکی تراژیدیا. ڤاگنەر بە ئاسانی لە چاخی گریکیەوە پەڕیەوە بەرەو رەگەزە ئەڵمانیەکان، بەڵام بەشێوەیەکی وردتر ئەو پەڕینەوەیە (لای کەسانی تر) هێندە ئاسان نیە. بۆ نمونە (یۆنان)ی ڤاگنەر شتێك نیە جگە لە (یۆنان)ی شیللەر کلاسیکیەتی ڤایمار. نیچە لە هەموو فەیلەسوفەکانی تری ئەڵمانیا کەمتر ئەڵمانیە، چونکە لە هەموویان زیاتر ئەڵمانیە.

میتافۆر (المجاز) یەکێکە لەو گرفتانەی لە ئارادایە. فەیلەسوفە ئەڵمانیەکان بیرۆکەی سیستمیان پێ باش بوو؛ لەکاتێکدا نیچە لە رێگای میتافۆرەوە ئەو بیرۆکەیەی ئەولنی رەت دەکردەوە. ئاڵۆزیەکی زۆر لە میتافۆرەکانی نیچەدا هەیە، هەڵوێستی (سیبستۆڤ)یش لەم بارەیەوە دەزانین. بە بڕوای من نیچە ئەو مەسەلانە ناخاتە روو کە پەیوەندیان بە (کانت)ەوە هەیە. هەموو ئەو مەسەلانە بەتایبەتی (ئەمریی رۆح) لە روانگەی باڵاخوازی و یەزدانی ونبوودا داڕێژراوە. لەکاتێکدا نیچە خەون بە نموونەیەکی نزیکی باڵاوە دەبینێ کە دەکرێ پێی بگەین. بێ هیچ ترسێکیش، بەڵام بە ئیحایەکی زۆرەوە، دەڵێ نمونەی باڵای ئەو سەربازی بروسیە.

**بەڵام دەبێ لە گۆشەنیگایەکی نوێوە سەرلەنوێ بیر لە بەهاکانی ئەو سەردەمە بکەینەوە؟**

لە راستیدا ئەنجامە ئیستاتیکیەکان زۆرن. پێش هەموو شتێك بە بڕوای نیچە ئیستاتیکا (جوانناسی) لە چاخەکانی ناوەڕاست نزیکترە تا چاخی نوێ. چونکە نیچە بەهاکانی ئەسپ سواری پێ باشتر بوو. لە راستیدا بەلای منەوە چاخی ناوەڕاست هەڵگری پاکێتی بوو، ئاریان و ئەوینی پاکیزەیی لە کتێبی (زەردەشت ئاوهای وت). ئەوینی پاکیزەیی ئەوینێکی تەواو پاك نیە، تینوێتییەکە لە پێناو دووکەسدا. لێرەوە ئەو گەیشتە بیرۆکەیەکی زۆر ئاسایی: بەو پێیەی ئەو جۆرە ئەوینە ئەوینێکی ئیستاتیکی و پاکیزەییەو لەولیو خودگەرییەوە پەیوەندی دەسازێنێ. راناوی کەسی ئانامادە لە جوغزی ئیستاتیکی دەچێتە دەرەوەو سنورەکانی لە راناوی کەسی قسەکەر (أ) و راناوی کەسی قسە لەگەڵ کراو (ب)دا بەرجەستە دەبێ. فرێزی "تۆ دەڵێی" بەدوور گرتوومە کە تایبەتە بە ئاکار لە (ئەژنیهای گەورە)دا چونکە لەلایەکەوە ستریسی سۆزداری بەدوور دەگرێ، لەلایەکی تریشەوە بەشێکی گەورەی تەواوی دیاردەی مرۆیی پشت گوێ دەخا. لە کاتێکدا ئیستاتیکا هەروەکو نیچە دەیەوێ ئاشتبوونەوەیەکی هەمەلایەنەی تەواوی مرۆڤایەتیە. هەر بۆیە ئیستاتیکای کانت شتێك

نیە جگە لە بەشێك لە فەلسەفەی جەوهەری، بەشێکە لەنێو بەشێکی تردا، بەڵام لای نیچە (ناستێك)ی هەمەلایەنە. لێرەوە دەکرا ناشتبوونەوە لەگەڵ ڤاگنەردا مومکین بوایە.

بەڵام نیچە ویستی لە هونەری شیعرەکەیدا بەها کۆمیدیەکان بدۆزێتەوە، "زەردەشت ئاوهای وت" لێوالێوە لەو بەها کۆمیدیانە. ئەو جیرۆکانە زۆرن سەبارەت بە نامەی "سەردانێکی چاوەڕوان نەکراو".. ئەو قسانەش زۆرن کە دەکرێ دەربارەی نیچەو لێهاتویی بوترێن. هەڵپەی خۆشبینی لای ڤاگنەر ئەوی برینداری کردبوو، کە لای وابوو دەبێ هونەرمەند رەسەن بێت و، لە پشت داهێنانەکەیەوە خۆی حەشاربدا. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە شیکردنەوەی تیۆری هونەرمەند لای نیچە کارێکی زەحمەتە، دەشکرێ نێگەتیڤانە پێناسە بکرێ، بۆ نمونە ئەو زۆر دوورە لە هونەری "وێنەکێشان لەسەر جەستە **Body Art**" کە هونەرێکی قێزەونە. هەروەها جۆرێك لە بەلەسەیی لە ئەقڵیدا هەیە هەروەکو لای هەر هونەرمەندێکی گەورەی تر هەیە، باکیشی نیە بەرامبەر ئەو بیرۆکەیەی (گوایا) ترس دەبزوێنێ. (لۆدڤیگ ستاین) سەرسام بوو بەرامبەر هەڵچوونە سەرسەختەکانی ئەو. ئەمەوێ کەمێك ئەم خاڵە روون بکەمەوە: نیچە لە هەموو شوێنێك و، بەهەر شێولازێك بوایە دەینوسی. هەروەکو ئەوەی دەبوو ئەو بیرۆکەیە (یان ئەو وێنەیە) جێگیر بوایە کە بە دزیەوە نیگاکرابوو، لەترسی ئەوەی نەبا ئاهەتایە لەناو بچێ، لێرەوە مەحکوم بوو بەوەی لەنێو تۆپێك لە بروسکەی ئاگریندا بژی، ئیدی هەرگیز رەوتێکی توند لەسەر ئاستێکی دیاریکراو شك نابەین لەو ئامانەدا کە بۆی بەجێ هێشتووین.

لێرەدا شتێك (مۆزارت)مان دێنێتەوە یاد، هەروەها ژیانێکی ئاگرین کە ڤاگنەر نەیزانی لێی نزیك بکەوێتەوە یان لێی تێبگا نیچە لە "گۆرانیەك لە پێناو سەمادا" تەعبیری لەو ژیانە کرد.

دواجار ئەو چەمکە دەربارەی هونەر زۆر لەوە کلاسیکی ترە کە ئێمە وێنای دەکەین، ئەو چەمکە نیستاتیکای سۆزو ئازارە بەرەو گەڕانەوە: سەرەتا گەڕانەوە بەرەو گریك، پاشان گەڕانەوە بەرەو ئەوینی پاکیزەیی؛ رابردوو لەو ناستەدا بالایە. لە جیهانی نیچەدا بیرۆکەیەك هەیە دەڵێ شتێك بۆ ئاهەتایە ون بووەو ناگەڕێتەوە، تەنها هونەرە دەتوانێ دەرك بە گەورەیی ئەو دارو پەردووە ئەبەدییە بکا، تەنها ئەویشە بەرگەی ئەو بۆشاییە دەگرێ. بێگومان هەموو کەسێك سەرەتا وادەزانێ کە دەتوانێ لە یەکەمین نیگاوە لە هزرە وردەکانی نیچە حاڵی ببێ. بەڵام (لە راستیدا) ئەو زمانناس (فیلۆلۆجی)یەو، پێویستی بە وردبوونەوە هەیە.

**ئایا دەکرێ فەلسەفەیەك لە فەلسەفەکان قوربانی بە بیرۆکەی حەقیقەت بدا لە پێناو روانینێکی ئیستاتیکیدا بۆ جیهان؟**

دەوترێ نیچە خاوەنی بیرۆکەیەکی تازەیە دەربارەی حەقیقەت، ئەوەی دەربارەی ئەم بابەتە نوسراوە (هێندە زۆرە) نەك تەنها لە کتێبەکاندا بەڵکو لە مەوسوعەکانیشدا باسکراوە. لەگەل ئەوەشدا نیچە تەنها خاوەنی پەرەگرافێکە سەبارەت بەم بابەتە. کتێبە بەناوبانگەکەی (وتارەکان) کە لە ساڵی **1873**دا دەرچووە (تیایدا هاتووە) لە بنەڕەتدا ئێمە دوو بیرۆکەمان دەربارەی حەقیقەت هەیە، بیرۆکەی یەکەم میکانیکیە (حەقیقەتی تێکەیشتن)، دووەمیان

نیسـتاتیکیە (ئـەقڵ). حەقیقـەتی تێگەیشـتن حەقیقەتێکی تـەکنیکی و گشتیە، هیچ ماشینێك بەبێ سوتەمەنی کـار ناکا: هـەموو مرۆڤێك بەمە رازییـە -چـەندین حەقیقـەتی گشـتی و چـەندن حەقیقەتی ئاسـایی لـە ئـارادان. ئەوانـەی بـەکاری دەهێنـن سنگیان دەردەپـەڕێنن کاتـێ دەڵێـن: "مـن زانـام، مـن دیکـارتیم". تەنانـەت لای پزیشکەکانیش زاناکان هـەن. (ئیدی) گرنگ نیـە حەقیقەت پێشنیارێك بێت کە لـە یادمـان کردووە هەڵەیـە- ئـەوەی گرنگـە ئـەو زەمینەیـە کـە ئـەو جەختکردنەی تێدا دەخەملێ. بێگومان هەڵـەکانی زمـانیش هـەن: ئێمـە منداڵـەکان بـەرەو زانسـتە وردەکـان ئاراستە دەکـەین! هـەروەکو ئـەوەی زانسـت گـەلێك هـەبن کـە ورد نـەبن! لەلایـەکی ترەوە چەندین حەقیقەتی شەخسی هەن: ئـەوینی راسـتەقینە- کـە چرکەیـەك بـۆ بونـەوەرێك دەستنیشـان دەکـاو، تەسـلیم نـابێت تـاکو لـە رێگایـەوە لایبنـتز بدوێـین و لـە سیسـتمێکی دیاریکراودا دایبنێین.

دواجـار دەڵێـم حەقیقـەت لای نیچـە دەکـرێ جێگۆڕکێ بکاو تەعبیری لێ بکرێ. بـەو مانایەش حەقیقـەت لـە وەزیفـەوە نزیـك دەبێتـەوە. یـا ئەوەش بڵێین کە حەقیقەت جوڵە.

**لـەدوای نیچـەوە، داخـۆ دەکـرێ چـەند سیستمێکی فەلسەفی دابڕێژین لە رێگـای لاسـایی کردنەوەی مۆدێلی دیکارت بۆ میتۆدی ماتمـاتیکی یان باشتر وایە لەکاری هونەرمەندەکانـەوە سروش وەرگرین؟ ئایـا ئـەم خاڵـە رێگـەمان پێـدەدا سـەرلەنوێ پێناسـەی فەیلەسوف بکـەین بـەوەی فەیلەسوف هونەرمەندە بەرلەوەی زانا بێت؟**

پرسیارێکە بێ بوونی بابەتێك، چونکـە ئەگـەر مـن وێنـای ئاراستەکردنێکی دیکـارتی بکـەم، لـە بەرامبـەردا وێنـای سیستمێکی دیکـارتی ناکـەم. زانستەکانی پزیشکی و میکانیك و مۆراڵ تا ئێستا کامڵ نـەبوون. لـە راستیشـدا ئـەوە دلخوازییـەکی ناوەکی بوو تاکو جۆرێك لە ژیان لـە چوارچێـوەی ئاراستەکردنی دیکارتدا پێشکەش بکا؛ ئەوەی لـە زانسـتی پزیشـکیدا گرنگـە بریتـی نیـە لـە چارەسەرکردن بەڵکو درێژەدانە بەژیان. بێگومـان جوڵەکە دیالیکتیکیە: بەو ئەندازەیـەی ژیـانی مـن بـەردەوام دەبـێ، دەتـوانم وێنـای ئـەو ئەزمونانـە بکـەم کـە توانـای درێژکردنـەوەی ژیانیـان هەیـە، دواتر ئەم (پرۆسەی وێناکردنە) بـەردەوام دەبـێ و لەم بەینەدا شتێك لە (فەلسەفەی) نیچە لـە ئـارادا نیـە. جیـاوازی نێـوان دیکـارت و نیچـە وەك جیاکردنەوەی تەکنیکە لە چارەسـەرکردن. بـەڵام دلخـۆ خـودی بیرۆکـەی سیسـتم بیرۆکەیـەکی دیکارتیە؟ فردیناند ئالکێ بڕوای وابوو کە دیکارت خاوەنی ئاراستەیەکی کەساسـە، ئاراستەیەکە بـە سۆزداری بۆ بوونەوەر تەنراوە، بڕواشی وابوو کـە بابەت و بوونەوەر دوو شتی جیاوازن.

فەیلەسوف خـاوەنی دەسـەڵاتێکی گەورەیـە بەسـەر جیهاندا، ئـەو دەزانـێ کـە تێناگا، بـەڵام زانای سادە وا دەزانـێ کـە تێدەگا. زانـای سـادە بـەخۆی دەڵـێ کەسـێکی زانسـتی: چ زمـانێکی درێوە؟! دکتۆرێك لـە زانسـتی پزیشـکیدا لـە مـن زانستی تر نیە، خوێندکارێکیش کە کاتی خۆی لە پـەیمانگای تەکنیکـە هەمـەجۆرەکان دەرچـووە هیچی لەو زیاتر نیە.

**بـەم نزیکانـە کتێبێکـت دەربـارەی تـاوان و تاوانبـاران[—] دەرکـردووە، ئایـا فەلسـەفەی نیچـە**

**بەشێوەیەکی تایبەت بەگەڵك بوو بۆت لە نوسینی ئەو بابەتەدا.**

ئەوە گرفتێکی دروفاقە. لەلایەکەوە نیچە بە تیژبینیەکی زۆرەوە پەنجەی خستۆتە سەر لاپەڕەکان لە کتێبی (چەند یادەوەرییەك لە مەنزڵی مردووانەوە)ی دیستۆفسکی کە شۆڕشێکی لە ویژدانی روسیدا بەرپاکرد. دیستۆفسکی بەگشتی وتی ئەو لە پشت شوراکانەوەیە، بەڵام دەبینین بەهێزترین کەسەکان ئەوانەن کە لە باشترین تەختەکانی روسیا دروستکراون، ئەوانەی کە جارس و بێزار دەبن لەوەی هیچ پەشیمانییەك دەربڕن لە کاتێکدا، بۆ نمونە، بە قایشەکانیان لە ژنە لاوازەکانیان دەدەن کە لە قاچەوە هەڵواسراون تا گیان لەدەست دەدەن.. لە هەمان کاتیشدا قاقا پێدەکەنن و جامی گەورەی پڕ لە (کواس) هەڵدەدەن. بەلای ئێمەوە نەك بەلای خۆیانەوە ئەوانە لە پشت خێرو شەڕەوەن. لەکتێبی (ئەودیو خێرو شەڕ)دا نیچە لە نێو ئاوێنەدا رەنگدانەوەی واقیع یان رەنگدانەوە دەبینێ، بەڵام خۆ بەدرەوشتیش لە ئارادایە کە نە دیستۆفسکی و نە نیچە قبوڵیان نەبوو. ئەو باوکەی کە گەردنی ئەو داپیرەیە لول دەدا کە رازی نەبووە پێکێك ڤۆدگای بۆ تێبکا (ڤۆدا-ئاو-دواتر لە دوا پەرەگرافدا ئازیز و خۆشەویست..) باوکێکی بێ تاوانە. بەڵام ئەو پیاوە پەنجا ساڵەی کە بە زۆر سێکسی لەگەڵ کیژۆڵەیەکی بچوکدا کردووە تاوانبارە، چونکە پیاوێکە رۆحێکی پیسی هەیە. بە کورتی ئەو تاوانبارەی کە زادەی تەختە نایابەکانی روسیایە باڵادەستی نیشان دەدا. لە بەندیخانەشدا کاتێ دیستۆفیسکی هاوڕێیەتی ئەو تاوانبارە دەکا هەست دەکا زەلیلەو ئیهانە دەکرێ.

**نیچە وتوویەتی گەورەترین زانای دەروونناس دستۆفیسکیە، تەنانەت ئەوەشی وتوە کە لە ستاندال زیاترە.. چۆن لەو قسەیەی دەگەی؟**

نیچە (ستاندال)ی لەدوای شۆپنهاوەرەوە ناسیوە کاتێ تەمەنی *30* ساڵان بووە. وا بزانم دایکم ستاندالی خۆش دەویست و داوای لێدەکردم هەموو ئێوارەیەك لەسەر جێگای بەر لە مەرگیدا چەند لاپەڕەیەکی لە (نوسینەکانی) ئەوی بۆ بخوێنمەوە بە بڕوای دایکم ئەو ساحیرێکی خاوەن زیرەکیەکی درەوشاوە بوو. بەڵام با جەخت لەسەر ئەو شتە بکەین کە گەوهەرییە: تەمەنێك هەیە بۆ خوێندنەوەی ستاندال (*30* ساڵان) تەمەنێکیش هەیە بۆ خوێندنەوەی دستۆفیسکی (*40* ساڵان). ئیدی لەکاتی خۆیدا ئەو نوسەرە شك دەبەین کە گەورەتر لە نوسەرێکی تر تەماشای دەکەین. بە بڕوای من هەمان شت بەم ئاراستەیەدا دەربارەی نیچە رووی داوە.

**هایدگەر (نیچە) بە دوا میتافیزیکی و دوا مرۆڤدۆست لە قەڵەم دەدا.. ئایا دەکرێ بچینە پاڵ ئەم راڤەکردنە.. یان بە بڕوای تۆ دەبێ لەبەر چەند هۆکارێك بەرەنگاری ببینەوە؟**

زیاتر لە جارێك ئەو پرسیارەم لێکراوە. حەزدەکەم بەوە دەست پێبکەم کە ئێمە ناتوانین دەربارەی مرۆڤ و ناکامڵی مرۆڤ و.. هتد.. قسە بکەین و، رێگەش بە مرۆڤ بدەین وەك بەدناکامێك لە فەلسەفەدا هەڵسێ و کەوت بکا. بەردەوام لە لایەن ئەنترۆلۆجیاو فینۆمینۆلۆجیا-وە گورزو کوتەکمان بەردەکەوێ و کۆڵ نادەین. هەر لە (کلۆسبێرگ)ەوە بوونەوەر وەك نهێنییەك

تەماشا دەکەین. چەند لاپەڕەیەک لە *Was Ist das die philosophie?* بخوێنەرەوە، دواتر لەبەر ئەوەی دەبێ هەموو شتێك کۆتایی هەبێ با دەربارەی فەلسەفە قسە بکەین! بە بڕوای من بۆ ئەوەی (کۆتایی) بە شێوەیەکی دروست بناسین، پێویستە یان دۆخی سەرەتا بە گوێرەی (نمونەی مێژوویی) بناسین، یان سەرەتای نمونەیی بە گوێرەی (نمونەی مەبدەئی) بناسین.

دەستپێکردنی نمونەیی لای هەموان ئاشکرایە، پەیوەندی بە تێڕامانەوە هەیە لەو پرەنسیپانەی کە بەبێ بوونیان ناتوانین وێنای بیرکردنەوە بکەین. ئەوە هەڵوێستی (فیشتە)یە کە نیچە نایسەلمێنێ. ئەو شوێنەیشی کە بۆ تێگەیشتن -چەمك دلڕشتن- لە ئارادایە زۆر فراوانە. لە کاتێکی ئاوادا ئێمە خۆمان دەخەینە نێو هەڵوێستێکی مێژووییەوە، بەلام ئەوە هەڵوێستێکی شیعریەو، لەبەر ئەو هۆیەشە کە بێ دەسەلاتە لە بەرهەمهێنانی ئیدراك.

با بگەڕێینەوە بۆ پرسیارەکە دەربارەی دوا میتافیزیك.. ئەو پرسیارە ئەو مانایە دەگەیەنێ کە چەند میتافیزیکێك هەبوون و، تەنها ئاستی دەستپێکردنیان نەبووە. بەلام لە کوێن ؟ لە هونەرەکاندا لە کوێن؟ ئایا دەکرێ بڵێین ڤان کوخ دۆلاتۆ، مۆزار، بیتهۆڤن میتافیزیکیان هەبووە. ئەوکاتەی سنورەکان دەبەزێنین مانای ناوەکی وەك تەنها ئاستێك یەکلایی دەکرێتەوە. لەیەك کاتدا زۆرو کەمیشە. بەلام بۆچی بە ئارلستەی رابردوودا پرسیار دابڕێژین؟ ئەو کەسە کێیە کە بەو ئەندازەیە شێتە دەڵێ هەرگیز جارێکی تر یەزدان لە دایك نابێ؟! بەلام رەنگە پرسیارەکە لەم ئاستەدا نەبوبێ. ماکسیم شوهل *Schuhl* ئەم پرسیارەی کرد: چیی (بڵێین) دەربارەی میکانیزم و بیرکردنەوە؟ ئایا دەکرێ ئەگەرێك لەسەر ئاستێکی رەها لە ئارادا بێت دەربارەی ولاتێك گەشتی بۆ بکەین و، دەربارەی بیرکردنەوە لە شتێکی تر جگە لە جۆرەکانی نوشوست لە میکانیزمدا؟

## پەراوێز:

(*)ئەم چاوپێکەوتنە بە بۆنەی دەرچوونی فایلێکی گۆڤاری ماگازین لیتریر *Magazine Littoraire, no. 383* لە یادی تێپەڕبوونی سەدەیەك بەسەر مەرگی نیچەدا سازدراوە. ئەلیکسیس فلیلینکۆ فەیلەسوف و توێژەرێکی تایبەتە لە فەلسەفەی ئەڵمانیدا. چەندین نوسینی گرنگی هەیە دەربارەی جەمسەرەکانی ئەو فەلسەفەیە وەك کانت، هیگل، شۆپنهاوەر، نیچە، هابرماس.

(**) *Tueurs, Eigures du meurtre, Alexis philonenho, Ed..*

## سەرچاوە:

الکسیس فیلۆنینکو، "نیتشە هو فیلسوف الحیاة".
مقابلة أجراها: نیریە ریموند. ت: د. بدر الدین عرودکي.
الفکر العربي المعاصر. ص 55-58.

# بەرامبەر نیچەو لەگەڵ نیچەدا

## (گفتوگۆی ڕامین جەهانبەگلو لەگەڵ پۆل ڤالادێدا)

● و. لە فارسییەوە: ئەبوبەکر عەلی سەعید

پـۆلْ ڤـــالادێ یەکێکــە لــە بــەناوبانگترین فەیلەسـوفە یەسـوعیەکانی ئـەمڕۆی فەرەنسـا. لەکانونی دووەمی سـاڵی **1933** لـە شاری سێنت ئـایتێ "***St Etiennest***"ی فەرەنسـا هاتۆتـە دونیـاوە. خوێنـدی فەلسـەفەی لـە زانکۆی لیـۆن "***Lyon***" تـەواو کـردو لـە تەمـەنی **21** سـاڵیدا پـــەیوەندی کـــرد بـــە گروپـــی مەســـیحیە یەسوعیەکانەوە. لە پاش بەسەربردنی سێ ساڵ خوێندنی فەلسەفەو دووساڵ خوێندنی شـەرعیات، نامـەی دکتـۆرای لەسـەر نیچـەو مەسـیحیەت نووسی.

لە ساڵی **1957**دا بۆ ماوەی **28** مانگ خزمەتی سەربازی کردو لە جەنگی جەزائیردا بەناونیشانی وەك "گوێزەرەوەی نـەخۆش" (برانکاردیسـت*) بەشداری کرد. لە دوای ساڵی **1961** لـە شـاری لیۆن دەستی بە وتنەوەی وانـەی فەلسـەفە کردو هاوکـات لـە قوتابخانـە یەسوعیەکانیشـدا وانـەی ئیلاهیاتی دەگوتەوە. لـە ساڵی **1979–1989** لـە قوتابخانەی زانستە سیاسیەکان لە پاریس "***I. E. P***" وانـەی گوتـــەوە، لــە ســاڵی **1981** بـوو بـە سەرنوسەری گۆڤاری ئیتۆد بەڵام لە ساڵی **1989** وازی لەکاری سەرنوسەری ئـەم گۆڤـارە هێنـا. لـە ساڵی **1991** تاکو ئەمڕۆ مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی کاسۆلیکی لە شاری لیۆن.

شـــایانی باســـە بونیادنـــەری قوتابخانـــەی یەسوعیەکان "ژزوئیتەکان" لە ئەوروپادا "سێنت ئینیاس دی لویۆلا"یە "***Ignace de Loyola***". لیۆلا لـە سـاڵی **1941**ی زایینییدا لـە بنەماڵەیـەکی ئەرستۆکراتی لە ئیسپانیا لە دایـك بـوە، لـە پـاش سەردانی "بەیتول موقەدەس" لە سـاڵی **1523**دا، ژیانی خۆی بۆ عیرفـانی مەسـیحی تـەرخان کـرد. لیۆلا لــە ســاڵی **1528** چـوە پــاریس و لەگــەڵ

* برانکاردیست: ئـەو پیشـەیەیە کـە نـەخۆش و برینـدار لەسـەر تەختەیـەك کـە بـە فەرەنسـی (برانکـارد)ی پـێ دەڵێن، دەگوێزرێتەوە.

گروپێك لە قوتابی و لایەنگرانیدا ئەنجومەنی مەسیح (*Compagnie de Jesus*)یان دامەزراند. دواتر گەڕایەوە بۆ ئیسپانیاو تا کۆتایی تەمەنی کاتی خۆی بە نووسین و وانە وتنەوەی قوتابخانەکەی خۆی بەسەر برد.

بەناوبانگترین بەرهەمەکانی لیۆلا، دوو نامەیە بە ناونیشانی: ڕاهێنانی مەعنەوی (*Spirituels Exereices*) و یاسا بنەڕەتییەکان (*Constitutions*). لە ساڵی *1556*ی زاییندا، لیۆلا کۆچی دوایی کردو لە ساڵی *1642*دا لە ڤاتیکان نازناوی "قدیس"ی پێبەخشرا.

سەرەتای دەستپێکردنی کاری یەسوعیەکان لە فەرەنسادا لە ساڵی *1814* و هاوکاتە لەگەڵ گەڕانەوەی سەد ڕۆژەی "ناپلیۆن بۆناپارت" لە دورگەی ئەلب بۆ پاریس. تا ئەم کاتە یەسوعیەکان لە فەرەنسادا مافی هیچ جۆرە چالاکیەکیان نەبوو. چونکە لە ساڵی *1773*دا پاپای کیلمان (*Clement X I V*) هەموو جۆرە بەشدارییەکی یەسوعیەکانیان لە کاروباری کۆمەڵایەتیدا قەدەغە کردبوو. یەسوعیە فەرەنسیەکان لە ساڵی *1860—1930*دا چەندین قوتابخانەی دواناوەندیو کۆلیج و پەیمانگای هونەری و پیشەییان پێکهێنا، کە لە ساڵانی دەورووبەری جەنگی جیهانی دووەمدا، جێگای پێگەیاندنی سەدان ڕۆشنبیرو هونەرمەند بوو. لە پاریس لە ساڵی *1974* سەنتەری سیڤەر (*Sentre Severes*)— قوتابخانەی باڵای فەلسەفەو ئیلاهیاتی یەسوعیەکان دامەزرا، کە ئەمڕۆ چەندین کەس لە بەتواناترین ڕاڤەکارە جیهانیەکانی نیچەو هیگڵ و هایدگەر، لەوێدا وانە [illegible]تەوە. ئاشنایی من لەگەڵ پۆڵ ڤالادێ بۆ یەکەمجار لەم سەنتەرەدا بو، دواتریش لە گۆڤاری ئیتۆد (*Etude*) بەردەوامی پێدرا.

لە بەرهەمە گرنگەکانی پۆڵ ڤالادێ، دو کتێبە بەناوی "ستایشی ویژدانی" و "ئەخلاقی ناچاری". ئەم چاوپێکەوتنەی دەیخوێنیتەوە لە هاوینی *1995*دا لە پاریس ساز کراوە.

**ڕامین جەهانبەگلو**

***ئێوە (ژزوئیت) ن و لەسەنتەری سیڤەر مامۆستان و لە قوتابخانەی زانستە سیاسیەکان وانەبێژن (معید)، چۆن چۆنی هاتنە نێو کایەی فەلسەفەو ئیلاهیاتەوە!**

—تێکەڵ بوونی من بەم مەسەلانە بۆ زەمانێکی پێشترو کاتی لاویم دەگەڕێتەوە. ئەمەش دەرەنجامی واقعێك بوو کە لە بارەی ئیمانەوە بۆم ئاشکرا و سەلمێنراو بوو. بەو مانایەی کە هەمیشە دەرهەق بەو واقیعە هەستیار بووم کە ئیمانی مەزهەبی ناتوانێت بەبێ دەرککردن بە شتەکان و بەبێ تێگەیشتن لەوەی کە ڕایدەگەیەنێت، پێش بکەوێت. لێرەوە وەختێك لاو بووم، چوومە ناو گروپی لاوانی کاسۆلیکیەوە (کە زیاتر ئالوودەی مەسەلە سیاسیەکان بوو تاکو کاری کۆمەڵایەتیو سەندیکایی).

ئەم مەسەلەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی *1955—1960*، واتە وەختێك باسی جەنگی جەزائیرو مەسەلەی هیندو چین دەنگوباسی گەرم بوو. کۆماری پێنجەمی فەرەنسا هێشتا پێك نەهاتبوو، کۆمۆنیستەکان لە بزاوتی کۆمەڵایەتیدا ئامادەییەکی بەرفرلوانیان هەبوو. لەبەرئەوە بۆم دەرکەوت کە ڕوویەڕووبوونەوەو سەرقاڵبوون لە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکانەوە کارێکی یەکجار دروستە. بەڵام ئەگەر کەسێك سەرمایەی فیکری پێویستی نەبێت ئەو شتەی هەڵدەسەنگێنێت، مەترسی ئەوەی هەیە کە خێرا بکەوێتە داوی پراکتیك خوازی زێدەڕەوانەوە (*actiruisme*). یاخود هەر لە بنەڕەتدا لە ڕەهەندە ڕاستەقینەکانی مەسەلەکە تێنەگات. کەوابوو من هەمیشە گرنگیم دا بە پێویستی هاتنە ناوەوەی

مەسەلە سیاسیەکان بۆ ناو بواری فیکری. بەلام هەمیشە بیرم لەوە کردۆتەوە کە وەختێك کەسێك لە ئاستی ئیماندا رادەوەستێت، بەتەنها بوونی ئیمان ناتوانێت لەکاری عەقڵ و هێزی ئیدراك دوری بخاتەوە، ئیدی بەم شێوەیە بوو خۆم دایە فەلسەفەو ئیلاهیات.

***لەم رێگەیەدا چ کەسانێك لە هەموو کەس زیاتر کاریگەرییان لەسەرت هەبوو؟**

—لەکاتی قوتابیێتیمدا لە زانکۆی لیۆن چەند مامۆستایەکم هەبوو کە لایەنگری تیۆری کەسێتی گەرایی (*Personalisme*) بوون. وەك "ژان لاکروا" بەلام پێم وایە وەختێك بوومە "ژزوئیت" یەسوعی، کەسانێك زۆرترین کاریگەرییان لەسەرم دانا، کە لە بارەی هیگڵەوە کاریان دەکرد. وەك "ئیدیك ڤایل و قەشە فسار" ئەم دوو کەسە، بۆمن دوو سەرچاوەی سەرەکین لە فەلسەفەدا. لە روویەکی ترەوە، کت و مت لە زەمانی "شورای دووەمی ڤاتیکان"دا؛ ئیلاهیات لەلام فۆرمۆلە بوو. واتە لە سالانی نێوان *1961*–*1965* کە رۆژگاری جۆش و بزاوتێکی فیکری بێ ئەندازە سەرسوهێنەر بوو. واتە رۆژگارێك بوو کە لە رووی فیکریەوە ئۆکسجینی زیاتر هەبوو بۆ هەناسەدان. بەهۆی دووبارە خوێندنەوەی کتێبە پیرۆزەکان، نەریتی مەسیحی نەریتی "تۆماس ئەکیوناس"، کاری فیکری زۆر دەربارەی مێژووی کەنیسە دەکرا کە شتێکی مێژوویی بوو، لە رادەبەدەر سەرسورهێنەر. کەوابوو دەتوانم بڵێم کە لە بواری ئیلاهیاتدا سالانێکی یەکجار جەنجاڵ و سەختم بەسەر برد. چونکە لەو رۆژانەدا سەرلەنوێ چەندین پرسیاری زۆرم لەلا گەلاڵە بوو.

***بەلام لە هەمان کاتدا تۆ چاودێری گۆرانکاریە سیاسیەکانی کۆمەڵگەی فەرەنسیشت دەکرد، وانیە؟**

—بەرەوردەبوونی تایبەتی من لە گروپی لاوانی کاسۆلیکدا بەردەوام بەرەو لای مەسەلە سیاسیەکان پەلکێشی کردووم. هەروەك گوتم من پەیوەست بووم بە ئەوەیەکەوە کە بەشێوەیەکی توندوتیژ رووبەرووی جەنگی جەزائیرو ئەو مەسەلانە بوویەوە کە لەسەردەمی گۆرانی کۆماری چوارەم بۆ پێنجەمدا لە ئارادا بوو. کەوابوو نەدەکرا دەرهەق بەوەی لە کۆمەڵگەی سیاسیدا رووی دەدا، بێباك بیت لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەزانیت کە مەسەلەی جەزائیر بۆ ئەو نەوەیەی من برینێکی قووڵ بوو.

***تۆ لە راپەرینی سەربەخۆیی خوازی جەزائیرەوە نزیك بوویت؟**

—لە راستیدا من لە تەمەنی *25* ساڵیدا سەرقاڵی بەسەربردنی خزمەتی سەربازی بووم. هەرگیز بروام بە "جەزائیری فەرەنسی" نەبوو. بەلام پەیداکردنی رێگەچارەیەك بۆ مەسەلەکە، شتێکی دژوار بوو. هیوای ئێمە ئەوە بوو کە بتوانرێت پەیوەندی کۆلۆنیالی بەرکەنار بکرێت و لەگەڵ جەزائیر، مەغریب و تونس دا پەیوەندییەکی بەرامبەری و (یەك بەیەك) بەرقەرار بکرێت؛ بەلام بەداخەوە بەو شێوەیە نەبوو، کەڵەڵەرەقی بەرپرسانی سیاسی لە پاراستنی پەیوەندی کۆلۆنیالیدا، بۆ ئێمە یەکجار گران، تەواو بوو.

***لەدوای ئەو وەختە بوو کە مەلەسەی بەرپرسیارێتی لەلای تۆ خرایە روو؟**

—بەڵێ، دەمەوێ بڵێم بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مەسەلە سیاسی و ئاینیەکاندا، یەکجار گرنگە کە تاکەکەس لەرووی فکریەوە بەرپرسیار بێت بەرامبەر بەو شتەی دەیکات. واتە بەرپرسیارییەتی ئەوەی کە ئەنجامی دەدەین و بەڵگەی بە ئەنجام گەیاندنەکەشی، بە بیرو بروای من شتێکی یەکجار بنەرەتیە. چونکە لە کۆمەڵگایەکی وەك کۆمەڵگای ئێمەدا، ئەگەر کەسێك بنەمای فیکریی جیددی نەبێت، پێم وا نییە بتوانێت دەست بۆ فەرمانێکی درێژتەمەن و

کارێکی بەرفراوان ببات. لەم حاڵەتەدا ئەوەی بەسەر کارەکاندا زاڵ دەبێت، هەست و سۆزو کاری پەرش و بڵاو پراکتیکی زیندەڕەوانەو دڵساردیە، دواتر دەمەوێت بڵێم کە لەو ساڵانەی لاوێتیمدا مارکسیزم لەهەموو شوێنێکدا ئامادەیی هەبوو. ژمارەیەکی ئەوەندە زۆر لە دۆستان و هاوکارانم گرفتاری مارکسیزم بووبوون، کە بۆ بەرگرتن لە لادانە تۆتالیتاریەکان بەخۆمم دەگوت: تەنها ڕێگەچارە بریتیە لەکاری ریشەیی، ئیدی بەم شێوەیە بوو کە لە بارەی هێگڵەوە دەستم بەکار کرد. چونکە دەمبینی هیگڵ یەکێکە لە سەرچاوەکانی مارکسیزم و زۆریەی مارکسیەکان هیچ شتێك لە هیگڵ و نەریتی فەلسەفی نازانن، ئەوان سەرنجیان لە گوتارێك دەدا کە ڕاستەوخۆ سیاسی و ئایدیۆلۆژی بێت. واتە گوتاری پارتی کۆمۆنیست، بەلام خاوەن بناغەیەکی فەلسەفی نەبوون کە توانای ئەوەیان پێ ببەخشێ کە لە مەزنی مارکسیزم و تراژیدیەکانی مارکسیزم، تێبگەن. کەوابوو هەموو ئەمانە هۆکار بوون بۆ ئەوەی روو بکەمە کاری فیکری و فەلسەفەو ئیلاهیات.

***کەوابوو لای فەیلەسوفان بەدوای بنەما فیکریەکاندا دەگەرایت و تۆ ئەو بونیادە فیکریەت لەلای فەیلەسوفان -بەتایبەت فەیلەسوفانی ئەڵمانی وەك هیگل و نیچە وەرگرتووە- نەك لای ئیلاهیات ناسەکان؟**

—بروانە ئەگەر دەمانەوێت ئەو کۆمەڵگایە بناسین کە تیایدا دەژین، بێگومان فەیلەسوفان زیاتر سەرنجمان رادەکێشن بەلای خۆیاندا، بەلام ئەگەر بەدوای هۆیەکانی ئەو شتانەوەیەن کە باوەڕمان پێیانە -بۆ نمونە بنچینەکانی فیکری مەسیحی بەنیسبەت منەوە- پێویستە بگەڕێینەوە بۆ زانایانی ئیلاهیات ناسی. ئەوەی لەلای فەیلەسوفانی وەك "قەشە فسار" دەمبینی ئەوەبوو کە ئەو بە زیرەکی خۆی هەردوکیانی پێکەوە گرێدەکردەوە. واتە ئیلاهیاتێکی دروست دەکرد کە بە گوتەزاو چەمکە هیگلی و کیرکەگاردییەکان تۆکمە کرابوو. لە هەمان کاتیشدا واقعیەتی لە دیدگای مەسیحیەتەوە تێبینی دەکرد. توانایی ئەنجامی هەردوو کارەکە سەرنجی منی بەلای خۆیدا راکێشا. من پێم وایە فەلسەفە یاریدەمان دەدات لە ریشە فیکریەکانمان تێبگەین و ئیلاهیاتیش توانایی ئەوەمان دەداتێ کە گرنگی بە باوەڕە مەزهەبیەکانمان بدەین. کەوابوو من ئەو دوو بوارە لە یەکدی جیاناکەمەوە، هەرچەندە پێشم وا نیە ئەم دوو کایەیە تێکەل بە یەکدی بکرێن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا فەیلەسوفێکی هەنوکەیی چاری نیەو دەبێت لەگەڵ هەردوو بوارەکەدا مامەڵە بکات.

***ئایا بە تێروانینێکی هەڵقوڵاو لە ئیلاهیاتەوە بوو کە نامەی کۆتایی (دوکتۆرا) تان دەربارەی نیچە نووسی؟ لە بنەڕەتدا هۆکاری سەرنجدانی ئێوە لە نیچە چیە؟**

—لە بارەی نیچەوە هۆکارەکە ئەوە بوو کە وەختێك خوێندنی (ژزوئیتی)م تەواو کرد پێویست بوو نامەیەك ئامادە بکەم، بابەتێك کە جێگەی سەرنج و گرنگی پێدانی من بوو، ئەخلاق و ئیلاهیاتی ئەخلاقی بوو. لەو رۆژگارەدا (واتە ساڵانی حەفتاکان) کتێبەکانی نیچە لە فەرەنسادا خوێنەریان یەکجار زۆر بوو. هەروەها لەو رۆژانەدا کارەکانی "دۆلۆز، جۆن میشیل رێ، گرانێ" و چەندانی دیکەش لە ئارادا بوون. من لە خۆمم پرسی: ئایا نیچە نوسەرێکی سەرنج راکێشەر نیە. چونکە (ژزوئیتی)یەکان بەو شێوەیە بەدوای نیچەدا وێڵ نەبوون، ئەوان بە زۆری بەرهەمەکانی "کانت، هیگڵ و هایدگەر"یان دەخوێندەوە، بۆیە بەخۆمم گوت: نیچە نوسەرێکە کە پێویستە بناسرێت. ئەو فەیلەسوفێکە رەخنەی زۆری لە مەسیحیەت گرتووە. کەوابوو کەسێکە دەبێ هەم

له ئاستی فەلسەفەو هەم له ئاستی ئیلاهیات لێی نزیك بیتەوە. لەبەر ئەوە نیچە زۆر سەرنج راکێشەرە. چونکە فەرەنسییەکان لەبارەی ئەوەوە کارێکی بەرچاویان نەکردووە، لەلایەکی دیکەوە ئەو ولمان لێ دەکات لە روانگەیەکی فەلسەفیەوە مەسەلەکانی ئیلاهیات تاوتوێ بکەین. ئیدی هەموو ئەمانە منیان بەرەو لای نیچە پەلکێش کرد. بەلام وەختێك دەربارەی نیچە دەستم بەکارکرد، هیچ شتێکم لە بارەیەوە نەدەزانی چونکە لەو وانانەی کە خوێندبووم نیچە هیچ شوێنێکی نەبوو.

***بەلام ئایا نزیك بوونەوەت لە فکری نیچە، تێروانینی تۆی بۆ ئیلاهیاتی مەسیحی گۆڕی؟**

–مەگەر جگە لەوە دەگونجێت؟ تۆ نیچە دەناسیت، بە دوو شێوە دەتوانیت لە نیچە نزیك ببیتەوە: یان ئەوەی کە کەسێك لە دەرەوەی بیری ئەودا بمێنێتەوە و بەخۆی بڵێت کە فەلسەفەی ئەو کۆمەڵێکە لە ناکۆکی (تناقضات)، لەم حاڵەتەشدا ئەوەی لێی دوور دەکەوێتەوە و چیدی تێیناگات و هەروەك مەلەسەکانی لە پشتی پەنجەرەوە بکات. یان ئەوەیە کە هەوڵبدات بۆ ناوەوەی ئەو فەلسەفەیە بڕوانێت و ئەو زنجیرە ناسکەی کە هەموو ئەندێشەکانی ئەو پێکەوە دەبەستێت، بدۆزێتەوە، لەم حاڵەتەدا ناکرێ بەرانبەر بە فکری نیچە بێ هودە بین و ناکرێ بە ئیدێکی سادەوە بۆ فەلسەفەی تەکنیکی پسپۆڕیانە بەرەو رووی نیچە بینەوەو دڵخۆش بین و نیچە بە فەلسەفەیەکی تەکنیکی و پسپۆڕی تۆکمە تێبگەین؟ بە پێچەوانەوە لەم فەلسەفەیەدا لەگەڵ پیاوێك رووبەڕوو دەبینەوە کە بەشێك لە مەسەلە بنەڕەتیەکان و تەنانەت خودی خۆیشت دەخاتە ژێر پرسیارەوە. نیچە خۆی دەیەوێ هەر ئەم جۆرە پەیوەندیە لەگەل خوێنەرەکانیدا دروست بکات. ئیدی یان خوێنەر بەرگری دەکات و هیچ شتێك نابیستێت، یان وردە وردە پێ دەنێتە ئەم روانگەیەوەو وا هەست دەکات "تواوەتەوە".

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، بەگومانی من ئاشنایی لەگەڵ نیچەدا نابێتە هۆی نیتچەیی بوون. ئەمە دەرەنجامێکی بێ ماناو بێ سەروبەرە. من تێدەگەم چۆن چۆنی دەشێ مارکسیست یان پێڕەوی هیگڵ بین، بەلام تێناگەم چۆن دەتوانرێت پێڕەوی لە نیچە بکرێت. قسەکردن بە گوتاری تایبەتی ئەو دەربارەی ئیرادەی هێز، یان گەڕانەوەی هەمیشەیی، چ مانایەکی هەیە؟ بێمانایە. گرنگ ئەوەیە نیچە ناچارتان دەکات رێڕەوی خۆتان بگۆڕن. ئەو لە کتێبی (زانینی شاد)دا ئەم رستە لاتینیە بەکاردەهێنێ: "Va de tecum Va de mecum" کە من بەم شێوەیە وەری دەگێڕم "ئەگەر دەتەوێت لە گەڵمدا بێیت، لەگەڵ خۆتدا دەست بە ئاخاوتن بکە" کەوابوو مەبەست چاولێکەری کەسێك یان فیکری ئەو نیە. بەلکو مەبەست ئەنجامدانی کارێکە بۆ گۆڕانکاری کردنی خود. نیچە ئێمە هاندەدا تاکو حەقیقەتی زیاتر دەربارەی خۆمان کەشف بکەین.

***ئەم بۆچوونە ئەو رستە بەناوبانگەی "یاسبرس"م بە بیر دێنێتەوە کە دەڵێ: "خەریك بوون لە فەلسەفەوە لەگەڵ نیچەدا، بە مانای دەرخستنی بوونێکی بەردەوام لە بەرانبەر نیچەدا".**

–ئەگەر من بوومایە کت و مت دەمگوت: "لە بەرانبەر نیچەو لەگەڵ نیچەدا". چونکە پەیوەندی لەگەڵ نیچەدا دوو رووی هەیە؛ دۆستی و دوژمنی. پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئەودا لەسەر بناغەی دۆستێتیە، چونکە نیچە نوسەرێکە ئامادەبوونی پێویستە، هەروەك دۆستێك کە پێویستمان بە بیستنی قسەکانی هەیە. لە هەمان کاتیشدا کەسێکە ناتوانرێت پێڕەوی لێ بکرێت و تۆ وا لێدەکات لە بەرامبەریدا هەڵوێست بگریت. من وا هەست دەکەم کە پێویستە بەرهەمەکانی نیچە

دووبارەو چەندبارە بخوێنمەوە، لە هەمان کاتیشدا لەوەی کە ئەو دەیڵێت، دووردەکەومەوە. ئەمەش جۆرە پەیوەندیەکی سەرسوڕهێنەرە بەڵام پەیوەندییەکی زیندووە. ناتوانرێت خود ببێ بە یەکێك وەك ئەوی لێ بێت ئەم کارە مانای نیە. بەڵام ناشتوانرێت پشتگوێ بخرێت و بگوترێت گرنگی نیەو شتێکمان پێ نادات.

**•کەواتوو پێت وایە پاش ئەو هەموو لێکۆڵینەوەو بەدحاڵیبوونەی کە لە بارەی نیتچەوە لە ئارادایە، کەچی هێشتا هەروا بیریارێکی هەنوکەییە؟**

–دەزانیت، هیچ کاتێك ناتوانیت دڵنیابیت کە نیچەت بەچاکی خوێندۆتەوە، من بانگەشەی ئەوە ناکەم کە بە چاکی نیچەم خوێندۆتەوە. پێم وایە هەرکەس لەسەر بنەمای خۆی لە نیچە تێدەگات، نیچەگەریی بوونی نیە، تەنها دەتوانین بڵێین: تێگەیشتنی هەرکەس لە نیچە، لەخۆیەوە دەست پێدەکات، من لە گۆشەنیگای کەسێکی بڕوادارەوە نیچەم دەخوێندەوە کەولبوو من لەسەر چەندین لایەن هەستیار بووم کە کەسێکی وەك جیل دۆلۆز (سەرەڕای چۆنیەتی راڤەکردنەکانیشی) دەرهەق بەو لایەنانە هەستیار (حساس) نەبوو چونکە دۆلۆز کەسێکی بڕوادار نییەو گرنگی بە پەیوەندی نیچەو مەسیحیەت نادات. دۆلۆز ئەم مەسەلەیە لەلای نیچە بەهەند ناگرێت، بۆیە هەرکەس بە شێوازی خۆی نیچە دەخوێنێتەوە. بۆ نمونە هونەرمەندێك بەو شێوەیەی کە من دەیخوێنمەوە نیچە ناخوێنێتەوە. بە گومانی من هەر لەبەر ئەمەشە کە نیچە رێنماکەری کەسەکانە لە راستیدا هەرکەس بە خوێندنی نیچە خۆی دەخوێنێتەوە، چونکە ناکرێ لە پێشکەش کردنی تەفسیرێکی کامڵ دڵنیابین. وەختێك رووبەڕووی خوێندنی نیچە دەبینەوە، پێویستە بزانین تا چ ئەندازەیەك سوود لە خۆمان وەردەگرین.

**•لەم دواییانەدا لە فەرەنسادا رەخنەگرێکی زۆر جیدی دەربارەی فەلسەفەی نیچە هاتۆتە ئاراوە، گوتویانە بیرێکی دژە هیومانیستی خوڵقاندووە. فەیلەسوفانی وەکو "فۆکۆو دۆلۆز" بەرهەمەکانی نیچەیان خوێندوەتەوە و شیان کردۆتەوە. بەتایبەتی مەبەستم کتێبێکە بەناوی "بۆچی ئێمە پێرەو نیچە نین؟" پێم وایە بۆ رەخنەگرتن لە هاوچەرخەکان تارادەیەك سوود لە نیچە وەردەگرن؟**

–بەڵام ئەمە بگرەو بەردەیەکە کە هیچ جۆرە قازانجێکی تێدا نیە. ئەمانە فەیلەسوفانێکی گەنجن کە سنگ لە مامۆستاکانیان دەردەپەڕێنن تاکو بۆرپیان بدەن. ئەو مامۆستایانەیان کە پێشتر ستایشیان دەکردن، رەتکردنەوەی مامۆستاکانیان پەیوەستە بە خۆیانەوە، بەڵام لەم نێوانەدا نیچە چ کارەیە؟

**•ئێستا با ئاوڕێك لە بەرهەمەکانی تۆ بدەینەوە، لە ساڵی *1980*دا تۆ چەندین وتارو کتێبی سیاسی و ئاینیت دەربارەی ئەخلاق و پلورالیزم بە چاپ گەیاند. ئایا بە بڕوای تۆ لە جیهانی ئێمەدا بەهای ئەخلاق روو لە پێشەوەو بەهای سیاسەتیش رووی لە ئاوابوونە؟**

–نازانم تا چەند دەکرێ پەیوەندی نێوان (ئەخلاق روو لە پێش و سیاسەت روو لە ئاوابوون) پەسەند بێت یان نا، لەبەرئەوەی بە گومانی من، بەلای کەمەوە ئەخلاق لە دیدگای مەسەلە گەلێکەوە کە کۆمەلگە دەیخاتە روو، بێگومان روو لە پێشە. چونکە لەبەر ئەوەی پرسیارە ئەخلاقیەکان بە داهاتووی ئێمەوە پەیوەستن، ئیدی سەرنجمان بەلای خۆیاندا رادەکێشن. بەڵام ئایا ئەم پرسیارانە لەبەرئەوە دەخرێنە روو کە سیاسەت روو لە ئاوابوونە؟ من دڵنیانیم، چونکە مەسەلەگەلێك کە لەسەر ئاستی ئەخلاق دەخرێتەروو یەکجار فراوان ترن لەو مەسەلانەی کە لە سیاسەتەوە سەرچاوە دەگرن. بۆ نمونە پرسیار گەلێك کە زانستی ژێنێتیك

دەیهێنێتە کایەوە، راستەوخۆ سیاسی نیە، بەڵکو مەسەلەیەکی پەیوەندیدارە بە کۆمەڵگاوە، یان ئەگەر مەسەلەی ژینگەپارێزی تێبینی بکەین، ئایا هەروا درێژە دەدەین بە زیان گەیاندن بە ژینگە؟ مەسەلەگەلی توندوتیژی (عنف) زیاتر پەیوەستە بە سیاسەتەوە، لە هەمان کاتدا ئەم مەسەلەیە زیاتر پەیوەستە بە ئاڵۆسکاوی و پەرێشانی دانیشتوانەوە، تاکو بە بێ توانایی سیاسەتەوە. بە بڕوای من مەسەلەگەلی وەك ژینیتیك یان تەهدیدی ژینگە بەهۆی پیشەسازیەوە یان مەسەلەکانی ئینفۆرماتیك، مەسەلەگەلێکی تەکنیکی تازەن کە هۆکاری خستنەڕووی مەسەلەگەلێکی ئەخلاقین، کە ناتوانین دەرهەق بەو مەسەلانە چاوپۆشی بکەین، خۆ ئەمەش بەهۆی ئەوە نیە کە سیاسەت روو لە ئاوابوونە، ئەم بۆچونە تا ئەندازەیەك دروستە.

**•لە کتێبی "ئەخلاقی ناچاری"دا، جیاوازی لە نێوان دوو چەمکی ئەخلاقدا دەکەیت (لە فەرەنسا *moral, ethigue*)، ئێوە لە کتێبەکەتاندا پەیوەندی نێوان ئەخلاق و زانست و زانیاریەکان دەدەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بەڵام تێبینی من لە رستەکانی سەرەتای کتێبەکەو ئەو وێنەیەی کە بەرگەکەیەوەیە کە لاوێکی چینی لەبەرامبەر تانکەکاندا دەبینرێ، ئەوەیە ئەوە نیشان دەدات کە تۆ بایەخێکی زۆرتر بە پەیوەندی نێوان ئەخلاق و سیاسەت دەدەیت، وا دەزانم بە بۆچوونی تۆ ئەخلاق پەیوەندییەکی راستەقینەتری لەگەڵ سیاسەتدا هەیە، هەتا لەگەڵ بوارەکانی دیکەدا!!**

–بەڵێ وایە، نکوڵی ناکەم لەوەی کە ئێستا بە قەیرانێکدا تێدەپەڕین تێیدا مەشروعیەتی سیاسەت لەژێر پرسیاردایە. دواتر وێنەی سەر بەرگی کتێبەکەی من بەتەواوی سیاسی نیە، بەگومانی من ئەو لاوە "چینی"یە نیشاندەری یاخی بوونی ویژدانی ئەخلاقیە لەبەرامبەر توندوتیژی تانکەکاندا. بێگومان ئەمە تەنها کەف و کوڵێکە نەك هیچی دی، ئەخلاق لە بەرامبەر توندوتیژی جیهاندا هیچ شتێك نیە. بۆ نمونە "ئانتیگۆن" لە بەرامبەر "کرێن"دا تێبینی بکە، ناڕەزایی ئەنتیگۆن لە بەرامبەر توندوتیژیدا هیچە، ئەمەش ئەو شتەیە کە دەمەوێ لە کتێبەکەمدا نیشانی بدەم، واتە ئەو بیرۆکەیەی ئەخلاق لە بەرامبەر توندوتیژیدا ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات، بەڵام لە یاخی بووندا ویژدانێك پشت ئەستوورە کە بە واقعیەتی جیهانی ئێمە دەڵێ "نە". بەڵام کاتێك دەڕوانینە ئەو واقیعە لە "بۆسنەو رواندا" و چەندین جێگای دی، دەبینین یەکجار بەهێزترە، ئەم هەلومەرجەم دەبێتە هۆی هێنانە ئارای مەسەلەی سیاسەت. مەسەلەیەك کە لە هەناوی ئەم پەیوەندیەدا هەیە کە لە نێوان ئەخلاقی لاوازو ئەوەشی کەوا پێدەچێ توندوتیژی ناچاری بەری لێ ناگیرێت، هەیە؟!

**•تۆ دەربارەی "ئانتیگۆن" قسەت کرد. وتەکانی تۆ ئەو کوتەیەی "جۆرج ستاینر" دێنێتەوە یادم کە دەڵێت: ئەفسانەی ئانتیگۆن لەنێوان رۆژگارەکاندا تاکو رۆژگاری ئێمە درێژەی هەیە.**

–بەڵێ، بەڵام وەختێك دەڵێم ناڕەزایی دەربڕینی ئانتیگون هیچە، مەبەستم ئەوەیە کە بێ کاریگەریە. ئەو وتە بەناوبانگەی ستالینت لە بیرە کە لە بەرامبەر پاپادا گوتویەتی، دەڵێ: "چەند لەشکرو تانکت هەیە؟" ئەمە مانای وایە کە لە بەرامبەر هێزی سەربازیدا ناڕەزایی ئەخلاقی هیچە، بەڵام بەهەر شێوەیەك بێت جۆرێکە لە رویەڕوبونەوە. "ئانتیگون" بە ویژدانی ئەخلاقی خۆیەوە لە بەرامبەر "کرێن"دا ناڕەزایی دەردەبڕێت، بەڵام سەرکەوتن بۆ ئەو نیە.

**•بەڵام بە بڕوای من ستالین شکستی هێنا، ئەوە "گاندی"یە کە سەربەخۆیی هیند دەستەبەر دەکات.**

–ئەڵبەتە من پێم وایە لاوە چینیەکە براوەیە، هەرچەندە کە ئەو مردووە. کەوابوو ئەخلاق لە هەمان کاتدا هەم زۆر لاوازەو هەم هێزی ڕۆحیشە.

***بابەتی سەرەکی کتێبەکەی تۆ دەربارەی ئەندێشەی (گەڕانەوە بۆ ئەخلاق)ە کەسانێکی زۆر لەمڕۆدا قسە لەسەر جۆرێك لە (گەڕانەوە بۆ ئەخلاق) دەکەن. بەڵام بە بڕوای تۆ لە ڕاستیدا گەڕانەوەیەك بۆ ئەخلاق لە ئارادا نیە چونکە هیچ کاتێك ئەخلاق ئێمەی جێ نەهێشتووە. واتە ئەخلاق هەمیشە بەشێوەی جۆراوجۆر ئامادەیی هەبووە. بەڵام بە بڕوای تۆ، داواکردن و، ئامادەیی ئەخلاق لەمڕۆدا بە چ شێوەیەکە؟**

–بە گومانی من یەکەمین شێوەی ئەخلاق نێگەتیڤە، ئەویش ڕەتکردنەوەی توندوتیژیە. ئەخلاق لەسەرەتادا بریتیە لەوەی بڵێین: "من هەموو شتێك پەسەند ناکەم" ئەمەش بەو مانایە کەوەك هانس یوناس بڵێین: "ئێمە دەسەڵاتێکی زۆرمان هەیە، بەڵام ئەرکی دەسەڵاتەکانی ئێمە چیە؟" چونکە ئێمە لەسەر ئاستی ژێنێتیك و زانیارییەکانی توانایەکی زۆرمان هەیە، بەڵام ئایا نابێت دەربارەی ئەو خەتەرناکیانەی کە بە هۆی ئەم تەکنیکەوە دێنە پێش، پرسیارێ بکەین؟ بە گومانی من ئەخلاق بەر لە هەموو شت پرسیار کردنێکە لەو خەتەرەی کە لەڕێڕەوی نائاگاییدا دەرهەق بەتواناکانمان، ئێمە دەخاتە مەترسیەوە. ئەخلاقێکی لەم چەشنە بەر لەوەی بەشێوەی بەها بڵاوبێتەوە، پێویستە بەشێوەی ناڕەزایی دەربڕینێك خۆی نیشان بدات. واتە پێویستە من دەربارەی سنووری دەسەڵاتی خۆم، پرسیار لەخۆم بکەم. پێم وایە لەم ڕووەوە "ئانتیگۆن" سەرچاوەیەکی بێ چەندوچونە. چونکە لە بەرامبەر توندوتیژیدا دەڵێت (نەخێر). بە بڕوای من ئەخلاق بەم (نەخێر)ە دەست پێدەکات. ئەگەر ئەم (نەخێرە) بوونی نەبێت، مرۆڤ ئامادەیە هەموو جۆرە سەرکوتکاری و هەموو جۆرە سازشێکی کۆمەڵایەتی پەسەند بکات، یاخود لە بەرامبەر دەسەڵاتە تەکنۆلۆژیەکاندا کوێر ببێت.

***ناوی "هانس یوناس"ت برد، ئێمە لەگەڵ ئەودا بە مەسەلەی بەرپرسیاری دەگەین، کە تەوەرەی سەرەکی مەسەلەی ئەخلاقە. تۆ لە نێوان دوو چەمکی ئەخلاق (*moral, ethique*)دا جیاوازی دەکەیت و پێت وایە گوزەرکردن لە یەکێکیانەوە بۆ ئەوی تریان تەنیا لە ڕێگەی چەمکی بەرپرسیارێتیەوە دەکرێت. بەڵام من لە نووسینێکی "هانس یوناس"دا ئەم ڕستەیەم بەرچاوکەوت کە دەڵێت، "بەرسیارێتی لەخودی خۆیدا نابێتە شتێکی ئەخلاقی مەگەر کاتێ لە شێوەی بەهایەکدا دەربکەوێت". ئایا تۆ لەگەڵ ئەم بۆچوونە دایت؟**

–بەرپرسیارێتی وەختێك پەیدا دەبێت کە پێگەیەك بۆ ئامانجێك و هەروا بۆ بەهایەك لەبەرچاو بگرین. واتە پێگەیەك لەبەرچاو بگرین بۆ ئەوەی داپەروەری تێبخەین. کەوابوو بەرپرسیارێتی بەهایەکە ڕێگەمان نیشان دەدات. بۆ نمونە لەو جێیەدا کە پەیوەندی بە مەسەلەی ژێنێتیك هەیە، جۆرێك تێڕوانین بۆ پەیوەندی ژن و پیاو هەیە کە وامان لێدەکات بڵێین دەستکاریە ژێنێتیکیەکان پێچەوانەی بەهاکانی هاوسەرێتی یا پەیوەندیە سێکسیەکانە.

***بە بڕوای من تەواوی مەسەلەکانی جیهانی ئێمە لەمانەوەی گۆی زەویەوە- برسیەتی لە ئەفریقاو دیکتاتۆریەتی سیاسی بیگرە هەتا تەشەنەکردنی ئایدز- هەموویان بانگمان دەکەن بۆ ئەوەی کە بەرپرسیارێتیەکانمان قەبول بکەین. بەڵام لە ڕوویەکی دیکەوە، گرنگی نەدان بە چارەنوسی کۆمەڵگا- کە بە شێوەی خۆپەرستی فەردگەرایانە لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا بەرچاو دەکەوێت- بەرپرسیارێتی شەخسی لاواز دەکات و**

**ئەو بەرپرسیارێتیە دەدرێتە دەستی دەزگاو دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان.**

–زۆر راستە بە گومانی من مرۆڤی مۆدێرنە زیاتر حەز دەکات وەك قوربانیەك تەماشای خۆی بکات تاکو وەك بەرپرسیارێك. ئامازەت بۆ مەسەلەی ئایدز کرد تەواو ئاشکرایە کە هیچ کەس نایەوێت ئەوە پەسەند بکات کە بەرسیارە لە ئایدز. کێ بەرپرسیارە لە ئایدز؟ وەختێك تۆ ئاوەها پرسیارێك دەخەیتەروو، وەڵام دەدەنەوە کە: "حکومەتەکان" یان "ئەمریکیەکان" یا خەڵکانی دانیشتوی "هایتی" و لەم جۆرە وەڵامانە، بێگومان حکومەت هۆکاری کرداری سێکسی نەبووە بەجۆرێك کە لە ئەنجامدا "ئایدز" تەشەنە بکات. بەڵام هیچ کەس نایەوێت ئەم جۆرە مەسەلانە بخاتەروو. ئێستا با دیاردەیەکی فەرەنسی لەبەرچاو بگرین، بیمەی کۆمەڵایەتی هەمیشە بودجە کەم دەکاتەوە، کێ لەمە بەرپرسیارە؟ هەمووشمان و هیچ کەسێکیشمان لەهەمان کاتدا. لەبەرئەوە بەگومانی من هەر ئەوەندە مەسەلە ئەخلاقیەکان توندتر بن، هەستی بەرپرسیارێتی ئێمە دووچاری قەیرانێکی سەخت دەبێت. بەشێوەیەك کە رەتکردنەوەی کار، بەناچاری -کە دەربارەی ئەوە قسەم بۆ کردیت– بۆ سەر بەرپرسیارێتیەك کە بەم شێوەیە لە ئەستۆی دەگرین، هیچ کاریگەرییەکی نابێت. واتە لەو حاڵەتەی کە بەرپرسیارێتیەکە دەخەینە ئەستۆی کەسانی دیکە. بێگومان ئەمەش یەکێکە لە رووە راستەقینەکانی تاکگەرایی، تا بەرپرسیارێتی تایبەتی خۆی دەخاتە ئەستۆی خەڵکانی دیکە.

***بەڵام "قەیرانی بەرپرسیارێتی" هەروا بەمانای "قەیرانی ویژدان"یش نیە؟**

–ئەڵبەت وایە.

**هێرەدا دەتوانین بچینە سەر کتێبی "ستایشی ویژدان". تۆ لەم کتێبەدا قسە لەسەر جۆرێك لە تێکدان یان جۆرێك لە ونکردنی پرۆسەی دروستکردنی ویژدانی دەکەیت، بەتایبەت مەسەلەی کۆمەڵ گەرایانی "*Communitarianism*" ئەمریکی -کە هەموو جۆرە گەڕانەوەیەك بۆ ویژدان بە شتێکی زۆر ئایدیالیستانە دەزانن.**

–بەڵێ. من هەم سەرسوڕماو هەم نیگەرانیشم لەوەی کە دەبینم کۆمەڵگاکەمان بانگمان دەکات بۆ ئازادی و بەرپرسیارێتی و لە کرداریشدا، بازنەی کارەکانیان لەسەر بنەمای بەرژەوەندخوازی و سازش کردنە. من لە نێو نەوەی نوێدا لە جۆرێك بەرژەوەند ویستی لە شێوەی بیرکردنەوەو ژیان و تێڕوانین دەربارەی پەیوەندی مرۆیی، زۆر دەترسم کە حاڵەتێکی یەکجار نیگەرانکەرە. ئەم نەوەیە ئەهلی وەرگرتنی بەرپرسیارێتیو ئەرك نیە. بە بیروبۆچوونی من ئەم مەسەلەیە زۆر جیدییە. ئەم حاڵەتە چەند هۆیەکی هەیە بێگومان جۆرێك لە لاوازی -رەنگە بەهۆی فراوانی مەسەلەکانەوە بێت– بوونی هەیە. مەسەلەکە بە رادەیەك فراوانە کە مرۆڤ بەخۆی دەڵێت: "لەم نێوەندەدا من لەچی بەرپسیارم؟" "لەنێوان بێکاری، رووخاوی یەکێتی سۆڤیەت، رووداوەکانی رواندا، بۆسنەو چەندانی دیکەی لەم شێوەیە، من بەرپرسیاری کامەیانم؟" ئایا بەراستی کێ بەرپسیارە؟ هەمو کەس و هیچ کەسێکیش.

***بەڵام بە بڕوای تۆ گەڕانەوە بۆ ویژدان چۆن چۆنی دەتوانێت ببێتە بنچینەی بونیادی سیاسی؟ بە دەربڕینێکی دیکە، تێڕوانینی تۆ بۆ پەیوەندی نێوان ویژدان و دیموکراسی چیە؟**

–بە گومانی من دیموکراسی بەبێ خەڵکانێکی دیموکرات بوونی نیە، ئەمە راستیەکی سەرەتاییە. دیموکرات کەسێکە لە ویژدانی خۆیدا

دەرهەق بە گەمەکان و داوەریە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان -لانی کەم لە ئاستێکی تایبەتدا- هوشیارە. من هەمیشە دەکەومە ژێر کاریگەری ئەوەوە کە دەبینم بیریارە مەزنەکانی سیاسەت و دیموکراسی، دەربارەی دیموکراسیەتی هاوڵاتیان قسە دەکەن. کەسانێکی وەك "رۆسۆ، کندۆرسەو تۆکڤیل" گوتویانە دیموکراسی بوونی نابێت؛ ئەگەر خەڵکانی دیموکراتی هوشیار بوونی نەبێت. واتە دیموکراتێك کە مەسەلەکانی کۆمەڵگا لە ئەستۆ بگرێت و بۆ کەسانی کاریزمای وەك سوڵتانەکانی یان سکرتێرە گشتیەکانی حزبەکانی بەجێ نەهێڵێت. بە بڕوای "رۆسۆ" تەنانەت نابێت شتێك بەناوی "نوێنەری خەڵك" بوونی هەبێت، چونکە کەنار دەگرم و مەسەلەکان دەسپێرم بە خەڵکانی دیکە" کەوابوو دیموکراسی پێویستی بە هاوڵاتیانی هۆشیارە. لە شوێنێکدا کە لە کارویاری کۆمەڵگادا فەساد دروست دەبێت، دیموکراسی ناتوانێت درێژە بەژیانی خۆی بدات.؟ بۆیە بە گومانی من، لە راستیدا لەنێوان ویژدانی ئەخلاقی و سیاسەتدا پەیوەندیەك هەیە، ئەگەر هاوڵاتیان دەست نەکەن بە رەخنەگرتن لە رابەرەکانیان و نەیان هێننە پای حساب، ئیدی دیموکراسی توانای بوونی نابێت، وەختێك دیموکراسی شتێکی مومکینە کە (بتوانین) بە نوێنەرانی خەڵك بڵێین: "ئێمە ئەم بەرپرسیارێتیە دەدەین بە سەرشانی ئێوەدا، بەڵام دواجار چاوەڕێین ئێوە راپۆرتمان پێشکەش بکەن". ئەمە کارێکی سادەو سروشتیە، ئەگەر هاوڵاتیانی رۆشنبین و سەختگیرمان نەبێت، هەرگیز سیاسەتمەدارانی پایەبڵندیشمان نابێت. بەڵکو خەڵکانی خراپ و کورسی پەرست دەبنە سەرچاوەی شتەکان، ئەمەش بۆ دیموکراسی یەکجار خەتەرناکە. کەوابوو لەم رووەوە لەنێوان ئەخلاق و سیاسەتدا پەیوەندیەك هەیە. بەم مانایە بەبێ دیموکراتخوازێکی سەختگیر، دیموکراسی بوونی نیە.

***بە دەربڕینێکی دیکە، دارمانی بەها ئەخلاقیەکان وردە وردە بەرەو دارمانی دیموکراسی پەلکێشمان دەکات.**

-بەڵێ، واتە ئێمە بەرەو بەمێگەل بوونی "Populisme" "برلوسکونی" لە ئیتالیا یان "لۆپن" لە فەرەنسا، دەڕۆین، ئەمانە کەسانێکن کە بە ئاشکرا گاڵتەو سووکایەتی بەهاوڵاتیان دەکەن و بە گەمژەیان دەزانن. پێویستە ئەوەش بڵێین کە ئەوەی هەڕەشە لە دیموکراسیەت دەکات، خەتەری مەردوم خەڵەتاندنەو ئەو مێگەل بوونەش شێوەیەکە لە مەردوم خەڵەتاندن، مەردوم خەڵەتاندن تەنها لە شوێنێکدا هەیە کە لەوێدا خەڵکی گۆڕابن بە مێگەل. مێگەلێك کە بتوانرێت بەهەموو لایەکدا ببرێت.

***ئەدی لە بەرامبەر ئاوەها مەردوم خەڵەتاندنێکدا رۆڵ و بەرپرسیارێتی رۆشنبیرێك چیە! ئایا پێویستە رۆڵی پەروەردەکاری ببینێت!**

-بە بڕوای من، تەنها رۆشنبیرانی نین. لە فەرەنسادا رۆشنبیران رۆڵێکیان بۆخۆیان دەست نیشان کردوە کە تاڕادەیەك دەست بەسەراگرتنە. بەگومانی من دیموکراسی تەنها وەختێك زیندووە کە گروپی جۆراوجۆر بوونی هەبێت و لە هەمان کاتدا گروپی زیندووش بن. تەنانەت پیشەوەران و کەسانی خاوەن کاری ئازادیش پێویستە لەبەرامبەر سیاسەتمەداراندا سەختگیر بن. ئەهلی زانستیش وەك هاوڵاتیەك، بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتیان لەسەرە. من پێم وایە لەم چوارچێوەیەدا کەنیسەش رۆڵێکی سەرەکی هەیە. پۆل ریکۆر چەندین جار گوتویەتی: دیموکراسی پێویستی بە پیاوان و ژنانی بڕوادار هەیە. بە بڕوای من رۆڵی ئاینەکان سەپاندنی ئاینەکەیان نیە بەسەرکۆمەڵگادا بەڵکو چەسپاندنیەتی لە دڵی تاکدا. ئاینەکان بەر لە

هەموو شتێك سازێنەرو پێکهێنەرن. بەم شێوەیەش رۆشنبیرانیش رۆڵیان هەیە، ئامادەتر لە هاوڵاتی ئاسایی نین. بە گومانی من رۆشنبیران رۆڵی گرنگیان هەیە، چونکە دەستی گوتارو نوسینیان هەیە، ئەوەش توانایەکە جوتیارو کرێکاران نییانە. کەوابوو لەم رووەوە رۆشنبیران رۆڵی گرنگ و تایبەتیان هەیە. بەڵام خەتەرێك لەگەڵ ئەم رۆڵەدا هەیە -خەتەرێك کە باش دەزانین چیە؟ ئەویش دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتە.

***ناوی کەنیسەت هێنا، پێم باشە کەمێك باسی ئەم دەزگایە بکەین. تۆ نووسیوتە پێویستە کەنیسە بە مەبەستی بەرهەمهێنانی کلتورێکی دیموکراتی رۆڵێکی بنەڕەتی لە پەروەردەکردنی ویژداندا هەبێت. بەڵام من پێم وایە بۆ بەرگری کردن لە ئاوەها هەڵوێستێك پێویستە کەنیسە لەناوخۆدا تەبایی و گونجاوتر بێت لە کاتێکدا ئێستا گفتوگۆی نێوان کەنیسە جۆراوجۆرەکان دووچاری ئاشوب و بارگرژی بووە، پێت وا نیە لە حاڵی حازردا و لەناو کەنیسەی مەسیحی‌داو لە ڕێڕەوی کارەکانی زانا رۆحیەکانی وەك "کونگ" و "دورمین"دا، روبەڕوو بوونەوەی نێوان ویژدانی تاکگەرایی و قودرەتی کەنیسە هەست پێدەکەین؟**

–سەرەتا پێویستە بڵێم کەنیسەی کاسۆلیکی جەماوەرێکی یەك پارچە نیە. هەروەك "شتنیت پۆڵ" دەڵێت: کەنیسە لاشەیەکی زیندووەو ئەندامی جیاوازی هەیە کە ئەرك و بەرپرسیارێتی جیاوازیان هەیە. کەوابوو ئەگەر وابێت، لە ناوخۆی کەنیسەدا نەك تەنها بەناچاری کە فرە ئەرك و فەرمانی بەرقەرارە -چونکە هەموو کەسێك هەموو کارێك ناکات– بەڵکو بۆ وەرگرتنی پەیامی مەسیحیەت بەشێوەیەکی تایبەت و جیاواز، فرە بۆچوونی بەهەمان شێوە باڵادەستە. دەورانی مەزنی مێژووی کەنیسە (بۆ نمونە سەدەکانی ناوەڕاست) رۆژگارێکن کە تێیایاندا قوتابخانەو ڕێچکە ئاینی و کەلامیەکان رووبەڕووی یەکتر بوونەتەوە. قوتابخانەکانی "فرانسیسکن" لەگەڵ قوتابخانەی "سن تۆماس" جیاوازبوون، ئەوانی دیکەش هەر بەو شێوەیە. ئەم فرەییە بەشێکە لە خودی بیرو هۆشی کەنیسە. لەبەرئەوە کەنیسە دەزگایەکی یەکپارچە نیە، کەنیسە ویژدانی مرۆڤەکان بەشێوەیەکی فرەیی باردەهێنێت، چونکە لەناو خۆی کەنیسەدا فرەییەکی ساغ و پەسەندکراو بوونی هەیە. من پێم وایە ئیمان بێ ئەوەی دوچاری تۆتالیتاریزم بێت ناتوانێت ئەم فرەییە لە بۆچوون و بیروباوەڕدا قەبوڵ نەکات، وەگەرنا دوچاری جۆرێك لە دیکتاتۆری رۆح دەبێت کە لەگەڵ تێڕوانینی ئیماندا بەتەواوی جیاوازە.

هەر ئەوەندەی ئەم مەسەلەسیە -کە مەسەلەیەکی بنەڕەتیە - هێنرایە ئاراو لەگەڵ ئەوەشدا کە کەنیسە حەزێکی سروشتی بۆ "یەك" بوون "یەك جەستە" هەیە، ئیدی رێگەیەك بۆ هەڵاتن لە پێکدادان و وتوێژەکان نیە، پێکدادان و وتوێژێك کە هەمیشە لە نێوان کەلامناسان و زانا جۆربەجۆرەکاندا بوونی هەبووە. ئیدی ئەو بەرخوردە توندانەی لەهەر گۆشەو کەنارێکەوە سەبارەت بە فڵان یان فیسار بیریار یان کەلامناسی دەسەڵاتداری کەنیسە بڕوایان وایە پێی لە سنوری خۆی زیاتر هەڵناوە، چارەسەر نیە. نازانم چلۆن چۆنی دەتوانرێت رێگە لەم حاڵەتە بگیرێت. چونکە لە هەموو رۆژگارێکدا کەنیسە گرفتاری ئەم حاڵەتە بووە. ئەم مەسەلەیە لەکایەی زانستیشدا هەروایە، ئەو کەسەی بە دواداچوونێك ئەنجام دەدات، هاوکارەکانی هەمیشە هاوبیرو باوەڕ نین لەگەڵیدا. ئەمە بەشێکە لە ژیانی رۆح.

ئێستا لێگەڕێ با لێرەدا رەگەزی سێیەم بخەینە ناو مەسەلەکە، ئەویش ئەوەیە کە ئەمڕۆ لە کەنیسەی کاسۆلیکیدا بەتایبەت لە ڤاتیکاندا

جۆرێك لە هەڵچوون و ترس لە تەقینەوە هەست پێدەكرێت. چونكە كەنیسە بۆتە شتێكی جیهانی و هەمەڕەنگی زیاتری بەخۆوە دیوە. ڤاتیكان وا هەست دەكات چیتر یەكێتی بوونی نیە. لەبەرئەوە لەلای "ژان پۆڵی دووەم" مەیلی دەسەڵاتدارێتیەكی نوێ بەسەر كەنیسەدا بەرچاو دەكەوێت. واتە ئەوەی دەیانەوێ هەموو كەس وەكو ڤاتیكان و وەكو ژان پۆڵی دووەم بیر بكاتەوە. لە ئەنجامدا جۆرێك لە قەیران پەیدا بووە، بەرادەیەك كە ڤاتیكان چیدی وەك فرەیی دەرناكەوێت. لەبەرئەوە بەچاوێكی خراپەوە تەماشای كەسانێك دەكەن كە قسانێكی مشتومڕ هەلگر دەكەن و تەنانەت كەسانێك كە فرە رەنگی نیشان دەدەن. ئەمە بەشێكە لە دۆگمای كەنیسەی كاسۆلیكی بەڵام لە زۆریەی ئاینزاكانی دیكەشدا هەروایە. ئەم مەسەلەیە لەلای جولەكەو موسڵمانەكانیش هەر راستە. ئەم حاڵەتە جۆرێك (ئینكماش) چوونەوە ناوخۆی ئاینەكانە، لەبەرئەوەی مەترسی تەقینەوە هەڕەشەیان لێدەكات. ئەم پێكدادانە لە كەنیسەی كاسۆلیكیشدا بوونی هەیە.

***خۆیشت ئەم پێكدادانەت لەناو گۆڤاری نیتۆدا هەبوو. چونكە بەڕێوەبەری گۆڤارەكە بوویت.**

-بەڵێ تا ڕادەیەك وابوو. بەڵام لە هەمان كاتدا دەمویست لە گۆڤاری نیتۆد بێمە دەرەوە. چونكە كارێكی یەكجار گران بوو منیش دەمویست درێژە بە نوسین بدەم ئاخر لە گۆڤارێكدا كە نووسین لە خەڵكی دی بۆ گۆڤارەكە وەردەگریت، خۆت كەمتر دەنووسیت. لەم بارەیەوە وتوێژێك هەبوو (بەهۆی ئەو فەزایەوە نە بۆم باسكردی). تا ئەو جێیەی گۆڤاری نیتۆد تریبۆنێكی (مینبەر) ئازاد بوو، بەركەناركردنی بەڕێوەبەر مانای هێرش كردن بوو بۆ سەر ئەو كەش و هەوا ئازادە. مەسەلەكە بەم شێوەیە خرایە روو. بەڵام لە راستیدا بەو شێوەیە نەبوو.

***بە بڕوای تۆ، ئایا كەنیسە، بۆ نزیكتر بوونەوە لە مەسەلەكانی كۆتایی سەدەی بیستەم، پێویستە بابەتەكانی ناوەوەی مۆدێرنێتە پەسەند بكات؟**

-بەڵام كەنیسە جگە لەمە ناتوانێت كارێكی دی بكات. چونكە كاسۆلیكەكان ئێستا لە مۆدێرنێتەدان، مەبەستم ئەوەیە ئێمە لە مۆدێرنێتەداین، چونكە گرفتاری زانست و تەكنۆلۆژیاین، چونكە لە گەماڕۆی زانیاریەكاندا دەژین، چونكە لە سیستمە دیموكراسیەكاندا ژیان بەسەر دەبەین. ئەم وتوێژانەش هەنوكە لە ناوخۆی كەنیسەدا هەن چۆن دەكرێت وا نەبێت. كاسۆلیكەكان خۆ لە پەراوێزی كۆمەڵگای سەدەی بیستەمدا نین، بەڵكو لە ناویدان باشە دەرهەق بە مۆدرێنێتە هەندێكیان بۆچوونی باشتریان هەیەو هەندێكی دیكەیش بۆچوونی سلبی تر. بەڵام لەوێوە كە ئیدی ئێمە لەناو مۆدێرنێتەداین، بە گومانی من قسەكردن لەوەی: ئایا پێویستە بە ئاراستەی مۆدێرنە بڕۆین یان بە پێچەوانەوەی، مەسەلەیەكی هەڵەو درۆیە. لێرەوە مەسەلەكە ئەوەی بزانین ئایا دەكرێ لە میانی گوتەزا ئیلاهیاتیەكانەوە، لە پەیوەندی لەگەڵ مۆدێرنێتە لە دیدگای ئیلاهیاتەوە سەرلەنوێ تێڕوانین بكرێت یان نا؟. بۆ نمونە لە دیدگای تەكنۆلۆژیەوە، مەسەلەكە زۆر ئاشكرایە. پرسیار ئەوەیە: ئایا كەسێكی مەسیحی پێویستە تاچ رادەیەك خۆ لە كاروبارە تەكنیكیەكان بەدوور بگرێت؟ دەبینین لێرەدا مەسەلەكە پەسەندكردن یا پەسەند نەكردنی تەكنیك و تەكنۆلۆژیا نیە، بەڵكو خستنەڕووی مەسەلە گەلێكی ئەخلاقی و مەعنەویە.

***ئەم بۆچوونە وتەیەكی "ئەریك فرۆم" مان وە بیردێنێتەوە، بەر لە پەنجا ساڵ گوتوویەتی: هەموو ئاینە رەسمیەكان پێویستە رۆژێك لەبەردەم ئەم هەڵبژاردنەدا بوەستن؛ یان بە پاوانخوازی بمێننەوە**

**یاخود بنە ئاینێکی (مرۆڤگەرا)، ئایا کەنیسەی مەسیحی توانیویەتی ئەم قۆناغە تێپەڕێنێت؟**

—ئەم کارە هیچ کاتێك بە یەکجاری و بەشێوەیەکی تەواو بە ئەنجام نەگەیشتووە. دەتوانین بڵێین لە ئەنجومەنی دووەمی ڤاتیکانەوە ئیدی کەنیسە دەستی کرد بە هەوڵێکی گەورە بۆ بەرەو مەدەنیەت رۆشتن. لەلایەکی دیکەیشەوە پێویستە بڵێین: کەنیسەی کاسۆلیکی بەردەوام وەك کەنیسەیەکی رێکخراو ماوەتەوە. کەنیسەی کاسۆلیکی لەسەر بنەمای چەند مەرتەبەیەك دامەزراوە. بە بڕوای من ئەمە چانسێکی گەورەیە. لەبەر ئەوەی دەسەلاتێك هەیە دەتوانێت بەناوی کەنیسەوە قسە بکات. پاپا دەتوانێت لەسەر ئاستی جیهاندا دەربارەی مەسەلەگەلی (جیهانی سێیەم و داماڵینی چەك) و شتانی لەم بابەتە، دەست لە کارەکان وەربدات. ئێستا جیهان پێویستی بە ئاوەها دەسەلاتێکی ئەخلاقی هەیە. بەلام هەرکە کەنیسە رێکخراوێکی زنجیرە پلەی پەیداکرد، ئیدی بەناچاری ئەم دەسەلاتە گرفت ئامێز دەبێت و بارگرژییەکی بەردەوام لە نێوان پاوانخوازی و مرۆڤ گەراییدا پەیدا دەبێت. لە رۆژگارێکی تێکشکێنەری وەك رۆژگاری ئێمەدا، بێگومان توانا دووچاری زبریی دەبێت.

**•بێگومان، لە مەسیحیەتێك کە تەنها جۆرێك لە مرۆڤگەرایی مۆدێرن بێت، بەبێ بنەما ئاینییەکان، چی پەیدا بێت؟**

—ئەڵبەتە چونکە مەسیحیەت لەکۆمەڵێك سومبولی خۆیەوە سەرلەنوێ دەردەکەوێتەوە، بەو مانایەی کە نفوزکردن بۆ زیهنەکان تەنها بە ئەندێشە ئەنجام نادرێت، بەڵکو سومبولگەلێکی گەورەی -وەك "باوك، کوڕ، جەستەی مەسیح" و لەم بابەتانە- رۆڵیان هەیە کە لەسەر جیهانی خەیاڵ کاریگەری بە جێ دەهێڵن. ئیمانی مەسیحی لەگەل جەستەدا دەدوێت، هەر لێرەشەوەیە کە شتێکی شەخسییە. کەوابوو ئامانج ئەوە نیە سومبولەکانی وەك سەریمۆنیا (مناسك) و داب و نەریتی کەنیسە بە قازادجی مرۆڤگەراییەکی رووت (کە جۆرێك فەلسەفەی چەمکیە) بخەینە ئەولاوە.

**•پێت وا نیە بە پاشەکشەکردنی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیستی و لاواز بوونی فەلسەفەی مارکسی، ئایین پێگەیەکی بەهێزتری لە ئەورووپای ئەمڕۆدا بۆ دروست بووە؟ دینی مەسیحی جێگەیەکی زیاتر لە ئەورووپای ئەمڕۆدا هەیە؟**

—بڕوانە وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەلات. چەندین جار گوتراوە: بە تەواوبوونی کۆمۆنیزم، کەنیسەی کاسۆلیکی هێزێکی مەعنەوی تازەی بۆ پەیدا دەبێت. بەلام ئەوەی ئێستا دەیبینین پێچەوانەی ئەوەمان بۆ دەردەخات. مەسیحیەکانی ئەو وڵاتانە بە شێوەیەکی قووڵ کاریگەری تۆتالیتاریزمی یەکێتی سۆڤیەت لەسەر ناخ و رۆحیان هەیە. ئیرادەو مرۆڤایەتی بوونی ئەو خەڵکە بەتەواوی ئاڵۆسکاوەو بونیادی خۆی لە دەستداوە. بۆیە کۆتایی هاتنی ئەم رژێمە ئەوانی لە بەردەم بیابانێکی مرۆییدا داناوە، بەو مانایەی مرۆڤەکان ناتوانن داهێنانێك لە خۆیاندا نیشان بدەن. مەسیحیەکانی ئەوێ بە توندی لەژێر ئەم کاریگەرییەدان. لەبەرئەوە ئەمڕۆ لە کۆمارەکانی "چیك، مەجەر، پۆڵۆنیا" دەتوانین ئەو ئاڵۆزی و بارگرژییە بە ئاشکرا لە کەنیسەدا ببینین. چونکە ئەو خەڵکە چیتر بە وەرگرتنی بەرپرسیارێتی رانەهاتوون. چونکە هەمیشە لە ژیانی ترس یان ژیانی نهێنی و یاخود لە ژیانێکی تاکانەییدا ژیاون. ئیدی توانایان نیە داهێنانێك لە خۆیاندا بەدی بهێنن. لەم گۆشە نیگایەوە کۆتایی هاتنی کۆمۆنیزم قەیرانێکی سەختی لەنێو خەڵکە ئایندارەکاندا هێناوەتە کایەوە. بڕوانە فەساد لە روسیادا؛ چیتر خەڵکی تاقەتی کارو وردبینی راستگۆییان نەماوە -واتە رانەهاتوون لەگەڵ

بەهاگەلێك كە دیموكراسیان لەسەر بنیات نراوە– بەتایبەت مەسیحیەكان گرفتاری سەرلێشێواوی و ئاڵۆزییەكی زیاترن.

***لەبەر ئەوەیە كە ئەوان زیاتر بە شوێن بەها بازرگانیەكانی رۆژئاوادا وێڵن، تاكو بەهاكانی دیموكراسی؟**

–هەموو رووداوەكان ئەوەمان تێدەگەیەنن كە ئێستا لەگەڵ كەسانێكدا رووبەڕووین بۆ ماوەی پەنجا ساڵ بە هیچ شێوەیەك رانەهاتوون لەگەڵ دامێنان و راستگۆیی و شەهامەتدا. ئەوان لە هەموو كاتەكانی ژیانیاندا سەرقاڵی درۆكردن بوون، ئەم حاڵەتەش جۆرە زیهنیەتێكی تایبەت بەرهەم دەهێنێ. ئێستا خەڵكانی ئەورووپای رۆژهەڵات ئازادن یاسا بۆ خۆیان هەڵبژێرن، بەڵام شارەزا نین رێز لە یاسا بگرن. بە گومانی من ئەمە قەیرانێكی جیدییە.

***لە كتێبەكەتاندا لە شوێنێكدا دەڵێن: "رەتكردنەوەی بیرۆكەی شەڕانكێزو وەحشیەتكەری، سەلمێنەری بوونی ویژدانە" رەنگە مادامەكی وەحشیگەری بوونی هەیە، ئیدی ویژدانیش دەسەلمێنرێ. بەڵام كاتێ وەحشیگەری لەناوچوو ویژدانیش ئیفلیج دەبێت.**

–بەڵی جۆرێك لە ئیفلیج بوون هەیە، لەم حاڵەتەدا ئیدی ویژدان نازانێت لەگەڵ چ شتێكدا ململانێ بكات.

***ویژدان بە شێوەیەك لە شێوەكان دووچاری ئیبنیزال دەبێت.**

–بەڵێ، خەڵكی بێ هیوا دەبن، چونكە سەرەنجامی كارەكانیان نابینن. لەم حاڵەتەدا دەڵێن: "شەرافەت بە كەڵكی چی دێت؟" ئەگەر بتوانرێت بەیارمەتی فەساد لە شەڕی (شەرافەت) رزگار بین؛ ئەوە "بسم الله! !" لە راستیدا من پێم وایە میراتی ماركسیزم میراتێكی گرانەو كەنیسەكانی ئەورووپای رۆژهەڵاتیش بەندو بەخسیری ئەو گێژاوەن.

***بە بڕوای تۆ ئایا دەكرێ بەها گەلی گشتی و گشتگیری مۆدێرنێتە لە بەرامبەر رێژەگەرایی باڵادەستی خۆی بۆ رابگیرێت؟**

–ئومێدەوارم وا بێت، بەڵام ئەمە قارەمانێتیەكی سەختەو كەس تیایدا براوە نیە. ئاراستە ناسیونالیستیەكان شێوەی دیكەی بەها گشتیەكانن لەبەر هەمان هۆ من لە ریزی ئەو كەسانەدا كە گومان وایە هەر كە دیموكراسی پەیدا بوو، ئیدی لەسەر ریتمی تایبەتی خۆی پەرە دەسێنێ. بە گومانی من دیموكراسیش بەردەوام پێویستی بەوە هەیە رۆحێكی تازە بە باڵایدا بكرێتەوەو لە شوێنێكەوە هێزو توانا وەربگرێت. لێرەوەیە رۆڵی فەیلەسوفان و ئاینەكان گرنگی دەبێت. بە گومانی من پێویستە ئاینەكان لە رۆشنكردنەوەو شرۆڤەكردنی گەورەیی و توانستی ئەم بەها گشتیانەدا، لە بەرامبەر وەسوەسەی گەڕانەوە بۆ خود یان گەڕانەوە بۆ ناسیونالیستی، بەشداریەكی گەورە بكەن. دیموكراسی نەبەردێكی هەمیشەییە. ئەوەی زامنكەری دیوكراسییە تەنها یاسایەكی بنەڕەتی باش و بەندو برگەی باشی ئەو یاسایە نیە. دیموكراسی مەرجی پێویستی ئازادیە، بەڵام ئەوە بەس نیە. بەبێ هاوڵاتیانی ئاگادار لە بەها گشتیەكان، دیموكراسی مانای نیە. ئەم بەهایانەش پێویستە هاوڵاتیان لە شیعرو فەلسەفەو ئاینەوە هەڵی بهێنجن.

***كەواتە تۆ ئارەزومەندی مەسیحیەتێكی كە بە كوتەی نیچە بریتیە لە: "گوێ پێنەدانی تەواو بۆ بنەماكان، سەریمۆنیاكان، رۆحانیەت، كەنیسەو ئیلاهیات".**

–من مەسیحیەتێکم دەوێ وەفادار بێت بەرامبەر بەخۆی، واتە پشتگیری ئازادی بێت – هەروەك وایشە. بەم گوتەیە مەبەستم دورخستنەوەی هەموو سومبولەکانی مەسیحیەت نیە– چونکە بەم شێوەیە ئاینێکمان نابێت و ئەمەش تراژیدیای ئاینزای پرۆتستانتە لە سەدەی بیستەمدا، واتە لەگەڵ ئەفسانە دلماڵیندا، ئیدی هیچ شتێك نامێنێتەوە. لە راستیدا پێویستە ئاینێك بوونی هەبێت كە بڕوای بە ئازادی هەبێت، یاریەکانی عەقڵ پەسەند بکات و مل بۆ وتوێژ بدات. بەلام لە هەمان کاتدا هەموو سومبول و دەزگا رۆحانییەکانی خۆیشی بپارێزێت. مەسیحیەت بە بێ کەنیسە چیە؟ راستە کە لەم حاڵەتەدا بارێکی گران دەکەوێتە سەرشانی ئێمە، بەلام پێویستە ڕوویەڕووی ئەم بارە گرانە ببینەوە، بەبێ کەنیسە چی بەدەست دەهێنین؟

**•ویژدانی مەسیحی بە دەست دەهێنین!**

–بەڵێ، بەلام ویژدان لە کەنیسەدا فۆرمەلە دەبێت. کەسێکی وەك "سان فرانسیس" بەبێ ئینجیل نایەتە دی. ویژدان دەرەنجامە. پێویستمان بە پەیوەندی کەسانی دی هەیە.

**•ئەم پەیوەندی بە کەسانی دیە، مانای پەیوەندی بە ئاینەکانی دیکەو گفتوگۆی بەردەوامە لە کەڵیاندا.**

–ئەڵبەت، بەبێ ئاوەها گفتۆگۆیەکی بەردەوام، ئاینەکان لەناو خۆیاندا بەگەمارۆ دراوی و حەپسکراوی دەمێننەوە. ئەمە مەسەلەیەکی یەکجار دژوارە. مەسەلە بریتیە لە دوورکەوتنەوە لە هەموو جۆرە لێك حاڵی نەبوونێك. بە گومانی من کلیلی چارەسەری ئەم مەسەلەیە ئەوەیە؛ نابێت هیچ ئاینێك بڵێت: "من تەنها ئاینی هەڵگری راستیم و ئەو ئاینەی دیکە لە هەڵەدایە" ئەگەر بەم گریمانەیە دەست پێبکەین، ناتوانین لەگەڵ یەکتردا گفتوگۆ بکەین. گریمانەی گفتوگۆمان ئەوەیە کە بڵێین: پێویستە هەموومان رۆشنی بکەینەوە کە بۆچی لە مێژوودا (رابردوو) لە زمانی یەکتری تێنەگەیشتووین، کەوابوو پێویستە دەمارگیری و پێشداوەریەکانمان بەلاوە بنێین. بە شێوەیەك کە لە قسەی یەکتری باشتر تێبگەین و لە هەمان کاتیشدا وەفادار بین بەرامبەر بە هەقیقەتەکانمان. لە پەیوەندیەکدا کە لەسەر بنەمای زۆرداری و بەکەم سەیرکردنی بەرامبەر دروست بووبێت، گفتوگۆ دروست نابێت.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری کیان ژمارە 36 ل 44–51.

# هەڵبژاردەیەك لە كارەكانی نیچە

## 1-لەكتێبی (زەردەشت وای گوت)ەوە*

### دانایانی بەناوبانگ

خێڵی دلناكان! ئێوە بەناوو شۆرەتی خۆتانەوە دەنازن‌و خزمەتی ئەو گەلەتان كردووە كە باوەڕی بەپڕووپووچە، بێتو لەباتی ئەوە خزمەتی (راستی)تان بكردایە ئەوا كەس ڕێزی لێ نەدەگرتن.. هەر لەبەر ئەوە گەل بووەتە باركێشی گومان ئارلییتان! ئەویش زادەی دەمووددووی ڕازلوەتانەو بووەتە ئەو پێچە ڕێگایە كەبەرەو دەربڕینی قەشەنگ كێشتان دەكا. بەو ڕەنگە ئەوەی سەردارە بەندەو تۆكە بۆخۆی پەیدا دەكاو لێی دەوەستێتەرە، ئەوجا بەدۆخی گومرابوون‌و بەیەكانیان دەكەوێتە خۆشی‌و رابواردن. ئەو مرۆڤەی چۆن سەگ رقی لەگورگە- ئاوا گەل چارەی ئاوێ دەشێ كێ‌بێ؟ بێگومان گەل چارەی ئەركەسەی ئەگەرەكە: خاوەن بیرو ئازادە.. دوژمنی كۆتەو نابێتە مل كەچ‌و كۆیلە.. ئەو مرۆ ئازلدەمان جەنگەڵ نشینی بەلاوە پەسەندە.

ئەو شتەی لەهەمو زەمانێك دا گەل بەگیانی- داد-ی زانیوە ئەوە دانیكەو بۆ گیانی ئازادی خۆی لەبۆسەناوەو سەگەدڕەكانیشی دەلوورێنن بەسەریدا. ئەوەش لەبەر چاوەكە لەگشت زەمانێك دا گوتراوە:

(راستی لە بێجگەی گەل دانیە.. ئەی وای بۆ ئەوكەسەی لەدەرەوەی گەلەوە ئەو داڵی راستی‌یە!))

دلناكان! ویستوویانە- لەبارەی سەركزی‌و نەوازشەوە پشتیوانی گەل بن. ئەوجا ئەوچاوشۆڕی‌یەتان بە (راست خوانی) ناوبردووە پیاح، كەچۆن دانایەكن؟!.

لەدڵی خۆتان دا دەتانگوت: زادەی گەلین‌و پەروەردەی گەلین.. دەنگی گەلیش دەنگی خوایە، وەك كەری گێل كەزاب دەم راستی‌و نێوەندیاریی خۆتان پیشان گەل داوە. زۆر دەسەڵاتداریش ویستوویانە گاریەی خۆیان

لەگەل چێژو نارەزووی گەل بسازێنن، ئەوجا بۆ ڕلکێشانی یارۆ گارییە کەرێکی گولەکە.. تۆ بڵێی- دانایەکی بەناوبانگ- یان تێ بەستووە!؟.

دانا بەناوبانگەکان ! داوڵتان لێ دەکەم چیتان لەبەردایە لە کەوڵەشێرو کەوڵە جانەوەری بەڵەکو پەستەکی جیهان گەڕو دلگیرکەرەکان لەبەرخۆتانیان داڕنن.. ئێوە هاوڵری ڕاستی رادەمێلن.. بەلام تا لەمەزنایەتی و بەگەورەگرتن وازنەهێنن باوەڕم بەو ڕاستیانەتان نیە .. راست پەروەر ئەو بێ خولوەندەیە ئەداتە هەردەو چۆلێ.. هەر لەبن دەستی خۆیەوە گەورە پەرستی و ستایش خوانی تێك هاڕیون ئەو جا بووتە هەردەگێل. لمی بیابان قاچی چۆڵەوان دەسووتێنی و سەرنجیش ئەدلتە ئەو مێرگانەی ئاوی زولاڵیان لێ هەل دەقولێ و سێبەر دای پۆشیون و زیندەگانیش بەئاسوودە بنەی لێ خستووە، کەچی تینوێتی کاری تێناکاو ڕای نادا بۆ خۆشیانی لەگەل خۆشنوودەکان دلو ڕوویکاتە ئەو مێرغوزارە؛ چونکە دەزانێ هەرمێرگەو بتێ خۆی لێ هەلناوە. شێر دەیەوێ تەنیا بێو لەبەندلیەتی گەورەو سەروەرەکانو لەبەختەوەریەمل هوڕەکان خۆی ڕزگار بکا.. نوور بێ لەخولوەندو پەرستاکان دووبێ لەترسو ئەولنەی ترس دەخەنە دلانەوە.. پیاوی ڕاست پەروەر ئاوا دەوێ.. ڕاستی خولزەکان هەر لەچۆڵەولنیدا ژیاون بەو بەرو ماوە بەرینەدا بیری خۆیان رەها کردووە.. بەلام لەشاران دا تەنیا دانا بەناوبانگەکان خۆراکی باش دەماشنەوە ئەوە نیە لەپێناو دلدۆشین دا ئاژەلە گوندارەکان باش دەلەوەڕێنن؟!. ئەولن گاریەی گەل رادەکێشنو کەرە گەل ئاسا خۆیان پێ پالوبەند کردووە. وەنەبێ من لێیان خەشم گیربم.. بەلام با بزلنن کە ئەولن نۆکەرنو گاریەیان لەپالووخرلوە، دەرەوشانەوەی زێڕیش بەسەر ئەو گاریەوە کەرای دەکێشن لە پووڕەشی قوتاریان ناکاو هیچ بەفریایان نایە .

زۆر جاریش ئەو مەردومانە لەخزمەتکاری دا دڵسۆزبوونو شیانی سوپاس بوون، دلنایی ئەوەی دەوێ کەنۆکەر لەئاغایەك بگەڕێو لەڕووی نۆکەرلیەتی‌یەوە سوودی پی بگەیەنێ

پێویستە هۆشی ئاغاکەت بالابێو پەسەندلیەتیشی هەروا بلند بێ؛ چونکە بەسایەی ئەو دوو سیفەتەوە تۆش بەرز دەبیتەوە.

ئەی دلنا نۆکەرەکانی گەل! بەسایەی بالا بوونی هۆش و پەسندلیەتی گەلەوە ئێوەش قنج بوونەتەوە.. گەلیش بەسایەتانەوە بالابووە. ئەوەی جارم دا بۆ پێدلهەلدلنتان نیە. ئێوە تەنانەت لە پەسندلیەتی خۆتان دا لەگەلەوە گلاونو بەسیلەتی ئەو ماونەتەوە.. بەلام گەلێکی سەر کێلنو پەی بەهیچ واتایەکی هۆش نابەن.

هۆش لەخۆیدا زیندەگانی‌یەو ژیان کوتولەت دەکا، ژیان چەندە بەرگەی ئازارەکان بگرێ لەزانیاریدا پەرە دەستێنێ و فراوان دەبێ. ئەرێ ئەو راستی‌یەتان زانیوە؟!

هۆش بەختیار نابێ تا فرمێسك نەسڕیو تاجی قوربانی نەنێیتە سەر. ئەرێ ئەو راستی‌یەتان زانیوە ؟!

نابینایی کوێرو پەل کوتانی بۆ رێگا شایەدن لەسەر هێزی خۆر. ئەرێ ئەو راستی‌یەتان زانیوە؟!

پێ ویستە کە زانیار خواز فێربێ کەکێوەکان بکاتە بەردی دیوارو تەلاری خۆی پێ بنیاد بنێ.. لەلایەکی دیکەشەوە (هۆش) کێو گولستنەوەی بەلاوە سەخت نەبێ.

ئەرێ ئەو راستی‌یەتان زانیوە؟!

لەبارەی هۆشەوە هەر ئەوەندتان بۆ دەرکەوتووە کە خراپەیەکی پێ دەوەستێ.. ئیدی نازانن کە ئەو هۆشە چ دەزگایەکە.. دیسان نازانن کەچەکوش چەندە بەڕەقی و بەقورسی دادێتە دەزگا؟!

بەراستی ئێوە لەبارەی گەورەیی هۆشەوە نەزانن، ئەگەر نەوازشی هۆش‌و ویستی راستی خـۆی رابگەیـەنێ ئەوا زۆر زەحمەتە ئێوە بەرگەی ئەو نەوازشەی بگرن.. یان ئەو نەوازشەی بگرن بەکۆڵتانەوە.

ئێوە لەهیچ زەمانێك دا نـەتان توانیـوە هۆشـی خۆتـان بـۆ چاڵـە بـەفرەکان بـەرێ بکـەن؛ چونکـە بـۆ ئـەو تێسمرانەی گەرمایی تەولوتان تێدا نیە.. لەبەرهەمان هۆ بەلەزەتی ئـەو کەسـە نـازانن کەشـەرلیی گـەرمی ئـەو چاڵانـە دەی بوژێنێتـەوە.. وێـرای ئـەوەش کـەبۆ وازی کـردن لەتـەك بیرکردنـەوەدا دێنـە بـەرەوە. بەهـەرحاڵ دڵنایی‌و پەنداریتان کردووەتە پەناگاو بیمارستانی زڕەشاعیران.

ئەی دڵنا بەناوبانگەکان! ئێوە هەڵۆ نین؛ کەواتـە نـازانن هـۆش لـەبیم‌و لـەرزی خـۆیدا چ خۆشـایەتی‌کی لێ دەرژێتەوە.. بێجگەی باڵداریش بەسەر شیوو دۆڵەکانەوە مافی دڕ بەهەوادانی نیە.

دڵناکان! لەوە پتر نین کەپێتان بڵێن نەکامڵ‌و هێور. تەوژمی شەختە لەهەموو زلنیاری‌یـەکی قووڵـەوە هـەڵ دەکا؛ چونکە سەرچاوە پەنهانەکانی هۆش وەك بەفر ساردن.. تەنیا ئەو دەستانەی بەگەرمی زەحمەت کێشان گریان تێ‌بەربووە لەزەت‌و خۆشی لەو زوقم‌و سۆڵەیە وەردەگرن!!

دڵنایانی بەناوبانگ! لەبەرچاومـە: ئـەوا خۆتـان بـەدڵ ڕەقی‌یـەوە پێـچ دلوم‌و بـەیایی بوونـەوە داچـەقیون؛ نەئەوەیە بەهێزی بایەك بجمێن.. ئەو ئیرادەیەشتان تێدا راست نابێتەوە زاتتان بێنێتە بەرو بجووڵێن.

ئەدی چاوتان بەو کەشتی یە نەکەوتوە کەبەسەر شەپۆلە شەپرزەکانەوە دەشەکێتەوەو لەهـەموو- وزاق‌و پێچ لێدلێك دا باو بۆران لەقاقلزەی ناوە؟!..

دڵنایی منیش وەك ئەو کەشتی‌یە بەسەر تەمەن دا تێ‌دەپەڕێ‌و پڕو چڕی گەردەلوولی بیرکردنەوەیە..

ئا ئـەوە دڵنـایی سرك‌و پـەرلوەزەی منـــو تـەکان دەدا.. ئـەی خزمـەت کارەکـانی گـەل.. ئـەی دانـا بەناوبانگەکان..! لەو حەلەدا کەمن تەکان بەخۆم دەدەم‌و رادەسێم- ئایـە ئێـوە دەتوانـن بێـن‌و شـان لەشـانم بدەن؟!.

زلرا ئاوای گوت...

* * *

## سروودی شەو

تاریکایی شەو داهات‌و خورەی شەتاوان بەرزەوەبوو.. دیسـان نەفسـەکەی منیـش سـەرچاوەی هـەڵقوڵیوی خۆی هەیەو دەکا هاژە لەمەردا.

تاریکایی شەوداهات‌و ئاوازی سروود لـەزاری ئاشقەکانەوە دەنگـی دلیـەوە. گیـانی منیـش سـروودێکە لـەو ئاوازە سروودانە.

لەناخی من دا شۆڕشە هێزێك هەیـەو دەیـەوێ دەنگـی خـۆی بـەردا.. تاسـەی خۆشەویسـتی‌یەو بەچەشـنی گیرۆدەکان خاوەنی گفتو بەیانە. من نوورم‌و کاشکی تاریکایی بوومایە. چونکە نووریۆشـم‌و گـرم تێ‌بـەربووە، ئەوەتانێ تەنیایی بووە تە بەشم.

ئەی کۆی ئەستێرە! وەك گوڵە ئەستێرە وردەکان بە ئاسمانەوە دەتروسکێنەوە؛ بێت‌و تاریکی بامایە دەم توانی لەپەتان ئاوقەد بکەم بەتیشك پژلنتان بنازێم..

بەلام من بەڕووناکیەکانی خۆمەوە دەژیم و بڵێسەی زاتی خۆم دەخۆمەوە.. لەخۆشبایەتیی وەرگران نائومێدم، جارەها بەدڵیشم دا هاتووە کە ئەو خۆشبایەتیەی لەدزیدا هەیە لە وەرگرتن دا نیە.

هەژاریم لەوەدایە کەدەستم لەبەخشین ناوەستێ هەمیشە تەماشای ئەوچاوانەدەکەم کەلەچاوەڕوانیدا کەیلن.. سەرنجی ئەو شەوگارانە دەدەم کە گڕگرتووی شەوق و تاسەن، ئەوەش حاڵێکی نزکنی‌یەو خەوگاکەم لێ ناخۆش دەکا.

ئای لەبەد بەختی بەخشندەکان .. ئای لەتاریکی خۆری من.. ئای لە ئەلهای حەزلێکێی من.ز ئای لە تاوی برسێتیم لەتێریم دا؟!

ئەوان چیان بدەمێ وەری دەگرن.. بەلام لەگیانیان بەدوورم، نێوانی وەرگرو بەخشندە کەندرێکی قوڵە. دەشێ نزیکترین چاڵ لەقولاییدا سەخترینیان بێ لەداپمان دا .

هەناوم تووشی جۆرە برسێتی‌یەك بووە پاڵم پێوە دجەنێ ئەوانە ئازارم بدەم کەنووری خۆمیان تێ دەگرم، حەزدەکەم ئەوانەی دیاریم پێ‌بەخشیون لێیان ببمە جەردەو رووتیان بکەمەوە.. ئابەو چەشنە تینوی جەزرەبە گەیاندنم؛ ئەو دەستەی درێژم دەکردەوە رای دەکێشمەوە دواوە.. من تافگەیەکم و دوور هاوێژانە تاڤگە تاقمە.

تۆڵە کردنەوەی ئاوا مەزنایەتی یەکەم فریودەدا.. ئەو جۆرە مەکرو فێڵەش زادەی بەرکەناریمە.

هێندەم بەخشی تا بەختیاریم لەکیس چوو، پەسەندلیەتیم هەڵ تەکاو پووکایەوە.. هەکەسێك کەمبینە بەخشندە بێ مەترسی ئەوەی لێ دەکرێ ژیان لەدەست بدا؛[1] کەواتە پێویستە لیەدەستی دلقونجێنی و دڵی رەق بێ.

کالانەی چاوەکانم ئەوکەمە فرمێسك باران دەکەن کەشەرمەزاری هاناو پاڕانەوەیە، ئەوەتا دەستم رژد هەڵاتوون، نەیان گەرەکە هەست بەو دەستە لەرزۆکانە بکەن کە بەچنگ پڕبوونەوە لاسەنگ بوون!

کوا فرمێسکی چاوەکانم.. کوا نەرم و نیانی دڵەکەم؟.. ئای لەتەنیایی بەخشندەکان.. ئای بۆ کشوماتی نوور پۆشەکان؟!

خۆرە بێ شمارەکان بەچۆڵگەی ئاسمانەوە دەخولێنەوەو بەتیشکەوە لەتەك چرە تاریکستانی‌یەکان دا — دەدوێن، منیش بەتەنێ لەقسەو گلفتی ئەو خۆرانە بێ‌بەشم.

ئەی هاوار لەتوانای چ پەیوەندی‌یەك دلیە رووناکی‌یەکان بەو تەنانەوە ببەستێتەوە کەلەخۆیان دا ڕووناکن؟ ئەو ڕووناکی‌یانە بەسەریان دا تێ دەپەڕن و بەخێسەیەکەوە چاوەزەدمان دەکەن و بەرێی خۆیان دا تێ دەتەقێنن.. ئا بەو جۆرە خۆر گەل بەئاسمانی خۆیان دا رادەبوورن و چارەی هیچ تەنێکی دیکەی‌درەخشانیان ناوێ، بەڵکو بەسارد و سڕیەکەوە تێ دەپەڕن و ئاوەڵەکانیشیان هەست بەتینی گەرماییان ناکەن.

خۆرەکان وەك فەرتەنە لەکەلووەکانی خۆیانەوە دەردەچن.. شوێن ئەو شتە دەکەون کەویستە بەزەبرەکەیان هەنگاوی بۆ ناوە، ئا لەمەدا سارد و گەرمی‌یەکەیان پەنهانە!

---

[1] بەپێی دوو نوسخەی بەردەستم و لەلاپەڕەی ()دا نووسراوە ((ان من يستمر على بذل الهبات مهدد بفقد الحيـاء)) بـاگێی بۆضوونی خۆم (الحياء))م بەژین واتە ((الحياة)) لێ داوەتەوە، لەوانەیشە هەر مەبەستی ((الحياء= شەرم))بێ..؟!

ئەی ستارە گەلی خۆپۆش بەتاریکەشەو ! ئایە بێجگەی ئێوە شتێکی دیکە هەیە گەرمایی لەبریسکانەوە دروست بکا؟.. هەر ئێوەن کە بەرزە هێزەکان لەگولنی نوور هەڵ بخەن.

وای بۆخۆم! شەختەیەو گێژم پێ دەخواتەوە..

دەستیشم بەگڕەی شەختە هەڵ دەپرووکێنی.. من بە گەرمە تینێکەوە هەڵ گیرساوم بەتینوێتی ئێوە نەبێ بڵێسەی دلنامرکێتەوە. ئەوا تاریکایی پەرەی شەند.. کەولە بۆچی لەچارەم نووسراوە نوورێکی تەنیابم و سەرۆشی تاریکستان بم؟!

تاریکستانییەو بەرین.. حەزکانی منن هاژەی شەتاوان..

دەیانەوێ لەپەنهانییەوە بێ کەنە هاوار. تاریکایی شەو دلهاتو خوڕەی قەڵبەزان بەرزەوەبوو..

دیسان نەفسەکەی منیش سەرچاوەی هەڵ قولیوی خۆی هەیە!

ئەوا تاریکانی شەو دلهاتو ئاوازی سروود لە زاری گێرژدەکانەوە دەنگی دلیەوە..

گیانی منیش سروودێکە لەو ئاوازە سروودانە.

زارا ئاوای گوت...

* * *

## سروودی سەما

ڕۆژێکیان زارا لەگەڵ یارانی بەنزارێك دا تێ پەڕین، لەو حەلەدا چاوی بۆ کانیاوێك دەگێرا مێرگێکی تەختانی لەنێو درەختەکانو بێشەڵانەکانەوە بەدی کرد. لەهەمان کات دا دستە کچۆڵەیەك- دوور لەچاوی ناحەزان - سەرفرازانە بۆ خۆیان سەمایان دەکرد.. کەچاویان لەم ڕێبوارە هەڵەنگوتو ناسیان وازیان لەسەما کردن هێنا.. بەڵام زارا لێیان هاتە پێشەوەو لەتەکیان دا کەوتە قسە:

کیژە جوانەکان! لەگەڵ ئێوەمە؛ مەوەستن بۆخۆتان هەڵپەڕن، من ڕێبوارێکم و هاتووم.. کەیف خۆشیتان بێ زارناکەمو دۆستی کیژانم ..کابرایەکمو لەبەردەمی شەیتان دا بەرگری لە یەزدان دەکەم،[2] شەیتانیش بریتییە لەگیانی پەزا قورس)) کەواتە چۆن دەبمە ملۆزمی بەهاو ڕۆح سووکیتان؟!.. ئەمە سەمایەکی خوادادەو لەمن ناوەشێتەوە ببمە دوژمنی.. ئیدی چۆن دەبمە دوژمنی سەمایەك کەئەو قاچە خنجیلە ڕێکانە دای بمەزرێنن؟!.

بێ گومان من ئەو جەنگەڵەم کەبەدرەختە چڕەکان ڕەش داگیرساوەو تاریکایی دەوروبەری داپۆشیوە.. بەڵام هەر کەسێك نەترسانە خۆی فڕێ داتە ئەو تاریکستانەی منەوە، لەژێر پەڵە سنەوبەرە بەسامەکانم دا- ئەو ڕێگایانە دەدۆزێتەوە کەئەمبارەو بەوگوڵ خەملاون، دسان تووشی ئەو خوڵایە دەبێ کەکیژان تاسەی دەکەنو ئەویش کشومات لەپەنا کانیاوێك دا هەلازیاوەو چاوەکانی ناونە سەریەك. لەجەرگەی نیوەڕۆدا ئەو

---

[2] بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێ ریسەکەی خۆی کردەوە بەخوری؛ لەزۆرینەی بەندەکانی ئەم کتێبەدا بێ پەروا بێ خوایی خۆی جاردەدا، کەچی ئالێرەدا ئەوەتانێ بەرگری لەخوادەکاو شتە ناسکو جوانەکان دەکاتە بەمرەی خوایی. کەواتە مرۆڤ چەندە جاڕی لەخواتۆران بدا دواتر خنەخن هەر دچێتەوە ژێر سێبەری خوا؟!

ئالانی

خولاّ داهێنراوه لێـی نووسـتووه، لەوانەیشـه مـانـدوویی‌و لـه‌مێژیی هەڵـه‌دلوانی پەپولـەگرتن بـێ تـا ژماره‌یـه‌کی نقوریان لێ ڕاوبکا.

سەماکەره خنجیلانەکان! لێم زویر مه‌بن کەنەو گچکـه خواوەنـده تـه‌مێ دەکـه‌م، تیـنـی بـۆ بێنـم تابیکاتـه هاوارو گریان.. بـه‌ڵام خواوەندێکـه‌و لـه‌هاوڕێی گریـانی‌دا خۆشـی‌و شـادی دەهێنـی. لەمـه‌ولایش بەفرمیچسـکی سـەرگۆنایه‌وه بۆ لاتانی کێش دەکەم تا دلوانتان لێ بکا لەگەڵ خۆتانا بی خەنه سەما، هەر ئەوەنده کەوته سەما ئەوامنیش بەگۆرانی ژینەوه دەبمە یاوەری ئەو. گۆرانی‌یەکانم لاوژمیەکن وەك شەپازڵە ئەیان مـاڵم بـەبناگویی قورسه گیان دا.. گیانی ئەو شەیتانی خۆی هەڵ ناوەو لەخەلکی وایه جیهانگیره.

لەو کاتەدا خواوەندی خۆشەویستی ((کۆبیدۆن)) لەگەڵ کیژۆڵە دڵ ڕفێنەکان دا سـەمای دەکـرد زلرا هـات‌و بەسترانی چڕینەوه دەنگی لێ هەلبڕی.

ئەی زیندەگانی! ئەوڕۆژەی چاوم لەچاوت هەڵ چەقی وام زانی کەوتوومەته بنـەوەی ناخەکانـەوه.. بـەڵام تۆ منت بەتوڕی زێڕین هەڵ کێشایەوه، کاتێ ناوی قوولییتم هێناو گوتم بێبنـه قاقایـه‌کی گاڵتـه چیانـه‌ت ڕەها کردو پێت گوتم: ((ئەمەی تۆ دەیبێژی هەر ئەوەیه کە ماسی‌یەکان دەیڵێن، ئەوانیش کە نـاتوانن بگەنـه بنـی قوولایی وادەزانن قوولایی‌یەکه بێبنه. تۆبڵێی بێ بارو بێ میزاج بم؟! تۆ بڵێی ئـافرەتێك بم.. بـەڵام ئـافرەتێکی بێ بەش لەئاکار پەسندی؟.. له بارەی سیفەتەکانمەوه دەم هەڵبەستی خەڵك زۆره.. بەڵام هەمووشیان لەسـەر ئەوەن کەپڕ له نهێنیم‌و کۆتاییم نایه.

خەڵکینه! ئێوه پەسند ئارلییتان لەمن دا دەبینن؛ لەوەش بەولاوه هیچ دەسەڵاتێکی دیکەتان نیه.))

بەڵێ ژیان لەگاڵتەجاڕی خۆیدا ئەم حیلەو قاقایەی لێدا.. بەڵام بەش بەخۆم باوەڕی پێ ناکەم، لەوکاتـەش دا کەخۆی دادەشۆرێ ئەو پێکەنینەی لێ ناسەلمێنم.

ڕۆژێکیان لەگەڵ دلنایی‌یە توسنەکەم دا کەوتنە چپەو رازەوه، ئەویش بەڕقەوه پێی گوتم

تۆ حەزت لەژیانەو خۆشت دەوێ‌و دلوای دەکەی هەر ئەمەیشە کەپاڵت دەدا فره سوپاسی ژیان بکەی.

ئەگەر خۆم ڕانەگرتایه وەڵامی دلناییم بەچەتوونی دەدایـەوەو ڕاستیشـم بـۆ وەدەر دەخسـت.. هەرچـەنده دلنایی رقەبەریم لەگەڵ دا دەکا، دەبێ وەڵامی کاریگەرتری بۆ ساز بدرێ تا نهێنی‌یەکانی هەڵ بماڵ درێن؟!

لەناخی دڵمەوه بێجگه لەژیان هیچی شتێکی دیکەم خۆش ناوێ.. ئەوکاتەی چارەی ژیانم ئەوێ پلەی ژیـان خۆشویستنەکەم دەگاته ئەو پەڕی. ئەگەر هات‌و بەرەو دلنایی تەکانم داو هانام بۆ هێنا لەبەر ئەوەیه کەلەژیان یادکردنەوەی من دا ئەوزۆر پێ هەڵ دەبڕێ.

دلنایی چاوی ژیان‌و زەردەخەنەی ژیانی هەیـه.. بـەڵکو تـۆڕی زێرینیشـی هەیـه. کـەدلنایم تـا ئـەم رادەیـه لەژیان بچی دەبێ چی بکەم چیم بۆ بمێنێتەوه؟!

کاتێ ژیان لەبارەی دانایی‌یەوه لێی پرسیم، وەڵامم دایەوه، ((دلنایی ئەوەیه کە مرۆڤ بەهـەموو توانایـەوه ئیشتیای دەکاو لێی تێر نابێ. بەچاو دەی قۆزێتەوه تالەوبیو پووپـەندەوه دەموچاوی دەردەکـەوێ‌و بەگـەری تۆڕەکەیدا پەنجه ڕادەداو لەبارەی جوانی‌یەکەیەوه دەپرسێت‌و ناشزانی ئەو جوانی‌یه چیه؟

لەگـەڵ ئەوەشـرا پێشـترین ماسـی خـۆی نـاگرێ‌و بـۆ چێشـتەداو تـەکان دەدلو سەرسـەختانه هـەڵ دەبزوڕقێنـەوه. زۆر جار دانـاییم دیـوه لالێوی دەگـەزێ‌و قـژی لێ بەردەدایـەوه. کەئەمـه ئاکاریـەتی لەوانەیـه فێڵبازو بەد بی.. بەڵکو لەوانەیه ئاکار ژنانی بێ. تا زلتی خۆشی دلنەشوات ئەوا ناگاته ئەوپەڕی دڵ ڕاکێشان.

دوای ئەوەی لەبارەی دڵنیایییەوە بەژیانم ڕاگەیاند بزەیەکی شەیتانی بەسەر لێودا ڕابووردو چاوی لێ وێک هێنان و گوتی:

((ئەوە باسی کام دڵنیاییەکەی؟!.. لەوانەیە مەبەستت من بێ؟.. ئایە مرۆڤ- بارلستیش بێ- مافی ئەوەی هەیە کە ئەو هەموو شانە بداتە ڕووی هەرکامێك کەمەبەستی بێ؟

کەولتە کابرا: تۆ لەبارەی دڵنیایی خۆتەوە دەڵێی‌چی؟ ئەوا لەلایەکەوە ژیانی خۆشەویست هەردووچاوی کردنەوە، لەلایەکی دیکەشەوە وەم زانی بەچاڵو زمندۆڵی زۆر قووڵدا ڕەمێل دەبمەوە))

ئەمە پێدا هەڵ دان و سروود چرپەی زارا بوو. هێشتا سەما دوایی نەهاتبوو.. کیژۆڵەکانیش لەبەرچاوم گوم نە بوون خەمێنی قووڵ دای گرت و گوتی:

((ئەوا خۆر لای کردەوە.. مێرگ ناونگی لێ نیشت.. دارستان بەکزەباوە کەوتە شنەشن. سەیرە! شتێکی نادیار، نەناسراو دەوروەم دەدا، چاوم لێ زەق دەکاتەوەو دەڵێ:

((ئەرێ زارا! هێشتا لەژیان دای؟. لەپای چی زیندەی؟.. ئەم زیندەگانییەی تۆ چ سوودێکی هەیە؟ گولیە مانەوەت لەژیان دا کارێکی شێتانە نیە؟وای بۆ خۆم! یاران: ئەوەی لەمن دا ڕازی دامەزراندووە شەو وزەنگە.. داوایم لێ وەشارن.. بەرسنگی نێولرەش بگرن و مەهێڵن پێم بگا.

زارا ئاوای گوت..

پەراوێز:

*ئەم نموونانەی کتێبی (زەردەشت وای گوت) لە تەرجەمەکەی مامۆستای خوالێخۆشبوو ڕەئوفی ئەحمەد تالانییەوە وەرگیراوە کە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڕیارە لەساڵی ئایندەدا بەچاپی بگەیەنێت.

# 2- پێشەکیی کتێبی (جینالۆجیای ئاکار)

## جینالۆجیای ئاکار

■ فریدریش نیچە

• و. لە ئینگلیزیەوە: ئەنوەر حەمە سالح

پێشەکی:

(1)

ئێمەی شەیێنکەوتولنی مەعریفە نەناسراو بەخۆمان دەمێنینەوە، تەنانەت بۆخۆشمان، ئەویش لەبەر هۆیەکی راست و دروست. چونکە ئێمە هەرگیز بەدوای خۆماندا نەگەڕاوین. کەواتە چۆن دەکرێت رۆژێـك لە رۆژان خۆمان بدۆزینەوە؟ راست وتراوە کـە: "گەنجت لـەکوێ بێـت، هـەروەها دڵیشـت لـەوێندەرە" دەبێت گەنبی ئێمە لە پورەکانی مەعریفەدا بدۆزینەوە. وەکو هەنگە رۆحانیـە زگماکـەکان، ئەمـە تاکـە مەبەستمانە، دڵمان تەنها بەیەك شتدا چووە "هێنانەوەی شتێك بۆ ماڵ". ژیان هەرچیەکی تری هـەبێت پێشکەشمان بکات لە "ئەزمونەکان"ی کێ لە ئێمە هێندە جدیـە بۆیـان؟ یاخود کاتی پێویستی هەیە بۆیان؟ من ترسی ئەوەم هەیە کە لەو جۆرە گرفتانەدا "نزیك شتەکان" نەبوبین: دڵمان بەتەواوی لـەلای نەبووە، نەخێر، رەنگە ئەوەی لەلای بوویێت گوێکانمان بوبێت! بیهێنەرە خەیاڵتەوە کاتێك کەسێك لـە بڕتاو دالڤەیەکی جوان و لەخۆدا قوڵبونەوەیەك رادەچڵەکێت بـەهۆی دوانـزە لێدانـە بەرزەکـەی زەنگـی کاتژمێری نیوەڕۆوە، لەخۆی دەپرسێت: دەبێت کاتژمێر چەند بێت؟ بەهـەمان شێوە، ئێمـەش لـەدوای ئەو راستیە گوێکانمان دەخورێنین و بە سەرسوڕمانێکی تەواو بـە پەشۆکاویەوە دەپرسین: ئـەوە چـی بوو هەنوکە تاقیمان کردەوە؟ یاخود تەنانەت دەشپرسین: ئێمـە لەراستیدا کێین؟ پاشـان وەکو وتم: جارێکی تر لە هێنانەوە یـاددا هەریـەك لـە دوانـزە لەرینەرەکـەی لێدانـەکانی ئەزمونەکـەمان، ژیانمـان و بوونمان دەژمێرینەوە –بەڵام ئەفسوس! لـە پرۆسـەکەدا کۆی حساب لـە دەستدەدەین.. بـەم جـۆرە بەزەروورەت وەك تەلیسمێك بەخۆمان دەمێنینەوە، نشوست دەخۆین لـە خۆتێگەیشتنمان، مـەحکومین بەوەی هەڵـە لـەخۆمان بگـەین. رستە هەمیشـەکیەکەشمان دەڵێت: هـەموو یـەکێك لـە ئێمـە زیـاتر لـە خۆیەوە دوورە– سەبارەت بە خۆمان زانیاریمان نیە.

(2)

بیرۆکەکانم سەبارەت بە رەچەڵەکی راپێشوەختە رەوشتیەکان (کە مەبەستی ئەم کتێبە مشـت و مـڕ ئامێزەن) دەربڕینە سەرەتاییەکانیان لە کۆمەڵە پەندەکانی کتێبـی (مـرۆڤ دۆسـت زۆر مـرۆڤ دۆسـت: کتێبێك بۆ رۆحە ئازادەکان)دا دۆزیەوە.

لە سۆرێنتۆ **Sorrento** دەستم کردە نوسینی ئەو کتێبە، لە ماوەی زستانێك دا کە بواری هەڵوێستەکردنم هەبوو وەك چۆن ڕێبوارێك هەڵوێستەیەك دەکات، بۆ ڕووپێوکردنی ئەو مەودا بەرپلاوە ترسناکەی کە [illegible] تاوەکو ئەوکاتە ڕێگەی خۆی پێداکردبووەوە. ئەمە لە زستانی ***1876–1877*** [illegible] بیرۆکەکان خۆیان لەو مێژووە کۆنترن. لەبەر ئەوەی بەشی هەرە زۆری ئەو بیرۆکانەم لەم [illegible] خۆگرتووە، لەبەر ئەوە با ئاواتەخوازبین کە لەوکاتەوە پێگەیشتوترو پرشنگدارترو بەهێزترو [illegible] بوبن. بەڵام کە هێشتا تاوەکو ئەمڕۆ پابەندم بەو بیرۆکانەوە و کە بیرۆکەکان خۆشیان زیاتر لێکدانەبڕاو و زیاتر تێکەڵاو و ئاوێتە بوون –لە ڕاستیدا هەموو ئەمانە دڵنیابوونە شادەکەم بەهێزتر دەکات. بەدەر لەوەی کە دابڕاو و پەرش و بڵاون یاخود وەك دیاردەیەکی لێك پچڕاون، ئەم بیرۆکانە لە ڕیشەیەکی هاوبەشەوە گەشەیان کردووە لە ویستێکی بنەڕەتیەوە بۆ مەعریفە، ویستێك کە [illegible] قوڵاییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، بەشێوەیەکی [illegible] بەزلراوە ڕوونەکان دەدوێت [illegible] ڕوەکان [illegible] شتێکی [illegible]

[illegible] کردەوەیەکی [illegible]

[illegible] لە [illegible] ڕاستتری [illegible]

بەهاکانمان. بەڵێ و نەخێرەکانمان، گەرو ئەگەرەکانمان بەهەمان زەرورەت کە [illegible] دەگرێت لە ئێمەوە گەشەیان کردووە– هەموو پەیوەندیدارو پێکەوە گرێدراون و بەڵگە [illegible] ویستێك، تاکە دروستیەك، تاکە زەویەك و تاکە خۆرێك. سەبارەت بەوەش کە ئایا میوەکان بەدڵیرەی چێژی تۆن؟ بەڵام ئەوە بۆ درەختەکان چی دەگەیەنێت، ئەوە بۆ ئێمە چی دەگەیەنێت، ئێمەی فەیلەسوف.

(3)

من نیازێکی تایبەتی شاراوەم هەیە کە دوو دڵم لەوەی بیدرکێنم، چونکە پەیوەندیی بە ڕەوشتەوە هەیە، بەهەموو شتێکەوە کە تاوەکو ئێستا وەکو ڕەوشتی پایەدارکراوە، نیازێك کە هێندە نابیارانە، هێندە زوو و بەر لێنەگیراوانە تیامدا سەری هەڵدا، کە زۆر هاودژبوو لەگەڵ ژینگە، تەمەن، مۆدێل و ڕەچەڵەکەکانی ژیانم دا کە دەتوانم پێی بڵێم "پێشینە **Apriori**"ی خۆم. سەبارەت بە سروشتی ئەم نیازە شاراوەیە بۆم دەرکەوت کە فزولیەت و گومانم لەسەر پرسیاری ڕەچەڵەکی چەمکەکانمان لەسەر چاکەو خراپە ڕاوەستاون. لە ڕاستیدا وەکو کوڕێکی *13* ساڵ گرفتی ڕەچەڵەکی خراپە بیرکردنەوەمی داگیرکردبوو. لە تەمەنێکدا کە مرۆڤ "نیوە یاریەکانی منالّی و نیوە خودای لە دڵدایە" یەکەم کاری منالانەی ئەدەبیم، و یەکەم مومارەسەم لە فەلسەفەدا بۆ ئەم بابەتە تەرخان کرد، وەکو (چارەسەری) خۆم بۆ کێشەکە لەو کاتەدا، پایەی شایستەی بەخۆیم بەخشیە خوداو بە باوکی خراپەم دانا، ئایا ئەمە هەمان ئەو شتە بوو کە "پێشینەم **Apriori**" داوای لێدەکردم؟ ئەو "پێشینە" ناڕەوشتیە یاخود بەلایەنی کەمەوە کەم ڕەوشتیە نەفسوس! هێندە دژەکانتی **anti- Kantian** و هێندە "فەرمانێکی ڕەها" بوو لە ڕێگەی منەوە قسەی دەکردو منیش لەوکاتەوە هەستیار بوم بەرامبەری و زیاتریش لە هەستیار؟.. بۆخۆشبەختی لەوکاتەوە فێربووم تیۆلۆجی لە ڕەوشتی جیابکەمەوەو وازم هێنا لە بەدواداگەڕانی ڕەچەڵەکی خراپە لەودیو جیهانەوە. هەندێك پەروەردەی مێژوویی و فیلۆلۆجی پێکەوە

لەگەڵ هەستێکی ناوەکی جیاکاری کردندا سەبارەت بە کێشەکانی سایکۆلۆجیا، خێرا گرفتەکەمیان گۆڕی بۆ گرفتێکی تر: لەژێر کام هەلومەرجانەدا بوو مرۆڤ پێودانگەکانی هەڵسەنگاندنی بەهای چاکەو خراپەی داهێنا؟ و پێودانگەکان خۆشیان کامە بەهایان هەبوو؟ ئایا یارمەتیدەر بوون یاخود رێگر لە بەردەم پێشکەوتنی مرۆڤایەتی‌دا؟ ئایا نیشانەکانی هەژاری و داماوی و داڕمانی ژیانن؟ یاخود بەپێچەوانەوە نیشانەی دەوڵەمەندی، بەهێزی و ویستی ژیانن، ئازایەتی و متمانەو ئایندەی ئەو ویستەشن؟ بۆ ئەم پرسیارانە من چەندین وەڵامی ئازایانەم دۆزیەوە. من جیاوازیم کرد لەنێوان سەردەمەکان، خەڵکەکان، پلەوپایەی نێوان تاکەکان، و گرفتەکەمم بەرتەسك کردەوە. لەوەڵامەکانەوە پرسیاری نوێ، بەدوادلچونی نوێ،، گریمانەو ئەگەری نوێ سەریان هەڵدا: تا دواجار خاکێکی تایبەت بەخۆم، خۆڵێکی تایبەت بە خۆمم بەدەست هێنا، جیهانێکی گەشەسەندوی نەزانراو، وەکو باخێکی نهێنی کە کەس پەی بە بوونی نەبردبێت.. ئۆه چەندە بەختەوەرین ئێمە، ئێمەی شوێنکەوتوانی مەعریفە، بەو مەرجەی لەکاتی خۆیدا نەبێت بێدەنگیمان نەشکێنین.

(4)

یەکەم پاڵنەر کە گوزارشتی بەخشیە هەندێك لە گریمانەکانم لەسەر رەچەڵەکی رەوشت لە خوێندنەوەی کتێبێکی رون و پوختەوە بوو، کە تا رادەی کامڵ بوونی پێش وەخت زیرەکانە بوو. لەو کتێبەدا بۆ یەکەمجار رووبەڕوی ئەگریمانەیەکی جینالۆجیانەی پێچەوانەو ئاوەژو بوومەوە، جۆرێکی ئینگلیزی راستەقینە –خۆم بینیەوە کێشکراوم بۆ ناو کتێبەکە وەکو چۆن بەرامبەرەکان یەکتر کێش دەکەن. "رەچەڵەکی هەستە رەوشتیەکان" ناونیشانی ئەو کتێبە بچوکە بوو کە دانەرەکەی دکتۆر پۆل ری *Dr. Paul Ree* بوو، ساڵی *1877* ساڵی دەرکەوتنی کتێبەکە بوو. رەنگە هەرگیز هیچ شتێکم نەخوێندبێتەوە کە هێندەی ئەو کتێبە رەتم کردبێتەوە، مەسەلە دوای مەسەلەو بەرەنجام بەدوای بەرەنجام دا، بەبێ کەمترین بێ مەزاجی و بێ سەبری. لەو کتێبەم دا کە پێشتر باسم کردو کە لەو کاتەدا دەستم کردە نوسینی، بەوەخت و ناوەخت ئاماژەم دەدا بە مەسەلەکانی ئەو کتێبە، نەك بۆ ئەوەی پوچەڵیان بکەمەوە، من چ بەرژەوەندیەکم لە پوچەڵ کردنەوەدا هەیە! بەڵکو زیاتر، وەکو شتێکی شایستە بە رۆحێکی پۆزەتیڤ بۆ ئەوەی شتێك کە لەوانە نیە روبدات جێگە بگرمەوە بە یەکێك کە لەوانەیە رویدات، و هەندێك جاریش بۆ جێگە گرتنەوەی هەڵەیەك بە یەکێکی تر. لەوکاتە وەکو وتم، یەکەم جار ئەو گریمانانەم لەسەر جینالۆجیای رەوشتەکان هێنایە بەر تیشکی روناکی کە ئەم وتارانەی ئێستام بۆ تەرخان کردوون. من نازیرانە ئەو کارەم کرد، وەکو ئەوەی خۆم یەکەم کەس بم دان بەو راستیەدا بنێم، بەشێوازێکی هێشتا بەرتەسك، کە هێشتا زمانی تایبەتی خۆم نەبوو بۆ ئەم شتە تایبەتانەو بە دوودڵی و لە رێ لادانی زۆریشەوە. بە کورتی ئەوە بەراورد بکە کە لە کتێبی "مرۆڤ دۆست زۆر مرۆڤ دۆست"دا لە بڕگەی *45* دا لەسەر رەچەڵەکی دوالیانەی چاکەو خراپە دەیڵێم (واتا لە دونیای سەروەرو کۆیلەدا) هەروەها لە بڕگەی *136*دا لەسەر بەهای رەوشتی زاهیدانە، هەروەها لە بڕگەی *96*، *99*دا لە بەشی "بیرورا و گوتە تێکەڵاوەکاندا" و بڕگەی *89* لەسەر رەوشتی نەریت، کە جۆرێکی زۆر کۆنترو زۆر رەسەنتری رەوشتە، کە زۆر دوورە لە میتۆدی هەڵسەنگاندنی ئەویتر

ئۆستیەوە (الغیریة- *altruistic*) (کە تیایدا دکتۆر پۆل ری وەکو هەموو جینالۆجیستە ئینگلیزە ڕەوشتیەکان بەو چەشنە میتۆدی ڕەوشتی هەڵسەنگاندن دەبینێت)، هەروەها لە بڕگەی **92** کتێبی "گەڕیدە"دا، و بڕگەی **26** و بڕگە **112**ی کتێبی "بەرەبەیان"دا لەسەر ڕەچەڵەکی دادپەروەری وەکو پێکهاتنێك لە نێوان ئەو کەسانەدا کە زۆر بە نزیکی هاوتان لە دەسەڵاتدا (یەکسانی وەکو مەرجی هەموو پەیمانەکان، و لەسەرەنجامیشدا هەموو یاساکان)، هەروەها بڕگەی **22**، **23** کتێبی "گەڕیدە" لەسەر ڕەچەڵەکی سزا، کە بۆ ئەو مەبەستە ئامانجی ڕێگیری کردنە نە گەوهەری و نە بنەڕەتیە (وەك دکتۆر پۆل ڕی باوەڕی وایە -ئەوە دواتر زیاتر دەناسرێت، لەژێر چەند مەرجێکی دیاری کراودا، و هەمیشەش وەکو شتێکی لاوەکی و زیادکراو).

(5)

لەو کاتە تایبەتەدا، پەرۆشی ڕاستەقینەم بۆ شتێکی زۆر بایەخدارتر بوو وەك لە گریمانەکانی خۆم یاخود هی هەرکەسێکی تر لەسەر ڕەچەڵەکی ڕەوشت (یاخود زۆر بە وردی دوا بایەخپێدانم بە تەواوی وابەستەیی بە تاکە ئامانجێکەوە بوو، کە ئامرازێك بوو لە ئامرازەکانی گەیشتن بەو ئامانجە)، بەلای منەوە ئەوەی جێگەی گرەو لەسەر کردن بوو بەهای ڕەوشتی بوو -لەسەر ئەو کێشەیەش هیچ ڕێگەیەکم لەبەردەمدا نەبوو جگە لە ڕوبەڕووبونەوە بەتەنهایی لەگەڵ مامۆستای مەزنم دا شۆپنهاوەر. ئەو کتێبەم، سۆزی ئەو کتێبەم پوچەڵ کردنەوەی نهێنیانەی ئەو کتێبەم ئاراستەی ئەو کرابوو، وەکو ئاراستەی هاوچەرخێك کرابێت (چونکە ئەو کتێبەش مشت و مڕ ئامێز بوو). لە ئەنجام دا ئەو کتێبە لەسەر بەهای (ناخۆپەرستی)، غەریزەکانی سۆزو بەزەیی، نکوڵی لەخۆکردن و خۆکردنە قوربانی بوو، کە هەمان ئەو غەریزانە بوون کە سەردەمانێك شۆپنهاوەر کردبونیە زێڕین، خواوەندی، فرازمەند (متعالی) تا لە کۆتاییدا لەلای بوونە (بەها لەخۆیان دا) کە لەسەر بناغەی ئەوانەوە نکوڵی لە ژیان و نکۆڵیشی لەخۆی کرد. بەڵام بەرامبەر هەمان ئەم غەریزانە بوو کەوتمە گومانێکی بنەڕەتی پەرەسەندوەوە، گومانێك کە تا دەهات لە ناخم دا قوڵتر دەبووەوە! ئەو لێرەدا بوو مەترسی هەرە گەورەم بۆ سەر مرۆڤایەتی بینی، تراژیکی فریودان و تەفرەدانم بینی- بەرەو کام ئاراستە دەڕۆیشت؟ بەرەو پوچگەرایی؟ ئەوە لێرەدا بوو کە سەرەتای کۆتایی، چەقبەستن، شەکەتی نۆستالجیا ویستی وەرچەرخاوی دژی ژیان، خەمۆکیو نیشانە لاوازەکانی نزیکبونەوەی دوا دەردو نەخۆشیم بینی. ڕوانیمە پێشکەوتنی بێ ڕەحمانەی ڕەوشتی سۆزو بەزەیی، کە تەنانەت نەخۆشیەکەی فەیلەسوفەکانیشی ئالودە کردبوو، وەکو بەدترین نیشانەی پێشکەوتنی شومانەی کلتوری ئەورووپیمان، وەکو لاڕێیەك بەرەو کام ئاراستە دەڕوات؟ بەرەو بودیزمێکی نوێ ؟ بەرەو بودیزمێکی ئەورووپی؟ بەرەو نیهیلیزم؟ مەیلی مۆدێرنی فەیلەسوفان بۆ بەزەیی، زیادەڕۆیی لە نرخ پێدانیدا، گەشەسەندنێکی تازەیە، کە بێبەهاکردنی سۆزو بەزەیی بەهەمان شێوە پێشتر خاڵی ڕێکەوتنی فەیلەسوفان بوو. با تەنها ناوی ئەفلاتون و سپینۆزاو لاورشفوکۆو کانت بهێنین کە چوار بیرکردنەوەی تاڕادەیەك لەیەك جیاواز بوون، بەڵام لەیەك ڕووەوە یەکیان دەگرتەوە، لە قیزکردنەوە لە سۆزو بەزەیی.

(6)

گرفتی بەهای بەزەیی و رەوشتی بەزەیی (من نەیاری لاوازبوونی شەرمەزارانەی هەستیاریم لە رۆژگاری مۆدێرندا) لە یەکەم تێڕوانین دا وەکو تەنها مەسەلەیەکی دابڕاو دەردەکەوێت، وەکو نیشانە پرسیارێکی تاکوتەرا. بەلام هەرکەسێك لێرەدا رابوەستێت، هەرکەسێك لێرەوە فێری پرسیارکردنی بێت، ئەوا وەکو من بەهەمان ئەزموندا تێدەپەڕێت –ئاسۆیەکی بەرفراوانی نوێ لە بەردەمدا دەکرێتەوە، جۆرێ کیمیکانیەتێکی گێژەن ئاسا، هەموو جۆرەکانی بێ متمانەی، بەدگومانی و ترس بالی بەسەردا دەکێشن، و بڕوای بە رەوشتی و هەموو جۆرەکانی رەوشت لەق دەبێت. دواجار داواکاریەکی نوێ لە ناخیدا سەرهەڵدەدات. با ئەم داوا نوێیە روونبکەینەوە: ئێمە لە بەردەم پێویستیەکی نوێی بەها رەوشتیەکاندایین، پێش هەموو شتێك بەهای خودی ئەم بەها رەوشتیانە دەبێت بخرێتە بەر پرسیارکردن. ئەمەش پێویستی بە زانیاری هەل و مەرجەکانی گەشەسەندن و پەرەسەندنیان و گۆڕینیان هەیە (رەوشتی وەکو سەرەنجام، نیشانە، دەمامك، ریاکاری، نەخۆشیو هەڵەتێگەیشتنە، وەکو هۆکاریش، چارەسەر، ورياکەرەوە، چەپاندن، ژەهرە) مەعریفەیەکی لەو چەشنە هەرگیز پێشتر نە بوونی هەبووەو نە ئارەزوش کراوە. بەهای ئەم بەهایانە وەکو دراو (معطى)، وەکو راستی، وەکو شتێکی دوور لە گومان و پرسیار قبولکران. پێشتر کەس دورترین گومان و بچوکترین سڵەمینەوەی دەرنەبڕی بوو لە بەخشینی پلەوپایەیەکی گەورەتر بە (مرۆڤی باش) وەك بە (مرۆڤی خراپ)، پایەیەکی گەورەتر بەو واتایەی ئەو مرۆڤە بەسودە لە بەرزکردنەوەی ئاستی پێشکەوتنی بوونی مرۆڤدا (کە ئایندەی مرۆڤ دەگرێتەوە). چی؟ چی روودەدات گەر پێچەوانەی ئەمە راست بێت؟ چی روودەدات چی ئەگەر لە (مرۆڤی چاکدا) نیشانەیەك لە نیشانەکانی دارمان هەبێت، یاخود شتێکی مەترسیدار، فریودانێك هەبێت، جۆرێك ژەهر، مادەیەکی بێ هۆشکەر هەبێت کە بەهۆیەوە ئێستا لەسەر حسابی ئایندە بژین؟ هەرچۆنێك بێت رەنگە ئەوە بەجۆرێکی خۆشتر، بێ مەترسی تر بێت بەلام بە شێوازێکی نزمتر و بێ بایەخ تر بێت؟.. لەبەرئەوە گەر هەرگیز نەگەیشتینە بەرزترین و مەزنترین دەسەلاتی مرۆڤانە کە ئەوە خۆی لە خۆیدا شێمانەیەکە، ئەوا جگە لە خودی رەوشتی هیچی تر تاوانبار نابێت؟ لەبەرئەوە رەوشتی مەترسی مەترسیەکان پێك دەهێنێت.

(7)

هێندە بەسە کە بلێم، لەوەتەی ئەم ئاسۆیە لەبەردەمدا کراوەتەوە، هۆکاری خۆمم هەبووە بۆ چاوگێڕان بە دەوری خۆمدا بۆ کەسێکی زاناو بوێر و بۆ هاوڕێیانی ماندونەناس (من بەردەوامم لە کردنی ئەو کارە). ئەوەی پێویستە گەشتێکە بە مەودای پانو بەرینی رەوشت دا کە زۆر دوور زۆر

دووره دەستە (رەوشتێك كە بە راستی بوونی هەبوو كە بە راستی گوزەرێندرابوو، كەشتێك بە بـێ هیـچ شتێك جگە لە (توێشوی) پرسیارە نوێكان و چاوەكراوەكان، ئایا ئـەم (برە توێشووە) بـە شێوەیەكی پراكتیكی بەس نیە بۆ دۆزینەوەی ئەم ناچە بەرفراوانـە بـۆ جـاری یەكـەم؟... گـەر لـەو پرۆسـەیەدا كـە پێشتر باسم كرد لەناو هەمواندا دكتۆر (ڕی)م هاتەوە یاد، لەبەرئـەوە بـوو كـە هیـچ گومـانم نـەبوو كـە پێویست بوو لەسەری بەهۆی سروشتی خودی پرسیارەكانیەوە گەشـەبداتە میتۆدێكی زۆر دروسـتر بـۆ گەیشتن بە وەڵامەكان. ئایا من لەوەدا بەهەڵەدا چوو بووم؟ حـەزم دەكـرد هـەر چۆنێك بێـت ئـەو نیگا تیژو بێ لایەنەی بە ئاراستەیەكی باشتردا بەرم، بـە ئاراسـتەی مێـژووی راسـتەقینەی رەوشـتداو لـەكاتی خۆیدا ئاگادلری بكەمەوە لەو چەشنە گریمانەكردنە ئینگلیزیانەی لەسەر رەنگی شـین كـراون (مەبەسـت لە ئاسمانە- شتە خودلیەكان) چونكە بە ئاشكرا رەنگێكی تر هەیە كە دەشێت سەدان جار گرنگتر بێت بۆ جینالۆجیستی رەوشتەكان، كە ئەویش رەنگی خۆڵەمێشییە- لـەوەدا مەبەسـتم هـەموو ئەوەیـە كـە دۆكیۆمێنت كراوە، كە دەتوانرێت بە راستی بزلندرێت، ئەوەی كە بە راستی بوونی هـەبووە، بـە كورتـی سەرلپای ئەو دەقە هیرۆگلۆفیە دورو درێژەی كە زۆر دژوارە سەبارەت بە رابردووی رەوشتی مرۆڤایەتی مانالۆز بكرێت! ئەمە بـە نـەزانراوی بـۆ دكتـۆر (ڕی) مایەوە، بـەڵام ئـەو داریونـی خوێندبـوەوە- بـەم چەشـنە لـە ئەگریمانـەكانیدا لـە شـێوازێكدا كـە بـە لایـەنی كەمـەوە چێـژ بەخشـە، ئاژەڵـە داریونیەكـە بەشێوەیەكی شارستانیانە دەست بۆلای گیاندلرە رەوشتیە نەرم و نیانەكە درێـژ دەكـات، بـۆلای رۆحـە زۆر مۆدێرنەكـە كـە فـێر بـووە "نەكـەزێت". بـە گوزارشـتی ئەمـەی دوایيـان جـۆرە كـەیف سـازی و تەمەلیەكی پوختەكراو بەهۆی كەمێك رەشبینیەوە خراونەتـە پـاڵ یـەك: هـەروەكو ئـەوەی هـەموو ئـەم شتانە (گرفتەكانی رەوشت) لە راستیدا شایستەی بەجدی وەرگرتن نەبوبن. بـە پێچەوانـەوە بە بڕوای من لە ئێستەدا شتێكی تر نیـە جگـە لـەم مەسـەلەیە شایسـتەی گرنگـی پێدانـی جـدی بێـت: بـۆ نمونـە ئەگەری ئەوەی رۆژێك لە رۆژان دەسەڵاتی پێ بدرێت بـە رۆحیـەتێكی بـەرزەوە لـە كێشـەكانی رەوشـت نزیك بێتـەوە شایسـتەی پاداشـتەكانە. چونكـە، رۆحـە بـەرزەكان یـاخود بـەگوێرەی وشـەكانی خـۆم "زانسـتی شـاد" خـۆی لـە خۆیـدا پاداشـتێكە: پاداشـتێكە بـۆ جدیـەتێكی دورو درێـژ، ئازایانــە مـاندو نەناسانەو نهێنیانە، كـە بـە راسـتی لـە توانـای هـەمو كەسێك دا نیـە. بـەڵام لـەو رۆژەدا كـە لـە دڵـەوە دەڵێین "بۆ پێشەوە! هەروەها رەوشتی رابوردشمان بەشـێكە لـە كۆمیدیا!" لـەو رۆژەدا گرێژنەیـەكی نوێ و توانایەكی شاراوەمان دۆزیوەتەوە بۆ شـانۆگەری دیۆنیزی "چارەنوسـی رۆح": گرێژنەیـەك كـە شاعیری كۆمیدی مەزنی دێرینی بوونمان لێی بەهرەمەند دەبێت، رەنگە تۆ پشت بەوە ببەستیت.

(8)

گەر ئەم دەقە دەقێكی قورس بێت لەلای هەركەسێك وەگران بێتە بـەرگوێ وەكـو مـن بـزانم لۆمـەی ئـەوە ناكەوێتـە سـەر من. دەقەكـە تـەواو رونـە، بـەڵام رەنگـە ئـەو كەسـە كۆششـێكی زۆری لەگـەڵ

نوسینەکانی پێشومدا کێشابێت، چونکە بەراستی ئەو نوسینانە دژواریەکانی ئەم دەقەن. بۆ نمونە کتێبی "زرادەشت"م تەنها کەسێك بە بۆچوونی من دەتوانێت بانگەشەی زانینی تەواوەتی ئەو کتێبە بکات کە هەموو وشەیەکی لە کاتێکدا بە قوڵی زامداریان کردبێت لە کاتێکی تردا بەهەمان شێوە بە قوڵی شادمانیان کردبێت: چونکە تەنها ئەوکاتە دەتوانێت ئیمتیازی پشکداری لە رەگەزی هێمنانەی Halcgonic دەقەکەدا بکات کە لەو رەگەزەوە کتێبەکە لە دایك بوو، بە پرشنگی خۆرئاساو، ئاسۆفراوانی و رەهاییەکەیەوە. لە هەندێك باری تردا، شێوازە چەند ئامێزیەکەی کتێبەکە چەند گرفتێك دروست کات، ئەمەش لەو راستیەوە رێچکە دەگرێت کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئەو جۆرەشێوازە زۆر بە جدی وەرناگیرێت. شێوازێکی پەندئامێز کە بە جدی خرابێتەوەو خەفەکرابێت، هێشتا بە جۆرێك لە جۆرەکان دوورە لەوەی لەگەڵ خوێندنەوەیدا مانادۆز بکرێت، ئەوە تەنها کاتێك دەبێت کە دەستکرابێت بە راڤەکردنی، و بۆ ئەمەش پێویست بە هونەری راڤەکردن دەکات. لە وتاری سێهەمی ئەم کتێبەدا مۆدێلێکم پێشکەش کردووە لەوەی کە لە (راڤەکردن) مەبەستمە لەو بارەدا وتارەکە بە پەندئامێز دەست پێدەکات و خۆشی لێدوانێکە لەسەری. بەشێوەیەکی نکوڵی لێنەکراو، پیادەکردنی خوێندنەوە وەکو هونەرێك بەم رێگەیە لەسەرو هەموو شتێکەوە پێویستی بە تاکە شتێکە، کە شتێکە ئەمڕۆ لە هەر کاتێکی تر زیاتر فەرامۆش کراوە -کە ئەویش ئەو راستیەیە کە رونی دەکاتەوە بۆچی دەبێت زەمەنێك بەسەر نوسینی نوسراوەکانمدا تێپەڕێت پێش ئەوەی بتوانرێت بخوێندرێتەوە- ئەوەش شتێکە پێویست بە مانگابوونی مرۆڤ دەکات بێگومان نەك بوونە "مرۆڤی مۆدێرن"، کە واتای "کاوێژکردن" دەگەیەنێت.

سیلس ماریا، ئەپەر ئینگادین، ئەموزی *1877*

# 3-لەکتێبی (ئەودیو چاکەو خراپە)وە

## لە کێوە بەرزەکانەوە

■ فریدریش نیچە

● و: ئاشنا

### سەرەتای - سروود*

ئەی نیوەڕۆی ژیان! ئەی کاتی جەژن!

ئەی باغی هاوینە!

لە خۆشحاڵیا لە پێستی خۆمدا جێم نابێتەوە.

وەستاو و نیشککرو چاو لە ڕێگەم

شەو و ڕۆژ چاو لە ڕێگەم، چاو لە ڕێگەی دۆستانی خۆم:

لەکوێن، ئەی دۆستان! سەرکەون! کاتیەتی! کات!

مەگەر بەختی ئێوە نییە کە ئەمڕۆ بەفرستانی خۆڵەمێشی

خۆی بەگوڵی سوور ئارایش داوە؟

سەروچاوە بەدواتانەوەیە،

هەور و با بەشەوقەوە خۆیان لە ئامێزی یەکتری دەگرن و بێ قەرارن

تا خۆیان لەسەر ئەو تاقە نیلییەوە هەڵکێشن

و لەدوور دەستترین دیدگای باڵندەکانەوە چاو بەدوای ئێوەدا بگێڕن

سفرەکەم بەختی ئێوەی لە بەرزترین بەرزاییدا ڕاخستووە

کێیە کە لەگەڵ ئەستێرەکان نزیکتر لەمن دەژیی

یان لەگەڵ تاریکترین قووڵایی قووڵ؟

ئەوەیە پاشایەتی من- و کامە پاشایەتی لەوە فراوانتر بووە؟

و هەنگوینم -بڵێ؛ ع کەسێ تامی کردووە؟

ئێوه لەوێن، هەڤالانم، بەڵام ئەفسوس کەمن ئیتر ئەوە نیم کە
ئێوە بەدوایدا هاتوون!
درەنگی دەکەی و سەرگەردانی -ئای خۆزگە تووڕە دەبوون!
من -ئیتر ئەوە نیم! دەستێکی ترم، قاچێکی ترو روخسارێکی تر؟
من ئەو کەسە نیم کە لەبەر چاوی ئێوەی هەڤاڵان بووم؟
بووم بەیەکێکی تر! نامۆ لەگەڵ خۆ؟ لە خۆ راپەڕیوو؟
زۆرانبازێك کە بە زۆر پشتی خۆی لە زەوی داوە؟
زۆر لەگەڵ خۆ ئاڵۆز
بریندارە بەهۆی سەرکەوتنی خۆی و رێی لە خۆ گرتووە؟

مەگەر خوازیاری جێگەیەك نەبووم کە با لە هەموو شوێنێك تیژتر بەوێدا تێدەپەڕی
مەگەر فێرنەبووم بەسەربردن لەشوێنێك دا
کە هیچ کەس لەوێ بەسەر نابات،
وەك ئەو بیابانەی کە خانووی ورچی جەمسەرییە،
لە یادی کردووە مرۆڤ و خواو نزا و نەفرەت؟
وەك خێوێ سەرگەردان بەسەر بەفرستانەوە؟
-ئەی هەڤالانی دێرین! چەند رەنگ پەڕیو دێنە بەرچاو،
پڕ لە خۆشەویستی و بێزاری!
نا، بگەڕێنەوە! بەڵام تووڕە مەبن! لێرەدا - ئێوە ناتوانن بمێننەوە:
لێرە، لە نێوان دوورترین بەفرستان و بەردەڵاندا-
لێرە دەبێ راوکەرو نێرییە کێوی بن.

من بووم بە چ راوچییێکی شەڕاوی
سەیری راکێشانی کەوانەکەم بکەن!
پیاوی پیاوانی دەوێ راکێشانی ئەم کەوانە!
بەڵام باسی تیر مەکە کە تیرێکی وا ترسناکە
کە هیچ تیرێك نایگاتێ
دوورکەوە لێرە - بۆ سەلامەتیی خۆت!

رووم لێ وەردەگێڕی؟
بەڵام تۆ چەندە بە توانای، ئەی دڵ!
هیواکانت لە جێی خۆ ماون،
دەرگاکان بەرووی هەڤاڵانی نوێدا بکەرەوە!
واز لە دۆستانی کۆنت بێنە! واز بێنە لە یادگارییەکانی رابردووت!
رۆژگارێك لاو بوویت، بەڵام ئێستا لە هەمووکات لاوتری!

ئەوەی رۆژگارێك ئێمەی بەیەکەوە دەبەستەوە، زنجیرەی هیوایەك بوو.
بەڵام (ئێستا) کێ دەتوانێ لە وێنە رەنگ پەڕیوەکانیا
ئەو نیشانانە بخوێنێتەوە کە رۆژگارێك بەدەستی عیشق
نەخشرابوون؟
نووسراوی سەر پێستێك دەنگ پەڕیو و سووتاو بێت
کە دەست لە گرتنی خۆ دەبوێرێ

ئەوانە ئیتر دۆست نین
کەواتە چ ناوێکیان لێ بنێین؟ -تارماییەك لە دۆستان؟
هەمان تارمایی کە شەوانە لە دەرگای دڵ و پەنجەرەکەم
دەدات، کە سەیرم دەکات و دەڵێت: "مەگەر ئێمە سەردەمێك دۆست نەبووین؟"
ئای، ئەی وشە سیس هەڵگەڕاوەکان، رۆژگارێك بۆنی خۆشی گوڵە سوورتان لێدەهات!
ئای، ئەی شەوقی لاوێتی کە خۆت نەناسی
ئەوانەی من حەزم لێ دەکردن
حەزم لێ دەکردن
تابێن بە خزمم،
پیربوون و لە من دوور
تەنیا ئەوەی دەگۆڕێت، خزمی منە.
ئەی نیوەرۆی ژیان! ئەی لاوێتی‌ی دووەم!
ئەی باغی هاوینە!
لە خۆشحاڵیا لە پێستی خۆمدا جێم نابێتەوەو

وەستاوم و ئێشککر و چاو لە رێگەم!
شەوو رۆژ چاو لە رێی دۆستانم،
ئەی دۆستانی نوێ، وەرنە سەرەوە!
کاتیەتی!
کات!

* * *

سروود کۆتایی هاتووە
هاواری شیرینی حەزێ لەسەر لێوانم خەم دایگرتووە:
جادوگەرێك ئەوەی لەگەڵما کرد، ئەو دۆستە بەوەختە
ئەو دۆستە نیوەڕۆییە–
ئەو، مەپرسن ئەو کێیە.
نیوەڕۆ بوو کە یوو بە دوو...
ئێستا، دلگەرم بەسەرکەوتنی خۆمان،
لەگەڵ یەکتر جەژن دەگێڕین.
جەژنی جەژنەکان:
زەردەشت، دۆستی من، ئەوسەری مێوانان، لە رێگەوە گەیشتووە!
ئێستا جیهان خەندەدارە و پەردەی ترس هەڵدەدڕێت،
رۆژی بووك و زاوایەتی رووناکی وتارێکی هاتووە...

پەراوێز:

* *Nachgesang*

سەرچاوە:

فریدریش نیچە، فراسوی نیك و بد، ترجمە داریوش اشوری، انتشارات خوارزمی، چاپ دوم، تهران، **1373**، صص **291-296**.

# 4-لە نامەکانی نیچەوە

## چەند نامەیەکی نیچە

- و. لەسویدیەوە: ئیدریس ئیبراهیم کەلالەیی

**نیچە لەگەڵ ئەوەی ڕۆشنبیرێکی بێ وێنەی سەتەکانی خۆی بو، هەردەم سەرقاڵی خوێندنەوەو نوسین و وانە وتنەوە بوو، گەرچی لەبواری پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیش دا رۆڵێکی باڵای هەبووە، هەمیشە ویستوویەتی ئاڵقەی هاوڕێ یەتی‌و دۆستایەتی فروان بێ‌و بیروڕایان لەگەڵدا بگۆڕێتەوەو لەکاتی تەنگانە دا پرس‌و ڕایان پێ بکات.**

**تا ئێستا نامەکانی نیچە بەزۆربەی زمانەکانی دنیا بڵاوکراونەتەوەو ڕۆڵی خۆیان دیوەو بۆ دیاریکردنی ڕووە نەدیوەکانی نیچەو شیکردنەوەی ئەو پەیوەندیانەی کە هەیبووە لەگەڵ رۆشنبیرانی ئەو کاتە هەروەها شیکردنەوەی لایەنە دەروونیەکانی نیچە کە بەتەواوی لەکتێبەکانیدا ناخوێنرێتەوەو نەینووسیون- نامەکانی سەرمایەکی گەورەی ئەون‌و دەیان لێکۆڵینەوەیان لەسەرکراوە ((کارل یۆراڵ ئیکێرولد *Carl- Goran Ekerald* هەستاوە بەوەرگێڕانی زۆربەی نامەکانی بۆسەر زمانی سویدی‌و لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوون‌و لێکی‌داونەتەوە لەکتێبێکدا لەساڵی *1993* لەژێر ناوی (نیچەو ژیانی‌و شێوەی بیرکردنەوەی) بەچاپی گەیاندوون‌و. من لێرە تەنیا چەند نامەیەکم بۆ کردوون بەکوردی- بۆ ئەوەی نوسەرانی کورد خۆیان، نیچە لەناو نامەکاندا بخوێنەوە.**

**نامەی یەکەم:** ئەم نامەیەی لە ساڵی ***1864*** کەلەتەمەنی (***19***) ساڵیدابوە بۆ دایکی نووسیوە

دایکی خۆشەویستم:

ئەمڕۆ کاتێ ئەو نامەیەت بۆ دەنووسم، ناخۆشترین ئەرکە کە هەمە، زۆر سەختە بۆم‌و ناشزانم دەمبوری یان نا، پێت خۆشە یان نا، بەدڵێکی غەمبارو بەزارەوە دەست دەدەمە قەڵەمەکەم و بەتایبەتیش بیر لە ڕۆژانی پێشووی ((لەخاچ دانی مەسیح)) دەکەمەوە کەپێکەوە بووین‌و، هیچ ناخۆشیەکمان نەبوو.

هەروەها شەممەی ڕابردوش خواردمەوە، من هیچ پاساوێکم نییە، نازانم جەستەشم بەرگە دەگرێ‌و ئەو پاش نیوەڕۆیەش کەمێك دڵ خۆشم دەکات. شەممەی ڕابردوو کە گەڕامەوە قوتابخانە مامۆستا

کێرۆن ((Kern)) گرتمی‌و برنمیه لای قەشەو فرنیدامە قۆناغی سێیەم‌و ئەوکاتژمێرەیشی لێسەندمەوە کەتایبەتە بەپیاسەی شەممان. وەك تۆ تێدەگەم غەدرێکی گەورەم لێ کراوەو خەمبارم، لەهەمووشی ناخۆشتر ئەوەیە کە تۆ لەو بەسەرهاتە ناخۆشە ئاگادار دەکەمەوە..

بەزووترین کات بۆم بنووسە زۆر تامەزرۆم. ئەو نامەیەی تۆ بەهایەکی هەیە بۆم‌و هیچ کەسێك لەمن زیاتر نازانێ چەند دەستکەوتم لەو نامەیە دەبێ. پێویستیش بەوە ناکا دڵنیات بکەم، کە من ((عەقڵم)) کۆدەکەمەوە. هەموو شتێك پەیوەندی بەوەوە هەیە - تا دێت من دڵنیاتر دەبم‌و لەو مسۆگەریەشدا ئێستا لەباڵاترین شێوەی ترساندام.

لیچە

**نامەی دووەم:**

باسێك: هەینی 14 مارس 1876

مامۆستای بەرێز مات هیلد تراپ داخ

چوار رۆژی رابردو بەتەنیا لە دەریاچەی (جنێف) بەسەرم برد. لەو چوار رۆژە رۆژێکیان شەممە بوو، ئەو رۆژە لەبەیانی زووەوە تا دەرەوشانەوەی مانگ لەئێوارە، لەنزیك ئێوە ژیام‌و بەرۆحێکی وشیارانەوە، کتێبەکەی ئێوەم لاپەڕە بەلاپەڕە لە سەرەتاوە تا کۆتایی خوێندەوە بەهیچ شێوەیەك نەم دەتوانی وازی لێ بێنم‌و چەند بارەم دەکردەوە. هەرگیز ئەوەندە بەقووڵی نەچوومەتە ناو بابەتێك‌و شەممەیێکی واخۆشم بەسەر نەبردوە، کەشێکی پاك‌و خۆشەویست منی بەجێ نەهێشت، سروشتی ئەو رۆژە هیچی تر نەبوو بێجگە لە ڕەنگدانەوەی ئەوکەشە پاکە. تۆ بەبەردەممدا ڕەت دەبووی، وەك شێوەیەکی ((بەرزی من)) زۆر بەرز، تۆ لەجیاتی خەم، زیاتر جورئەتت پێ دەبەخشیم. دڵ‌و دەروونت داگرتبووم. کاتێ من ژیانی خۆم بە تۆ بەراورد دەکرد، زۆر بەروون‌و ئاشکراتر هەستم بەوە دەکرد کە لە چیم کەمە.

ئەمە بۆمن زۆر زۆرە.

نەخۆش بووم‌و دوودڵ بووم لەتوانا‌و ئامانجەکانم و گەیشتمە ئەو ((قەناعەتەی)) کە پێویستە خۆم هەموو شتێ دووربگرم، ئەوەی زیارتیش لێی دەترسام، ئەو ژیانە درێژەیە کە تەنیا بارێکی قورسەو لە هەمان کاتیشدا پێویستە مرۆڤ واز لە بەرزترین ئامانج بێنێ، بەڵام من ئێستا باشترو ئازاد ترم. ئەو ولجبانەی بەجێم هێشتبوون، ئەتوانم جارێکی تر لەنوێوە لەچاوەکاندا بێ دوودڵی بیبینم. چەند جاریش خۆزیایی ئەوەم خواستوە کە تۆ لەنزیکمەوە بی‌و بۆ ئەوەی پرسیارت لێ بکەم، کە تەنیا بەرزترین ڕەوشت‌و ژیانێکی تر لە ((من))دا ئەتوانی وەڵامێکی حەتمیانە بداتەوە. کتێبەکەی ئێوەش

وەلامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە. کە پەیوەندیان بە منەوە هەیە. من لەو باوەڕەدام هەرگیز ناتوانم ڕازی بم لەگەڵ کارەکانم، ئەگەر لە سەرەتادا ڕەزامەندی تۆم نەبێ، بەلام ئیمکانی ئەوەش هەیە، کە کتێبەکەی ئێوە توندتر حوکمم بدەی لەوەی تۆ خۆت حوکمم بدات، ئایا مرۆڤ دەبێت ڕوو لەکوێ بکات، بۆ ئەوەی ژیانی خۆی لەگەڵتانا بەراورد بکات، ئەگەر ئەو نەیەوێت وەك مرۆڤێك خۆی نیشان بدات؟ من ئەو پرسیارە دەکەم. ئەو پێویستە شتێك نەکات کەمتر بێت لەوەی تۆ کردووتە. بەلام بەبێ دڵەڕاوکێ ئەوە ئیمکانی نیە. هەوەسەکانی خۆشەویستی بڕیار لەسەر ئەوە دەدات کە هەمیشە ئامادەیە خۆی بکات بە قوربانی.

یەکێك لەمەرجە بەرزەکانی من کەلەسایەی تۆوە تێ ڕوانینێکم دەربارەی پەیدا کردوە.، ئەو خۆشەویستیە دایکانەیە، بەبێ هەبوونی پەیوەندێکی جەستەیی نێوان دایك و کوڕیە.

من لەوێوە یەکێك لەباشترین مانیفێستەکان دەبینم کە کتێبەکەی تۆ هۆکاری بووە.

هاوڕێ بەنرخەکەم هێندێك لەخۆشەویستی خۆتم پێ ببەخشە، لەناخی مندا ئەو شوێنە ببینە کوڕێك لەبالاترین پلە پێویستی بەو جۆرە دایکەیە!.. بۆچی من لەنزیکی ئێوە نەژیم! لەڕاستیدا هێشتا من لەئێوەم.

فردیدریش نیچە

نامەی سێیەم:

1ی مارسی 1881

بەڕێز رود (Rohde)

بەڵێ، سەیرە کە بژێو وچەسوری لەدەست نەدەی. من چەندین جار لەوحاڵەتەدا بوویمە، کە لەدڵەوە حەزبکەم دوور لە هاوڕێ (رود)ی چاپووك نەبم تاقە کاتێك نەشکاوەکەی بەتەمەن و گەشاوە بکەم لەکاتی پێویست بوونا بەهێزێکی خوێنی نوێ، نەك خوێنی بەرخ بەڵکو خوێنی شێر –

بەلام ئەو خۆی لەناو کتێب و خێزاندا لە توبینگین ((Tubingen)) شاردۆتەوە. کە بۆ من لەهەموو حاڵەتێکدا ئاسان نییە، چاوم پێ بکەوێ. ئاخ، هاوڕێم، ئەتوانم سەمات لەگەڵدا بکەم بۆ ئەوەی چەوریەکەت کەم بێتەوە، یان وەك هەریەکێکیان دەزانین کە شتەکە تاقی بکەینەوە، لەخوێنی خۆیان بخۆینەوە. ئەوە هەم بۆ ئەوەی تینوونەبن بەئەوای خۆیانداو هەمیش خۆیان خاڵی نەکەنەوە. لەهەموو هەنگاوەکان سەرم سووڕدەمێنێ. چونکە ئێستا ئەوە لەبەردەمی تۆدا دەوەستێ– ئایا چەند سەرچاوەی مرۆڤ وازلێنن بۆ ئەوەی لاقاوی خۆیان ببات؟

ئەوکەسەش لەگەڵدا بێ کە لەمن دەچێ سەریە دەوڵەمەندترینیانن.

ئەگەر من هەموو ئەو خاسیەتانەم هەبولیە، کەتۆ بەبالآم دەبری، ئەوامن لەوباوەڕەدام ئەبولیە چاوترس و توانا پروکێن بوومایە.

لەئێستاوە ئەو چاوتروکانە هەیە، کەمن بەدەوری بەرزاییەکانی جێنو ((Genua)) خول بخۆمەوەو سەرنجیان لێ بدەم و هەروەها هەبوونی ئەو هەستانەی کە لە هەستەکانی ((کۆلۆمبۆس))ی پیرۆز دەچن کە جارێك لە جاران بەرانبەر دەریاو ئاینده هەیبووە.

لەو جۆرە ساتە ئاسپاییو هەڵخەڵەتەنەرانە، پێویستە من هەوڵ بدەم لەنوێیەوە کەشتی ژیانی خۆم بگەڕێنمەوەو هاوسەنگی بکەم. لەوانەیە تۆ باوەڕ نەکەیت کەمن چەندین ڕۆژو سەعات بێپسانەوە لەگەڵیا وەستاوم، بۆ ئەوەی زیاتر قسە نەکات. من لەڕاستیدا هەموو شتێك دەکەم، کە مرۆڤ لەحاڵەتی مندا دەیکات، تا ئەوکاتەی ((ژیری)) مرۆڤ لەپراکتیکی ژیان و حاڵەتی نەخۆشییەکانی تەندروستی وەدەتوانێ کەمی بکاتەوە– هەڵبەتە من لەوحاڵەتەدا یان ((بێبیرم)) یان بێ خەیاڵ– بەڵام دووبارە ئارەزووی ئەوگۆرانییە ناکەم، کە هەست دەکەم لەگەڵی ڕاهاتووم چونکە هەست دەکەم پێکەیشتووم.

هاوڕێ خۆشەویستەکەم تۆ بۆم بەنرخی، بەو جۆرە (گرێ کوێرە)نیت، کە مرۆڤ پێویست بکات خۆی باریك بکاتەوە. تا پیا تێپەڕێت.. ئەوە پێویستە هێزێکی تر بێ بۆ من ئەگەر ئەو جۆرە هاوڕێیە کەپێویستە یارمەتیم بدەی، تا باوەر بەخۆم پەیدابکەمەوە– ئەگەر تۆ لەپشتی ئەو وشانەی نزای نامەیەك خۆت شاردۆتەوە، ئەوا من لەدڵەوە حەزدەکەم بۆ جارێك کەسایەتیکی ڕاستەقینەی تۆم لەبەردەستدا بێ. نەك بۆئەوەی تەنیا من لەدڵەوە هاوڕێ دێرینەکەم (رود) بناسم، بەڵکو پێویستە هاوڕێی ئێستاش بناسم و چی تریش زیاترە لە گەشەو ئارەزوو: بەڵێ گەشەو ئارەزوو.

لەناخی دڵەوە سڵاوم بگەیەنە هاوسەرە خۆشەویستەکەت، پێویست ناکات خەمبار بێ بۆم. چونکە تائێستاش ئەو ناناسم، جارێك لەوانەیە تۆڵەی گشتی بۆ بکەمەوە.

نیچە

نامەی چوارەم:

ئەم نامەیە بۆ ئۆفێربێك ((Overbeck))ی هاوڕێ نووسیوە بەدوای تەواو بوونی بەشی یەکەمی کتێبی ((زەردەشت)) کە لە ساڵی **1883** دەستی پێکردوەو لەساڵی **1885** دا تەواوی کردوە.

بەرێز ئۆفێربێك

من بیر لەشێتایەتی کۆتاییم دەکەمەوە، مەبەستم ((زەردەشتە)) ئایا ئەتوانرێت ئەم دەقە بخوێندرێتەوە؟ من وەك بەراز دەنووسم...

چەند رۆژێك تێ ئەپەڕێو بیری لێ ناکەمەوە، بەڵام بیر لەوە ئەکەمەوە، ئاخۆ کتێبەکە هیچ بەهایەکی هەیە– من خۆم لەم زستانەدا توانایی هیچ هەڵسەنگاندێکم نییەو لەوانەیە بەهایەکان‌و بێبەهاکان بەهەڵەیەکی کوشندە لێك بدەمەوە– بەڵام خراپتریش لەوە، ئەوەیە من هیچ تێ ناگەم بۆ چ مەبەستێك ئێستا دەژیم‌و نیو ساڵە هەموو شتێك لەلام پەرێشانی‌و ئازارە، خۆم ئەکەم بەقوربانی‌و ئازاری زۆر دەچێژم‌و بۆچوونێکم سەبارەت بە کەم‌وکوری‌و ناخۆشییە ڕاستەقینەکان هەیە، کە هەمیشە بەدوای رۆحی دابڕنووەمەوەن. کە بەسەر هەموو وشیاریمدا زاڵە‌و داپۆشیوە‌و هیچ شتێك نییە بیکەم بەرانبەر ئەو شتە، من هەمیشە لێکۆڵینەوەی شتێك دەکەم کە باشتر بێ.. ئایا ئەبێ چ دەر ئەدجامێکی هەبێ؟

**نامەی پێنجەم:**

به مۆری 5ی کانوونی دووەمی *1889*

برای خۆشەویستم پرۆفیسۆر ((یاکوب برخ هارت))

لەکۆتاییدا، لەدڵەوە حەز دەکەم پرۆفیسۆر بم لە باسێك لەبەرئەوەی (خوا) بم. بەڵام جورئەتم نەکرد خۆپەرستی تایبەتی (*Privategoism*) خۆم تا ئەو ئاستە رابکێشم‌و بتوانم شتەکە ئاسان بکەم‌و جیهانێك بخوڵقێنم.

ئێوە سەیر کەن، مرۆڤ چۆنەو چۆن دەژی‌و پێویستە چ قوربانییێك بدات. من ژوورێکی بچووکم رێك خستووە، دەکەوێتە بەرانبەر هوتێلی (کاریگنە نۆی).

–هەروەك (ڤیکتۆر ئیمانوێل) منیش لەوێ لەدایك بووم– هەروەها (خووم) بەوەوە گرتووە کە لە سەر مێزی کارکردنەوە. گوێ لەو موسیقا پڕجۆشە بگرم کە لە ژێرەوەی ((گەلەری سوبەلتیناوە)) دێ. بیست و پێنج (فرەنکم) بۆ خزمەت کردن تەرخان کردووەو خۆشم چاکە ئامادە دەکەم‌و پێداویستەکانیش دەکڕم. بەداخەوە گورەویەکانم دڕاوەو لەهەموو چاوترووکانێکیشدا سوپاسی ئاسمان دەکەم بۆ ئ و جیهانە کۆنە ((کەپێی بەخشیوین)) بەڵام مرۆڤ بە تەواوی بەشێوەیەکی ئاسایی ئامادە نەکراوە بۆی. من حوکم دراوم کە کاتە بێ کۆتایەکان‌و گاڵتەو گەپەکان پارێزگاری لێ بکەم. هەربۆیەش من قەڵەمێکم هەیە، کە لەراستیدا هەر شتێك ئارەزوو بکات، جێی ناهێڵێ، تۆرێکی کارکردنەو هیچ گوشارێکیشی لەسەر نییە.

نامەکان بۆ نووسەرە جیاجیاکانی جیهان لەو پۆستەوە دەنێرم کە پێنج هەنگاو لێم دوورە. هەڵبەتە پەیوەندییەکی زۆر نزیکیشم لەگەڵ فیگارۆ (*Figaro*) هەیەو ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ئێوە (مەفهومێك) وەرگرن کە من چەند بێ زیانم.

لێرەوە ئەم دوو گاڵتەو گەپەیەم ببیستن لەلای خۆتان ئازاری پرادۆ(*Prado*) مەدەن ئەوەك بکەوێت من (پرادۆم). هەروەها باوکی پرادۆشم. هەروەها جورئەتیش دەکەم بڵێم من (لێسیپس *Lesseps*)م دەمەوێ مەلهومێکی نوێ بەخەڵکی پاریس بدەم، کە خۆشم دەوێن، ئەویش ئەوەیە ئەوان تاوانبارە ڕاستەقینەکان.

بەهەمان شێوە من ((کام بێیج *Chambige*))م هەروەها ئەو تاوانبارێکی ڕاستەقینەیە.

گاڵتەی دووەم: سڵاو لەنەمرەکان دەکەم. مۆنشیور داودت، ((*Monsisur Daudet*)) سەر بەئەکادیمی چلەکانەوەیە، چلەکان.

**ئیمزا (ئاستو)**

**تێبینی:**

*1*–فیگارۆ: ڕۆژنامەیەکی فەرەنسی کۆنسەرڤاتیڤەکان بوو.

*2*–پرادۆ: حوکم درا بەمردن، چونکە ژنێکی داوێن پیسی کوشتووە.

*3*–کام بێیج: لە جەزائیر ژیارەو خۆشەویستەکەی خۆی کوشتووەو خۆشی زامدار کردووە.

*4*–لێسیپس: سەرپەرشتی دروست کردنی پڕۆژەی کەناڵی سوێسی کردوە.

# وێستگەکانی سەردەم

- کۆتایی فۆکۆیاما
- فەلسەفەی دیالەکتیکی پێشکەوتن و دواکەوتن
- مەرگە سەیر و سەمەرەکەی پوشکین
- رۆمانی (کوورەکە) و پیس بوونی هەرزەکاران

# کۆتایی فۆکۆیاما..؟

■ عەبدە وازن

● و: شوان

هاوکات لەگەڵ دەرچوونی کتێبە تازەکەیدا (دادڕانی مەزن) فۆکۆیاما دڵنی بەوەدا نا کە تیۆرییە بەناوبانگەکەی لەمەڕ (کۆتایی مێژوو)، ئەو تیۆرییەی دە ساڵ لەمەوبەر مشتومڕێکی سیاسی و فیکری گەورەی نایەوە، لەسەر گریمانەیەکی هەڵە دامەزرابوو. لەبەرئەوەی مێژوو ناشێت کۆتایی بێت مادام لەکی زانستە سروشتیە هاوچەرخەکان لەوپەڕی گەشەکردندان و، ئەو کۆتاییەشی مەزەندە دەکرا جگە لە تەواوبوونی قۆناغێك و سەرەتای دەستپێکردنی قۆناغێکی دی شتێکی تر نیە.

ئەم نیعتیرافەی فرانسیس فۆکۆیاما (ئەگەرچی نیعتیرافێکی رەنگ رەختیشە) بە نادروستی گریمانەکەیی و، بگرە بە دەستەوەستانیشی لە چەسپاندنی بیرۆکەی مێژووی ئاراستەکراو رووەو مۆدێلە بەرزو بالاکەی کە دەوڵەتی نیو-لیبراڵە، مانای پاشەکشەکردنی نیە لە تیۆرییاکەی یاخود لەبەردەم ئەو شالاوە رەخنەییانەدا چۆکی دادابێت کە دە ساڵە رووبەڕووی دەبێتەوە.

ئەوەتا فۆکۆیاما خۆی لە پشت هەندێك لەو بیریارو فەیلەسوفانەوە دەشارێتەوە، کە ناتوانێت بە ئاستی ئەوان بگات. بۆ نموونە ئەو زاراوەی (مێژوو)ی بە مانا هیگڵی و مارکسیەکەی بەکار بردووە، هەروەها دان بەوەشدا دەنێت کە چەمکی (دوایین مرۆڤ)ی لە نیچەی فەیلەسوفی ئەڵمانیەوە وەرگرتووە. فۆکۆیاما بێ پەروا لە هەوڵی ئەوەدایە بێتەوە بەر رێگەی سیاسی و فیکری، تەنانەت گەر نرخی ئەم گەڕانەوەیشی دڵنیان بێت بە هەڵەی خۆیدا، هەڵەیەکی ئاسایش نا بەڵکو هەڵەیەکی ئێجگار گەورە! بەڵام نیعترافێکی وەها لە خۆڕاو کارێکی نیاز پاکانە نیە، بەڵکو ئەم هەڵەی بۆ ئەوە قۆزتەوە تا تیزە تازەکانی لە دوو توێی کتێبەکەیدا (دادڕانی مەزن) بخاتەڕوو.

فۆکۆیاما لەم کتێبەیدا (وەکی عادەتی خۆی) درەنگ وەختێ ئەوەی بۆ ئاشکرا دەبێت کە شۆڕشی (زانیاری) وەك شۆڕشی (پیشەسازی) لە رابردوودا، بۆتە مایەی شێواندنی بەهاکان و کەلێنێکی گەورەشی لە بونیادی کۆمەڵایەتیدا دروست کردووە. بەڵام هاوکات لە کۆتایی ئەو کتێبەدا دەستبەرداری ئەوە نابێت، تا باس لە کۆتایی ئەو قۆناغی دادڕانە بکات، ئەمەش بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و چاوەڕوان نەکراو کە خوێنەر تووشی سەرسامی دەکات. ئەم کتێبە لە سەرەتاوە خەم لەو حاڵەتە کۆمەڵایەتیەی جیهانی هاوچەرخ دەخوات، بەڵام لە کۆتاییدا دەکەوێتە پیاهەڵدانی و گەشبینە بەرامبەر بەوەی جیهان پێی دەگات.

رەخنەگرێکی ئەمریکی ئەم کتێبەی بە (رۆمانێکی ئاست نزم) وەسف کردووە. سۆسیۆلۆژی فەرەنسیش (ئالان تۆرین) لای

خۆیەوە وتی: (فۆکۆ یاما بە غرورێکی ئەمریکاییانەوە دێتە پێش و سەرکەوتنەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی لە ئیستادا وەها بەسەر ئایندەدا تەعمیم کردووە، کە ببێتە مۆدیلێکی نیودەوڵەتی).

ئالان تورین هەر بەوەندەوە نەوەستاوەو قسە لە (خۆکوژی) فۆکۆیاماش دەکات (خۆکوژی لە گۆرەپانی جەنگێکدا کە پڕە لەلاشەی مردووان)، هەروەها قسە لە (مەسخ) بوونیشی دەکات لەناو (گۆبەندی پاش مێژوو)دا.

ئیعتراف دەکەم من لەوانە نیم کە لەسەر خوێندنەوەی فۆکۆیاما ئالوودە بوویم و بەدوای تیۆریا عەنتیکەکانیدا هەڵوەدابم، وەك چۆن لەوانەش نیم کە توانای ئیستیعابکردنی تیزە گەورەو دنیامیتیەکانیم هەبێت. بەڵام وتەزلکەی دەربارەی (کۆتایی مێژوو) کە دە ساڵێك لەمەوبەر جاپی بۆدا، وای لێکردم بەدوای کتێبە بەناوبانگەکەیدا بچم. کەچی جگە لە هێستریایەکی ئایدیۆلۆژی تازە هیچی دیکەم تیا بەدی نەکرد. تەنانەت خواستنی چەمکی (دوایین مرۆڤ) لە کتێبە بەناوبانگەکەی نیچە (زەرادەشت وەهای وت) دروستکراو و ناڕەسەن دەهاتە بەرچاو.

من بۆخۆم تەواو گومان لەوە دەکەم ئەو توانبێتی لەو ئەزموونە دەگمەن و کەم وێنەیەی نیچەدا قووڵ بێتەوە، ئەزموونێك کە ئاوێتەیە بە دڵەراوکێیەکی کەینونی و میتافیزیکی قووڵ.

هەرچی پەیوەندی بە (هیگڵ)یشەوە هەیە، ئەوا رەخنەگران لە بارەیەوە دەڵێن: (پەیوەندیەکی رووکەش و لاوەکیە). تەنانەت هەندێك تاوانباریان کرد بەوەی تێزەکە هیگڵی لە ڕێی ئەو لێکچەرانەوە بردبێت کە بیریاری بەڕەگەز رووسی (ئەلیکسەندەر کۆژیف) پێشکەشی کردبوون و، تیایدا سەرلەنوێ بیرۆکەی (کۆتایی مێژووی) هێنابووەوە بەرباس.

هەرچەندە ئەرکی من وەکو خوێنەرێك ئەوە نیە رەخنە لە فۆکۆیاما بگرم، بەتایبەت دوای ئەوەی رەخنەگرانی هێندە زۆربوون کە لە ژماردن نایەن ج لە ئەمریکا بێت یان لە ئەوروپا. بەڵام تەواو دڵنیام لەوەی ئەم بانگهێشتەی فۆکۆیاما لەو حاڵەتە هێستریانەی ئەم سەردەمەوە نزیکە، کە هەر زوو تێکس پایەر دەبن و لەناکاودا بزر دەبن و دەکوژێنەوە.

ئەم (مێژوونووس) و (بیریار)ە تەنها فەرمانبەرێکی ئایدیۆلۆژیەو، یەکێکە لەوانەی بانگەشە بۆ بە جیهانی بوونی نوێ و ئایدیۆلۆژیای نوێ دەکات، کە سیماو خەسڵەتەکانی بریتین لە دیموکراسیەت و لیبرالیزم و ئابووری بازاڕو... هتد. ئەگەرچی کۆمەڵگەی مۆدێرن و پاش پیشەسازی و بگرە (زانیاری)ش پێویستی بە زۆر لە بانگەوازی گەشبینانەو تەقەلای ریفۆرمیستانە هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانای لەوە زیاتری نیە تا ریسواییە فیکری و سیاسیەکانی پێ پەردەپۆش بکات و بیانشارێتەوە. رەنگە لەم رووەوە بە فیعلی فۆکۆیاما ریسوایی دوا ساڵەکانی ئەم سەدەیەی ئێستامان بێت.

پێ دەچێت ئەوەی بەجوانترین شێوەیەك گاڵتەی بەم بۆچوونەی فۆکۆیاما هاتبێ ئەو رەخنەگرە ئەمریکیە بێت کە دەڵێت: (فۆکۆیاما هەر ئەوەندەی پێخەلەکەی بەجێهێشت، ئیتر دەچێت بە سەروکاری چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانی گەردوونەوە).

سەبارەت بە مێژووش کە بە بۆچوونی فۆکۆیاما لە جیهانی یەکەمدا کۆتایی هاتووە، ئەوا لە جیهانی سێیەمدا تەواو نەبووە، بگرە لەوێدا تازە لەسەرەتادایە. بەڵام بێگومان ئەمە بۆ خۆی کۆتایی مێژووی فۆکۆیاما خۆیەتی، کۆتایی مێژووی فیکری و کۆتایی وتەزا (هەڕەمەکی) و ئایدیۆلۆژیەکەی، کە ئێجگار لە دراوێکی زانستی یاخو فەلسەفیەوە بەدوورە..

سەرچاوە:

رۆژنامەی "الحیاة" ژمارە (13316).

# فەلسەفەو دیالەکتیکی پێشکەوتن‌و دوا کەوتن

■ جۆرج تەرابیشی

● و: بڕوا عەلادین

ئێستا با واز لە ڕەوتی تایبەتی هەردوو جیهانی مەسیحی‌و ئیسلامی بهێنین‌و گەورە پرسیاری مێژوو بکەین کە لەم حاڵەتەی ئێمەدا پرسیاری مێژووی بەراووردکارییە.

لەو مێژووەدا چی ڕوویدا؟

جیهانی مەسیحی پاش شکستێك کە هەزار ساڵی خایاند، هێدی هێدی پێشکەوت جیهانی ئیسلامیش پاش پێشکەوتنی پێنج سەدە، کشایەوە دواوە. لەو شوێنەوە جیهانی مەسیحی کۆتایی هات جیهانی ئیسلامی دەستی پێکرد. لەو شوێنەشەوە کە جیهانی ئیسلامی کۆتایی هات جیهانی مەسیحی دەستی پێکرد.

دیارە بێ‌ئەوەی فاکتەرەکانی ئەم دیالیکتیکی پێشکەوتن‌و دواکەوتنە پوخت بکەینەوە و دەستنیشانی بکەین، پێمان وایە هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر فەلسەفە کە دوجار هەڵوێست وەرگرتنە بەرامبەر عەقڵ، یەکێکە لەو فاکتەرانەی دەبێ لەبەرچاو بگیرێ. چونکە پێشکەوتن‌و دواکەوتن لە بنەڕەتدا بریتیە لە مەسەلەی عەقڵ‌و عەقڵیەتەکان.

لەنیوەی یەکەمی چاخەکانی ناوەڕاستدا جیهانی مەسیحی نوقمی تاریکی بوو، یەکێك لەو هۆکارانەی نوقمبوونی نێو تاریکی کە ناکرێ لەبەرچاوی نەگرین.. دەرکردنی فەلسەفە، تەنانەت لاهوتیش بوو، بۆ دەرەوەی شاری مەسیحی.

هەروەها یەکێك لەو هۆیانەی بووە مایەی ئەوەی جیهانی ئیسلامی پۆلێنکردنی باوی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ سەردەمەکانی تێکبشکێنێ‌و لە پێنج سەدەی یەکەمدا سەردەمێکی ئالتونی ڕۆشن بەخۆیەوە ببینێ، کردنەوەو فراوانکردنی بواربوو بۆ زانستی کەلام‌و فەلسەفە لە شاری ئیسلامیدا.

دابڕان لەگەڵ عەقڵدا هەیە بەعەقڵی ئاینیشەوە

پەیوەندی بەستنیش لەگەڵ عەقڵدا هەیە بەعەقڵی نابینیەشەوە.

بەڵام پاش ئەمە کودەتا گەورەکە لەمێژوو هەروەها جوگرافیاشدا دەستی پێکرد.

جیهانی مەسیحی کەلەگەڵ داگیرکردنی قوستەنتینیەدا بەرەو خۆرئاوا بەرتەسك بۆوە، پاش ئەوەی لەسەرەتای سەدەی دوانزەیەمەوە دەروازەکانی خۆی لە بەردەم لاهوت و پاشتر فەلەسەفەشدا والاکرد، بەئاراستەی پێشکەوتن گوزەری کرد.

جیهانی ئیسلامیش کە لەگەڵ داگیر کردنی ئەندەلوسدا بەرەو خۆرهەلات بەرتەسك بۆوە، پاش ئەوەی فەلسەفەو زانستی کەلامی لەشاری خۆی کردە دەرەوە، کەوتە زۆنگاوی دواکەوتنەوە(1). سەیر لەوەدایە کە بە لایەنی کەمەوە (لە قۆناغی یەکەمدا) ئەم گۆڕانەی ڕۆڵی (هەریەك لەمەسیحیەت و ئیسلام) ئەنجامی پەیوەندی نێوان دووکارەکتەری مێژوویی بوو.

جیهانی ئیسلامی کە وازی لە فەلسەفە هێنا، بەجیهانی مەسیحی بەخشی.

جیهانی مەسیحیش کەزۆر دلڕەقانە فەلسەفەی یۆنانی کردە دەرەوە، سەر لەنوێ لەرێی فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامیەوە کەشفی کردەوە.

لەگەڵ ئەوەدا کە جیهانی ئیسلامی پاش کردنەدەرەوەی فەلەسەفەو زانستی کەلام لەشاری ئیسلامی دەروازەکانی قەلای عەقیدەی لەسەر خۆی داخست، لەمەسیحیەتداو پاش هێنانەوەی فەلسەفە بۆ ناو شاری مەسحی یەك لەدوای یەك شوراکانی قەلای (ئەو ئایدۆلۆژیا خۆ بەتەنها حەقیقەتزانە) دەڕوخێنران.

هەروەها لەکاتێکدا لۆجیکی تاقمی فریادرەس و لۆجیکی نەفیکردنی فرەدەنگیی زاڵ بوو بەسەر جیهانی ئیسلامیدا، لەمەسیحیەتدا فیکری تاکڕەوی بەرەوفرە دەنگیی و جیاوازی دەچوو، ئەمەش لەرێی دووبارە بەکەرخستنەوەی عەقڵ، سەرەتا بە شێوەیەکی لاهوتی و پاشان بەشێوەیەکی فەلەسەفی.

هەروەها لەکاتێکدا ئیسلامی جیهانی ئیسلامی، لەئیسلامی فەیلەسوف تیۆلۆجیست و سۆفیەکانەوە (بەلکو شاعیرو زاناکانی ئەحرەوە) کورتبۆوە بۆ ئیسلامی زانایانی شەرع و حەدیس ناسەکان. مەسیحیەتی جیهانی مەسیحی لەوە تێپەری تەنها مەسیحیەتی قەشەکان بێت.

سەرەڕای ئەیاریی دیوانی پێشکنین کە پارێزەری ئایدۆلۆژیای (خۆ بەتەنها حەقیقەتزان) بوو بەلکو بووە مەسیحیەتی لاهوتی و فەیلەسوف و سۆفیەکان.

لەگەڵ (لۆتەریزم)دا کەیەکەم فیشاری سەرهەلدانی مۆدێرنە بوو، یەکپارچەیی بەردینی ئەو ئایدۆلۆژیا خۆ بەتەنها حەقیقەتزانەی مەسیحیەت شەقی بردو ئەو شۆڕشە لاهوتیە سەری هەلدا کە دەقی لەدەق ڕزگار کرد.

بەدوایشیا لەگەڵ بزووتنەوەی ڕۆشنگەریدا ئەو شۆڕشە فەلەسەفیە هات کە عەقڵی لەدەق ڕزگار کرد.

ئیدی هەر لەوکاتەوە چارەنووسەکانی جیهانی مەسیحی لە خۆرئاوای ناوەڕاست و باکوریدا جیابۆوە لە چارەنووسەکانی جیهانی ئیسلامی لەخۆرهەلاتی ناوەڕاست و باشوردلو، هیچ سیمایەکی هاوشێوەیی و لێکچوون ئەما بە کەلکی بەراورد کردن بێت. بەلکو لەسەرەتای سەدەی نۆزدە بەدواوە لە خۆرئاوای ئەوروپا جیهانی مەسیحی ئاڕادەیەك

وازی لە مەسیحی بوونی خۆی هێنا.

هاوشانی شۆڕشی پیشەسازی و سێکسی، خۆرئاوای ئەورووپی شۆڕشی مەسیحیەت لە خۆدامالینی بەخۆوە بینی.

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا لە هەموو شوێنێکی ئەورووپای خۆرئاواو بەپێی جیاوازی کات (سەردەم)ی نێوان وڵاتێکی دی کە لە هەندێ حاڵەتدا دەگەیشتە سەدەیەك، ئایدیۆلۆژا جێگەی ئایینی گرتەوە(2).

لەدوا چارەکی سەدەی بیستەمیشدا ئەورووپا پێی نایە قۆناغێکی تازەوە کە قۆناغی ئایدیۆلۆژیا لەخۆدامالین بوو.

لە بەرامبەردا جیهانی عەرەبی ئیسلامی لەنێوانی سەدەی نۆزدەو بیستەمدا لە ئاکامی بەریەککەوتن لەگەڵ خۆرئاوا بەهۆی جوڵەیەکی تەریب بەلام ئاراستە پێچەوانەوە، هەروەها لەبەرئەوەی خۆرئاوا خۆی لە نیوەی دووەمی سەدەکانی ئار د ا ستدا بە ڕێکەوت، دوو ڕەوتی مێژوویی تایبەتمەندی بەخۆیەوە بینی: کە بریتین لە ڕێنسانس و شۆڕش. دەشیا ئەم دو ڕەوتە کۆت و بەندی عەقڵی عەرەبی ئیسلامی تێکبشکێنن و توانا خودگەرییەکەی خۆی بۆ بگەڕێننەوە لە کارکردندا، ئەمە پاش درێژەکێشانی دەست لەکارکێشانەوەو مانگرتنی لە بیرکردنەوە لەژێر زەبری کۆنترۆڵی تەوژمی توندڕەوانەی تێکستخوازیی ئایدیۆلۆژیای خۆبەتەنها حەقیقەتزانی (بەپاسا کراودا) بوو.

دیارە سەردەمی ڕێنسانسی (جیهانی عەرەبی ئیسلامی) لە کارە سەرەکیە ئازادیخوازنەکەیدا بە تەواوی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، ئەوەش لەبەرئەوەی عەقڵی ڕێنساس خۆی کردە گیرۆدەی دەستی ئالۆزیەکی ترسناك: دەبوایە لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ خۆی ڕەخنەیی بوایەو، لە ڕووبەڕووبوونەوەی خۆرئاواشدا بەرگریکەر بوایە. بۆیە ئەمە بووە هۆی ئیفلیجکردنی ئەو گوڕو تینە کارایەی هەیبوو، چونکە بە بەرگریکردنی لەخۆی ڕەخنەکردنی خۆی ڕەتکردەوە، وەك ئەوەی کەسێك بە دەستی ڕاست کارێك بکات و بەچەپ تێکی بداتەوە.

لە بەرامبەریشدا سەردەمی شۆڕش بە تەواوی تێپەڕی و لەناوچوو: چونکە ویستی بە بێ تێپەڕین بە شۆڕشێکی فەلسەفی و لاهوتیدا بە ئایدیۆلۆژیا بگات.

عەقڵی شۆڕشگێڕانەی عەرەبی کە ویستی بەم شێوەیە قۆناغەکان ببڕێ، تەنها خۆی کوشت و هیچی تر.

لە مەسەلەی عەقڵیشدا قۆناغەکان بەخێرایی نابڕرێن، ئەگەرچی بشێ لە ڕووی زەمینەوە فشاریان بخرێتە سەرو کورت و پوخت بکرێنەوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەزموونی مێژوویی کەسانی پێشتر لە بواری پێشکەوتنی ژیاریدا.

ئەگەر وەکو قۆناغیش سەیری مەسەلەکە بکەین، تا ئێستاش گرنگیی شۆڕشێکی لاهوتی بەشێکە لە پرۆژەی کارەکانی عەقڵی عەرەبی. گرنگیەکانی ئەم شۆڕشەیش ئەو کاتە دەردەکەوێ کە دەبینین ئەو (سەحوە)و (ریدە)یانەی شەپۆلی (فەندەمێنتالیزم) لە زیادبووندان، و لە ڕاستیشدا ئەو شەپۆلە هاوتاو هاومانای بە سیاسیکردنی ئایدیۆلۆژیای خۆ بەتەنها حەقیقەتزانە.

ئێمە کە دەڵێین شۆڕشێکی لاهوتی مەبەستمان شۆڕشە لەسەر ڕێچکەی (لۆتەریزم) کە

دەق لە دەق رزگار دەکات و عەقلانیەتی دەق لەبەر رۆشنایی پێویستیەکانی هەنوکەو پاشەڕۆژی پەرەسەندنی مێژوویدا بونیاد ئەنێ.

بەڵام شۆڕشێکی فەلسەفی وەك ئەوەی ڤۆڵتێر کردی کە بریتیە لە رزگارکردنی عەقڵ لە دەق، پێمان وایە هێشتا کاتی نەهاتووە. بەهەرحاڵ بەبێ لوتەرێکی موسڵمان ناتوانین چاوەڕوانی ڤۆڵتێرێکی عەرەبی بکەین. لە سایەی نائامادەگی لاهوتێکی ئیسلامیشدا فەلسەفەیەکی عەرەبی نابینین لە دایك بێت.

لە چوارچێوەی کولتورێکی وەکو کولتوری عەرەبیشدا کە هێشتا ئاینێ عەقلی هەموو کۆمەلگەیە بۆ هەموو توێژەکانی دانیشتوان -گشتی و تایبەتیش- ئەوا کارکردن و بەگەڕخستنی عەقڵی ئایینی مەرجێکی پێویستە بۆ بەگەڕخستنی عەقڵ خۆی.

ئەگەر کۆسپ بخرێتە بەردەم بەگەڕخستنی عەقڵی ئایینی -کە بە درێژایی رێی لێگیراوە- ئەوا بێگومان عەقڵی فەلسەفی وەکو عەقڵێکی لاهوتی دەچێتە جێگەی عەقڵی ئایینی و کاردەکات.

## پەراوێزەکان:

1-وەك ویژدان، بۆ راستی مێژوویی، دەبێ ئەوە بوترێ کە داخرانی جیهانی ئیسلامی بە رووی خۆیدا دەگەڕێتەوە بۆ فشاری دوو ژیار تێکدەر: پەلاماری سەلیبی و پەلاماری مەغۆلیەکان.

2-دەربارەی رەوتی (مەسیحیەت لەخۆدامالین) لە ئەورووپای خۆرئاوا دیاردەی (مەرگی ئاین و لە دایکبوونی ئایدیۆلۆژیا) بڕوانە کتێبە بەهادارەکەی (ئەمانوێل تود) بەناوی (دلهێنانی ئەورووپا)، لە بلاوکراوەکانی لوسوی، پاریس، 1990 و 1996. هەروەها بڕوانە خوێندنەوەی ئێمە بۆ ئەم کتێبە لە ژمارە (12) بەهاری 1997ی گۆڤاری (أبواب)دا.

## سەرچاوە:

جورج طرابیشی: مصائر الفلسفة بین المسیحیة و الاسلام/ چاپی یەکەم، 1998 لاپەڕە (121-126).

# مەرگە سەیروسەمەرەکەی پووشکین

● و: ئازاد



پەیکەری پوشکین - مۆسکۆ

[ئەلیکساندەر سێرگیلیج پووشکین (1799-1837)ی نووسەرو گەورەترین شاعیری رووسیا کە چەند جارێك ژیانە کورت و پڕ بەسەرهاتەکەی نووسراوەتەوە، لە ساڵی 1820دا بەهۆی شیعرە شۆڕشگێڕانەکانیەوە بۆ رووسیای باشوور دوورخرایەوە. پاشان گەڕایەوە بۆ سان پەترسبۆرگ و دەستی بە هامشۆی دەربارو کۆڕە ئۆرستۆکراسیەکانی روسیا کرد. لە کارەکانی: چیرۆکی رۆسلان و لۆدمیلا (1820، کە لەژێر کاریگەری زۆری ئەدەبی فەرەنسایدا نووسیی)، بۆریس گۆدنۆڤ (1831)، کیژی کاپیتان (1837) [ئەم رۆمانەی لەلایەن مامۆستا محەمەد حەمە ساڵحەوە کراوە بە کوردی و دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە چاپی داوە- و. ك]، دۆبرۆڤسکی (1836)، هەروەها هەندێ قەسیدەی بەرزی وەکو ماسیگرو ماسی و، موزارت و سالیری.

پرۆفیسۆری ئیتالیایی خانم سیرانا ڤیتالە پار ژیننامەیەکی نوێی پووشکینی نووسی کە تەرجەمە ئینگلیزیەکەی لەلایەن (فارار، شتراوس)ەوە چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

ئەم وتارە کورتەیەکە بۆ ناساندنی ئەو کتێبە کە لە گۆڤاری (نیویۆرك ریڤیو ئۆف بووکس، ژمارەی رۆژی 8ی نیسانی 1999)دا بڵاوبووەتەوە].

مەرگ و شیعر هەمیشە جۆرە مەیلێکیان بەلای یەکدا هەبووە. ئۆدین[1] شاعیرانی بە کەسانێك زانیوە کە "یا لەلاویدا دەمرن، یان ساڵانێکی زۆر لە گۆشەگیری و تەنیایدا ژیانیان دەبەنەسەر." ئەم پێناسەیە بەتایبەتی بەسەر شاعیران و نووسەرانی سەردەمی رۆمانتیسیزمدا دەچەسپێ. زۆریەیان و هەندێ لە هاوڵەکەوتووەکانیان لە لاویدا مردن. هەندێکی تریان، لەوانە وۆردزوۆرت[2] و کولێریج[3]، ساڵانێکی زۆر ژیان؛ بەبێ ئەوەی چیدی بتوانن بەرهەمی لە چەشنی بەرهەمەکانی تافی لاویی خۆیان بخوڵقێنن.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، رووسیا دوو شاعیرو نووسەری هەڵکەوتووی خۆی بەم چەشنە لە دەست دا، ئەمەش لە سەروەختێکدا بوو کە مێژووی ئەدەبیی ئەو وڵاتە کەسانێکی کەمی لەو تەرزە کەسانە شك دەبردو، هەربۆیە، ئەمە وەکو کۆستێك بوو بۆ رووسیا. پووشکین، کە گەورەترین شاعیری رووسیایەو، لێرمانتۆڤ[4] کە نووسەرێکە هیچی لەو کەمتر نیە، هەردووکیان لە بەرامبەرێن (مەیدانداری)دا کوژران. کاتێ پووشکین کوژرا؛ تەمەنی سی و حەوت ساڵان بوو، لێرمانتۆڤیش کە کوشتیان دە ساڵ لە پووشکین بچووکتر بوو. بێگومان ئەودەمە

تەواوی مەیدانداریەکان توندوتیژو دەبەنگانە بوو و، ئەوەش ڕاستە کە قەیسەر نیکۆلای یەکەمیش پەی بەم ڕاستیە بردبوو، بۆیە سزای سەختی بۆ مەیداندااران دانابوو.

هەڵبەت لەم ڕووەوە پووشکین زیاتری بەرکەوت. بەو حاڵەشەوە، کاتێ کوژرا، لەناو هەندێ کۆڕوکۆبوونەوە ئێرەیی پێبەرو ڕق و کینە لە دڵەکانی سان پەترسبۆرگ دا، کە پایتەختی وڵات بوو، واتەواتیان بڵاوکردەوە کە چیدی پووشکین توانای دلهێنانی نەمابوو؛ بۆیە وای لێهات. ئەم مەسەلەیە لە ڕاستیەوە دوور بوو، گەرچی ئەگەر نەمردایە لەوانەبوو ڕووی بکردایەتە پەخشان نووسین و چیدی شیعری نەنووسیایە. هەرچۆن لێرمانتۆڤ وایکرد. پووشکینیش پەخشانی دەنووسی. بەڵام وێڕای ئەوەی هەندێ لە نووسینەکانی پووشکین بەرزو باڵابوون؛ هێشتا نەیتوانی وەك لێرمانتۆڤ شاکارێکی وەکو (قارەمانی ئەم سەردەمە) بنووسێ. لەوانەبوو هەرگیزیش نەیتوانیایە شاکارێکی وا بنووسێت.

چەند بەشێك لەو دوا نۆڤڵەی کە پووشکین نووسیبووی (و بە ناتەواوی مایەوە) پەرتەوازمیە، لە کاتێکدا ئەو سکێچەی لێرمانتۆڤ بە متمانەوە بۆ ڕۆمانێکی درێژ دایناوبوو، نیشانەی ئەوەیە کە لەوانە بوو شاکارێکی وەکو (جەنگ و ئاشتی)ی لێ دەربچووایە. تاقە شتێك کە دەتوانین بەدڵنیاییەوە بیڵێین ئەوەیە کە ئەو دوو نووسەرە لاوە هێشتا لە توانایاندا مابوو کاری گەورە بنووسن و سووربوون لەسەر ئەوەی لە کاری نووسیندا بەردەوام بن. ئەم دووانە، بە پێچەوانەی کیتس[5] و شیللی[6]یەوە، سەودای مەرگیان نەبوو و بڕوایان بەوە نەبوو کە ترۆپکی کاری هەر نووسەرێك مەرگەکەیەتی.

بەم حاڵەشەوە، لێرمانتۆڤ خۆی ڕووژێنەری دەمەقاڵێیەکی گەلۆزانە بوو کە بووە مایەی کوشتنی لەسەر تاشەبەردێك لە شاخەکانی قەفقاس. بەڵام پووشکین کە لەو بەتەمەنتر ژیرتر بوو، بووە قوربانیی باب و نەریتی کۆڕە ئەرستۆکراسیەکانی ڕووسیا. هاوسەرە شۆخەکەشی، واتە ناتالیا، کە پووشکین دەیپەرست، لە ڕاستیدا بێ ئەمەك و داوێن پیس نەبوو. بەتەنها ئەوەبوو کە ناتالیا حەزی دەکرد لە کۆڕە ئەرستۆکراسیەکاندا دیاربێت و جێی ستایش بێت. ئەو کە سەروکاری لەگەڵ دونیای نووسینی پووشکیندا نەبوو، لە هەمان کاتدا پشت و پشتیوانی بوو، تەنانەت حەزی دەکرد هاوسەرێکی باش و شایستەو کەبیانوو بێت. بەڵام پووشکین خوازیاری ئارامی و ئاسایشێك بوو کە بواری کارو نووسینی بۆ بڕەخسێنێت، ئارامی و ئاسایشێك کە وەکو خۆی دەڵێت "هەرگیز نەبوو بە نسیبی". پووشکین ڕقی لە بۆنە ئەرستۆکراسیەکان و ئاهەنگەکانی سەماو ڕابواردنی دەرباری نیکۆلا بوو، گەرچی بەناچاری هامشۆی ئەو ئاهەنگانەشی دەکرد.

لەو کاتانەدا بوو کە سەروکەللەی جۆرج دانتێ پەیدابوو: کوڕچەرێکی فەرەنسایی و شیك و قۆز کە لە ساڵی **1834**دا لەسەر داوای (بارۆن هیکەرن)ی باڵیۆزی هۆڵەندە لە ڕووسیا، لە هێزی پاسەوانیی تایبەتی قەیسەردا دامەزرا. دانتێ زڕکوڕی بارۆن بوو. ئەو دەمانەش ناتالیای پووشکین شاژن و چلچرای ئەو ئاهەنگە ئەرستۆکراسیانە بوو کە دانتێ ڕووی تێ دەکردن. شتێکی ئاسایش بوو کە دانتێ بچێت و بیبینێت. بەڵام هیچ شتێك لە نێوانیاندا ڕووی نەدا. لە سەرەتادا پەیوەندیی نێوانیان بووە مایەی سەرگەرمی بۆ پووشکین. ناتالیا ڕازی دڵی خۆی لای پووشکین دەدرکاند. ئەو شەیدای ئەو کاپتنە نەبوو، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو ئافرەتێك بوو حەزی دەکرد بایەخی پێبدات، کاتێ خوازبێنی خوشکەکەی ناتالیای کرد، ناتالیا بۆ دڵنیاکردنەوەی پووشکین پێی وت کە ئەو لەبەرئەوەی لەم نائومێد بووە؛ بۆیە خوازبێنی خوشکەکەی کردووە.

ڕووداوەکە تا ئێرە کەم تا زۆر حاڵەتێکی کۆمیدیی بەخۆوە گرتبوو. بەڵام ئاخ لەدەست قسەوقسەلۆك و واتەوات. ئەم چرپە چرپ و قسەلۆکە نهێنی و ئاشکرایانە سەرەنجام وایان لە پووشکین کرد نامەیەکی هەڕەشە بۆ دانتێ بنووسێت. ئەنجامەکەش هەر لە سەرەتاوە دیاربوو؛

مەیدانداری و نەبەردێك کە ئەو ئەفسەرە نیشانەپێکە لێزانە دڵنیا بوو دەیباتەوە. بۆیە لەو بەرامبەرێتەدا سەرەتا دانتێ تەقەی کرد و پووشکین بەخەستی برینداربوو و دوو ڕۆژ دوای ئەوە مرد. قەیسەر نیکۆلا نامەیەکی بۆ پووشکین نووسی کە لەسەر پێخەفی مردن بوو و "لێی خۆش بوو". قەرزە زۆرەکانی پووشکین درانەوە، مشووری خوێندنی منداڵەکانی خورا، مووچەیەکیشیان بۆ بێوەژنەکەی بڕیەوە. ئەو شتانە بەباشی ئەنجام دران، بەڵام ڕووسیا گەورەترین شاعیری خۆی لەدەست دا.

دانتێ بە مەرگ مەحکوم کرا، بەڵام دواتر ئەو حوکمەیان لەسەری سووك کرد و بۆ هەتاهەتایە بۆ شوێنێکی دوور دووریان خستەوە. ئەو لەوێ هەڵات و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ فەرەنسا گەڕایەوە. دانتێ هەرگیز لەو کارەی پەشیمان نەبۆوە. چۆن دەیتوانی پەشیمان بێتەوە؟ بە پێی ئەو "نەریت"انەی ئەوسا لەو کۆڕ و کۆبوونەوە "ڕەسەن"انەدا باوبوو کە لە کەسێکی وەکو ئەو نەبێ لەکەسی تر نەدەوەشایەوە. تەنانەت ئەگەر تەقەی بە ئاسمانیشدا بکردایە، پووشکین -کە ئەویش نیشانەپێکێکی چاك بوو- شتی وای نەدەکرد.

دانتێ لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، ژنخوشکەکەی پووشکین، لە فەرەنسادا لە کاروباریدا سەرکەوتوو بوو و سەرەنجام بوو بە سیناتۆر. پرۆسپە مێریمێ، یەکەمین وەرگێڕی فەرەنسایی بەشێك لە چیرۆکەکانی پووشکین، بەم شێوەیە بکوژەکەی پووشکین وەسف دەکات: "وتاربێژێکی زۆرباش، بە شێوەو ڕوخسار لە وەرزشکاران دەچێ و، لەهجەی ئەڵمانی بەسەریدا زاڵە، فێڵزان و وریایە".

دانتێ بەردەوام دەیگوت کە لە هەموو شتەکانیدا خۆی بە قەرزاری ئەو مەیدانداریە دەزانێت. بەبێ ئەو ڕووداوە، هەرگیز ئەو نەدەبووە خاوەنی ئەو پلەوپایە سیاسیە بەرزەی، لەوانە بوو ناچار بوایە تا کۆتایی ژیانی لەگەڵ بنەماڵەیەکی بلاودا لە یەکێك لە ناوچە پەرتەکانی ڕووسیادا بە مووچەی ئەفسەری گوزەران بەرێتە سەر.

## پەراوێزەکان:

1-*Auden* ئیستن هیو (*1907–1973*) شاعیرێکی ئەمریکاییە کە لە بەریتانیا لە دایك بوو. بە ڕابەری گروپی ئەدەبیی چەپی زانکۆی ئۆکسفۆرد دەژمێردرا، لەگەڵ ئیشروود (کریستۆفەر *1904–1986* نووسەری ئینگلیز)دا هەندێ شانۆنامەیان نووسی، لەوانە: سەگ لە ژێر پێستدا و لە بەرەی جەنگدا.

2-*Wordsworth*/ ویلیەم (*1770–1850*) شاعیری ئینگلیز کە بە یەکێك لە پێشڕەوە سەرەتاییەکانی بزاڤی ڕۆمانتیسیزم دەژمێردرێ. قەسیدەی (دەیری تینتێرن)ی کە قەسیدەیەکی ڕۆمانسیە، گەلێ بەناوبانگە.

3-*Coleridge*، سامۆئیل تایلەر (*1772–1834*) شاعیرو نووسەرو فەیلەسووفی ئینگلیز کە بە یەکێك لە کەسێتیە گرنگەکانی بزاڤی ڕۆمانتیسیزم لە قەڵەم دەدرا.

4-*Lermontor*، میخائیل یوریڤیچ (*1814–1841*) شاعیرو ڕۆماننووسی ڕووسی کە لە ڕابەرانی ڕۆمانتیسیزم بوو لەو وڵاتەدا. بۆ یەکەمجار بە قەسیدەی (لە مەرگی شاعیرێکدا) ناوبانگی دەرکرد، کە وەکو ناڕەزاییەك بەرامبەر کوشتنەکەی پووشکین نووسیی، (قارەمانی ئەم سەردەمە) *1840* لە بەناوبانگترین ڕۆمانەکانێتی.

5-*Keats* جۆن (*1796–1821*) شاعیری لیریکی ئینگلیز کە یەکەمین دیوانی لە ساڵی *1817*دا بلاوبۆوە. لە کارەکانی تری: ئێندیمیۆن *1818*، هیپریۆن (بە دوو گێڕانەوە، *1818* و *1819*) و هەندێ قەسیدەی بەناوبانگی وەك: قەسیدەی بۆ بولبول، قەسیدەی بۆ خەم، قەسیدەی بۆ پاییز.

6-*Shelley* پێرسی بیش (*1792–1822*) شاعیری لیریکی ئینگلیز کە لەگەڵ بایرۆندا هاوڕێیەتیی نزیکی هەبوو. لەکارەکانی، تراجیدیای چینچی (*1819*)، شانۆنامەی پرۆمیتیۆسی زنجیرپسێن (*1820*). شێلی کەسێکی ئایدیالیست و خاوەن ڕۆحێکی سەرکەش و شیعری لیریکیی وەهایە کە لە مێژووی ئەدەبی ئینگلیزیدا بێ هاوتان.

## سەرچاوە:

گۆڤاری (بخارا) شمارەء ششم- خرداد و تیر *1378*.

# ڕۆمانی "کوڕەکە" و

## پیس بوونی هەرزەکاران

● لێدوانی: شێرزاد حەسەن

زۆر کەمن ئەو نووسەرین و تۆمارانەی کە بتوانن ژیانی شاراوەی خەڵکانی شارە گەورەکانمان پێشان بدەن، جا ئەوەیان چ لە ڕۆمان و چیرۆک و شانۆگەریدا بەرجەستە بووبێ، یان لە یاداشتنامەو کتێبەکانی سەفەرنامەو مێژوودا. کەمن ئەو نووسەرانەی بچنە ناو کەلاوەکان و گەڕەکە فەرامۆشکراوەکان، بچنە ژێرزەمینەکان و لە ژیانی دۆزەخ ئاسای خەڵکانی هەژار بکۆڵنەوە. کێ دەستمان دەگرێ و دەمانباتە ناو باڵەخانە ڕماوەکان؟ ناو کاولە ناشەکان و کارگە داتەپیوەکان؟ ژێر دەواری قەرەجەکان؟ ناو ئەو ماڵ و خێزانانەی کە کوڕو باوک تیایدا بێکارن؟ بە کورتی هەموو ئەو شوێنانەو ئەو دڵانەی کە بە یەکجاری لەگەڵ خۆشیدا پەیوەندیان پچڕاندووەو خەم و دەرد بارگەوبنەی خۆیان تیا داخستووە.

لە یەکەمین ڕۆمانی "نایبم مێر"دا کە لە ژێر ناوی "کوڕەکە"دا بڵاوی کردۆتەوە شتێک لەم دیمەنانەی تیایە. لەوە دەچێ شوێن "لەندەن" بێ، یەکێک لەو شوێنە هەرە فەرامۆشکراوەکانی شار کە دەکرێ مۆڵگەی تاوانکاری بێ. نووسەر لەو ڕۆمانەدا کە (214) لاپەڕەیە هەوڵی داوە کە چیرۆکێکی زۆر ترسناکمان بۆ بگێڕێتەوە، تان و پۆی ڕووداوەکەش وەک شیعر خۆی دەکاتەوە، حەکایەتخوانی ناو ڕۆمانەکەش ڕووداوەکانی وەک شریتێکی سینەما خستۆتە بەر چاوان و بە ئاشکرا دیارە کە ڕووداوەو بەناو یادەوەرییەکاندا دەگەڕێ. بە زمانێکی پڕ لە نهێنی و لەغزەوە، وەک کەسێک هێماو جوفرە بەکاربێنێ دەڵێ - "من ئەوەتان بۆ دەگێڕمەوە کە دەیزانم. هەڵبەت ئەو ناوانەی من بەکاریان دێنم ناوی ڕاستەقینە نین، هەرچەندە بۆ

من زرنگانەوەو ئیقاعی خۆیان هەیە".

دوای ئەوەی کە لە لاپەڕەی دووەمی ڕۆمانەکەدا لاشەی لاوێکی کوژراو دەردەکەوێ، یەکەمین کارەکتەر کە پەیدا دەبێ "سین هێنسی"یە کە ئەوەی سەبارەت بەو کەسە دەیزانین ئەوەیە پیاوێکە تەمەنی لە دەوروبەری چل سالیدایەو ژنەکەی تەلاق داوە، سیاسەتمەدارێکی دۆڕاوو مایەپووچی بریتانییە، باوکێکی زۆر غەمگین و دواجاریش دەزانین کە ژنەکەی خیانەتی لێ کردووە. ئەو کارەکتەرە بەناو هەموو لەندەن-دا دەگەڕێ تاوەکو ئەو کوڕە بدۆزێتەوە کە خۆی هەڵیگرتۆتەوەو بەخێوی کردووە، بەلام بۆ ماوەیەکی درێژ بزری کردووە.. لەم گەڕان و سۆراغ کردنەدا ڕێی دەکەوێتە ناو یەکێك لە هەتیوخانەکان، ناو ژیانی دەیەها دلیەن و بەخێوکەری هەتیوەکان، دەیەها لەو منالانەی کە لەسەر جادەکان سەرگەرمی دزی و فزی دەبن، ئەو هەتیوانەی کە پەیوەندییان لەگەل هەرزەکارێکی هەوەسبازو سێکسیدا خۆشە کە دیارە ئەویش تێکەل بۆتەوە بە چەندین تۆلازو هەرزەی دیکە کە هەر ڕۆژەو نازناوێك هەڵدەگرن و بە دەمامك و بەرگ و ناوی جیاوە دەردەکەون، هەر هەموویشیان کەوتوونەتە ناو گەمەی سێکس و دزی و تەلەکەبازی و بەخەڵك ڕابواردن.

گەڕانی "هێنسی" بەنێو لەندەن-دا و ئارەزووی خوێنەر بەوەی کە نهێنی کوشتنی ئەو کوڕە لاوە بزانێ وا دەکات کە هەندێ جار لێرەو لەوێ گوشەیەك دەنێو تان و پۆی چیرۆکەکەدا ڕۆشن بێتەوە و شتێکمان پێ بلێ سەبارەت بەو خەونە ناخۆش و مۆتەکانەی کە (هێنسی) لە ڕابردوودا بینیونی.. جگە لە هیوار تەماعێك کە بۆتە مایەی تێکشکاندن و ڕیسوا بوونی.

زمانی "مێر" لەم ڕۆمانەدا سیحر لە خوێنەر دەکا. دایکی هێنسی لەم ڕۆمانەدا ژنێکی پەرۆش دیارەو هەمیشە لە خەمی ئەوەدایە منالەکانی بپارێزێ، ڕۆماننووس وەك وێلاشێك وەسفی کردووە.. وێلاشێکی توندو تۆل کە هەر هەموو ئەندامانی خێزانەکەی تیا شاردۆتەوە، بەلام باوکە بازرگانێکی مل هوڕە، بەد مەستە، سەرکێش و بێباکە، بێباك لەوەی خۆی بخاتە مەترسیەوە. "مێر" بەنێو وێنەکان و دیمەنەکاندا سەفەرمان پێدەکات، ئەوەندە بەهرەمەندانە، کە هەر هەموو فەزای ڕۆمانەکە دەبێ بە کێلکەیەکی پڕ لە موگناتیس و بەرەو لای خۆی بەکێشمان دەکات.. تا ڕادەیەك دەتوانین بڵێین بەندمان دەکات.

لەگەل ئەوەشدا هەموومان دەزانین کە هەندێ لە شاعیرە هەرە بەهرەمەندەکان دەبنە نێچیری خۆ نواندن و درۆو شتی بێ تام و دەستکرد. لەم ڕۆمانەدا ئامارژە کردن بۆ "ڕیچارد-ی دووەم"ی شکسپیر و "ئەم ئینگلتەر"ەیە لە وەسف کردنی دیمەنی کوشتنەکە لە بەشی یەکەمدا تاڕادەیەك ئیقاعی ڕۆمانەکەی تێك داوە.

جگە لەوەش هەندێ گرفتی هونەری لە تان و پۆو گرێچنی ڕۆمانەکەدا هەیە. ژیانی گەردو سوالکەرانەی کوڕەکە لەسەر شەقامەکاندا وای لێ نەکردووە کە بە تەواوی پیس ببێ و جوانیەکەی بشێوێنێ، یان ئەوەتا لە ڕەوانبێژی بخات کە دیارە زۆر هونەرە کەسێکی وەك ئەو کە بێ مامۆستایەو بەم وێل گەردبوونەی خۆی هەول بدا هەر وت و وریاو هۆشمەند بێ. جگە لەوەی کە

هەندێ سەرەداوی تاوانەکە لە رێی نووسینەوەی یاداشتی رۆژانەی کچەکەی "هێنسی"یەوە دەستمان دەکەوێ کە ناوی "میگان"ەو کاتی خۆی هاورێیەکی نزیکی لاوە کوژراوەکە بووە. دیارە لە رۆمانەکەدا واز لە زمانی هونەری بالآ دێنین و بەسەر زمانێکی نیکەدا دەکەوین کە سادەو روونەو گەنجانەیە، هەرچەندە زمانێکی بەدەر نیە لە جوانی، گەر لە یاداشتەکە ورد بیتەوە هەست دەکەی "میگان"یش وەك کچێك چۆتە ناو وردەکاریەکانی ژیان و ئەزموونێکی دەوڵەمەندی هەیە، بەلآم لەناو رۆمانەکەدا تێدەگەین کە ئەو کچەش نەماوە.. بزر بووە یان مردووە. لە رۆمانەکەدا، هەندێ جار، خوێنەر چاوەرێی کردنەوەی گرێیەکان دەکات، بەلآم وا دەرناچێ. رەخنەگرێکی وەك "ڤیتۆ رۆسۆ" بڕوای وایە کە زۆر لە نووسەران و دەرهێنەرانی سینەما کۆتایی تراژیدی بۆ ئەو کورو کچە لاوانە دادەنێن کە لە رێ لادەدەن، بەتایبەتی ئەوانەی کە "هۆمۆ سێکچوال"ن - بە واتا لەرووی سێکسیەوە نۆرماڵ و ئاسایی نین، زۆربەی کات بە مردن و کوشتن کۆتایی دێ، کەمجار رێك دەکەوێ کە بخرێنە بەردەم چارەنووسێکی لەوە باشتر. مەرگی دوو کارەکتەری سەرەکی لە رۆمانی "کورەکە"دا کە هەردووکیان "هۆمۆسێکچوال"ن هەڵگرتنی ئالآی سوورە.

بەلآم سەرەرای ئەو هەموو شتانەش لایەنی جوانی رۆمانەکە زۆر زاڵترە بەسەر کەم و کورییەکانی. لەو رۆمانەدا هەست بەوە دەکەی کە نووسەر هاوسۆزە لەگەڵ کارەکتەرەکانی خۆی، ئەو کارەکتەرانەی کە لە خۆیان دڵنیا نین، بەگومانەوە بەنێو وێرانەی شارێکی ئالآو والآدا دێن و دەچن، شارێکە کە بەردەوام لاوە بێکارو سەرلێشێواوەکانی گوێیان لە حوکمەتی کرێکاران-ی بریتانی دەبێ کە پێیان دەڵێن: "شتەکان بەرەو باشتر دەچن" لەم رۆمانەدا ئەو هەموو بەڵێنەی دەوڵەت بەدرۆ دەخاتەوە کە گوایە ئایندەیەکی رووناکی بۆ نەوەی داهاتوو دروست کردووە، لەو رۆمانەدا منالآن ئەرکی گەورەکانیان خراوەتە ئەستۆ، بەردەوام لەژێر زەبرو زەنگدان. خانووە داروخاوو فەرامۆشکراوو کەلاوە کۆنەکان دەبنە باکگراوندی رۆمانەکەو گوزارشتن لە وێران بوون و بزربوون. دوای تەواوکردنی رۆمانەکە خوێنەر بارگاوی دەبێ بە دەیەها ترس و تارمایی. لە پاش گەران بەنێو خەراباتی لەندەن-دا بۆمان ساغ دەبێتەوە کە ئەو شارە مەزنە چ ژیانێکی پڕ لە ئاژاوەو ناشیرینی دەنێو خۆیدا شاردۆتەوە، ژیانێك کە پڕە لە نهێنی گەورەو بەتەنها نووسەرە وردبینەکان دەرکی دەکەن.

**سەرچاوە:**


*The Boy*
*By Naeem Murr*
*Houghton Mifflin*

